# بەجیهانیبوون، کولتوور، شوناس

**ئەحمەد گوڵمحەمەدی**

وەرگێڕانی: عەولا بەهرامی


جهان شدن، فرهنگ هویت
احمد گلمحمدی، چاپ دوم، تهران، ١٣٨٣






دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **بەجیهانیبوون، کولتوور، شوناس**
- نووسینی: ئەحمەد گوڵمحەمەدی
- وەرگێڕانی: عەولا بەهرامی
- نەخشەسازی ناوەوە: طـه حسین
- پیتچنین: ئیسماعیل زارعی
- بەرگ: ئاسۆ مامزاه
- ژمارەی سپاردن: (١٣٥٥)
- نرخ: (٥٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم: ٢٠٠٧
- تیراژ: ٧٥٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی - دهۆك

زنجیرەی کتێب ( ٢٥٠ )





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com




# پێرست


سەرەتا ١

## بەجیهانیبوون ٩

پێناسە، پێشینە و گرنگی ٩

تیۆرەکانی بەجیهانیبوون ٢٣

بەرەی یەکەم ٢٤

بەرەی دووهەم ٢٨

بەرەی سێهەم ٣٧

کۆبەندی ٥٢

هێماکانی بەجیهانیبوون ٥٤

بەجیهانیبوونی ئابووری ٥٤

بەجیهانیبوونی سیاسی ٧٢

بەجیهانیبوونی کولتووری ٩٢

## تایبەتگەرایی کولتووری ١١٣

کولتووریبوونی جیهان ١١٣

گشتگەرایی کولتووری ١٢١

پێوەندی و پێکهاتە ئالۆزە تایبەتمەندی بەخشەکانی پانتایی کولتووری جیهان ١٢٢

پێکەوەژیان و ئاوێتەبوونی کولتووری ١٢٦

دیالیتکی گشتی/ تایبەت ١٣٦

گۆڕانکاری و پێشکەوتنی کولتووری ١٤٢

تایبەتگەرایی کولتووری ١٤٨

تایبەتگەرایی ئیتنیکی (قەومی) ١٥٤

بوژانەوەی ئیتنیکی و گۆڕانکاری لە تیۆرداڕێژی دا ١٥٤

نەتەوەگەرایی ١٦٩

بونیادگەرایی ئایینی ١٧٢

بونیادگەرایی مەسیحی ١٧٥

بونیادگەرایی ئیسلامی ١٨١

بونیادگەرایی جوولەکە (یەهودی) ١٨٩

بونیادگەرایی ئایینی لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ١٩٠

تایبەتگەراییە کولتوورییەکانی دیکە ١٩٥

## بونیادنەوەی کولتووری خۆ ٢٠٥

تایبەتگەرایی کولتووری پەرچەکردارێك بەرانبەر بە کەموکووڕییەکانی جیهانی هاوچەرخ ٢٠٧

پەرچەکردارێك لە ئاست نایەکسانی و جیاوازیدانانەکان دا ٢٠٧

پەرچەکردارێك بەرانبەر کەموکورتییەکان و دژوازییەکانی دیکەی نوێبوونەوە ٢١٤

تایبەتگەرایی کولتووری، دیاردەیەکی سیاسی ٢١٦

بونیادنانەوەی کولتووری خۆ ٢٢٠

شوناس ٢٢١

بەجیهانیبوون و شوناس سازیی نەریتی ٢٢٧

شوێن و فەزا ٢٢٨

زەمەن ٢٣٥

قەیرانی شوناس و مانا ٢٤٤

# سەرەتا:

هەندێ لە بیرمەندانی سەدەی نۆزدەیەم، بەتایبەتی فەیلەسوف و کۆمەڵناسانی وەك کانت و مارکس لەم بڕوایە دا بوون کە بە تێپەڕینی کات و گۆڕانی کۆمەڵگە مرۆییەکان، دەور و کاریگەریی کولتووورە جۆراجۆرەکانی وەك ئایین، ئیتنیك و نەتەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا کەمتر دەبنەوە و کۆمەڵگەیەکی جیهانیی بێ جیاوازی و کەلێنە کۆمەڵایەتی — کولتوورییەکان پێك دێ. مارکسیستەکانی سەدەی بیستەمیش پێیان وابوو کولتوور شوێنکەوتوی چین و پێوندیی چینایەتییە و هەر بەم هۆیەوە گومانیان لەوە نەبوو کە لە کۆمەڵگە و جیهانی بێ چین دا، ئایین، رەگەز، نەتەوە و ئینتینیك پێگە و گرنگییەکیان نابێ. تەنانەت لیبراڵیەکان و تیۆریداریژانی نوێکردنەوەش ئەو جۆرە نیشانانەی کولتووریان بە دیاردەیەکی مێژوویی لە قەڵەم دەدا کە لە "کۆتایی مێژوو"دا و دوای کامڵ بوونی قۆناخەکانی نوێکردنەوە و یان (فراوان بوون) وردە وردە لە نێو دەچن. بە هەر حاڵ ئەندامانی کۆمەڵگەی ئایدیالی واتە ئەو تاقمە بیرمەند و تیۆرداڕێژانەی کە پێیان وابوو کۆمەڵگای ئایدیالی بە بێ ئەملاو ئەولا پێك دێ، مرۆڤ گەلێك بوون کە لە پلەی یەکەم دا بە هۆی مرۆڤ بوون و بوونی هۆگری و پرس گەلی هاوبەشی جیهانیی کەسایەتییەکەیان دادەڕشن، نەك لە سەر بنەمای هۆگری و یان (پەیوەست بوونە) کولتوورییەکان.

ئەم جۆرە پێش بینی گەلە خۆشبینانەیە تاڕادەیەکی کەم هاتوونەتە دی. وشیاریی سەرچاوەگرتوو لە هەلومەرج و ژیان لە جیهانی مۆدێڕن دا، زەمینە خۆشکەری ناسنامەگەلی فرەگرتر و گشتگیرترن. بۆ وێنە ناسنامەکانی سروشبەخشی بزووتنەوەکانی وەك ئاشتیی سەوز، مافەکانی مرۆڤ، ئیلاهیاتی رزگایدەر و لەم بابەتە، لە سەر بنەمای وشیاریی روو لە زیادبوون



سەبارەت بە پێویستییە هاوبەشەکان، تایبەتمەندییە هاوبەشەکان، مەترسییە هاوبەشەکان و بە کورتی کۆمەڵگەی جیهانیی هاوبەش راوەستاون و بە مەرجی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە لە کۆمەڵگەیەکی ئەوتۆ دا دەژمێردرێن. بەڵام ئەوە تەنیا روویەکی دراوەکەیە.

بە پێچەوانەی پێش بینییەکانی ناوبراو، لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا جیهان شایەدی زەقبوونەوەی کولتوور یان ئەو شتەی لەم توێژینەوەیە دا پێی دەڵێین تایبەتخوازیی کولتووری بووە. تەنانەت کۆتایی شەڕی سارد و شکستی سیاسەتی چینایەتیش ئەو رەوتەی خێراتر کردوە. ئەم زەقبوونەوە بەرزە رووە کەم تا زۆر زۆربەی کۆمەڵگەکان دەگرێتەوە و لە وڵات یان ناوچە یان وشکاییەکی(قارّە) تایبەت دا کورت نابێتەوە. ئێستاکە چ وڵاتانی گەشەکردوو و دەوڵەمەندی رۆژئاوایی و چ وڵاتانی گەشەنەکردوو و هەژاری جیهانی سێهەم لە ژیانی سیاسی کۆمەڵایەتیی خۆیان دا بینەری ئامادەیی بەرچاوی توخمە جۆراوجۆرە کولتوورییەکانن.

ژیانەوە و زەقبوونەوەی کولتوور نەك تەنیا زۆر گشتگیر و بەربڵاوترە، نیشانەگەلی جۆراوجۆریشی هەیە. ئەگەرچی ئەم جۆراجۆرییە، پۆلێن کردنی هەمە لایەنەی تایبەتخوازی دژوار دەکا، بە گشتی دەتوانین ئەوان بە چەند گرووپ دابەش بکەین. راپەڕین و کێشە ئیتنیکییەکان نیشانەی ناسراو و باوی تایبەتخوازییە کولتوورییەکانن. بزووتنەوە نەتەوەخوازییەکان بە گرووپێکی دیکەی تایبەتخوازیی کولتووری دێنە ئەژمار کە لە سەرچاوەی جۆراوجۆر دا لە ژێر ناوی "شەپۆلی سێهەمی ناسیۆنالیزم" تاوتوێ کراون. بونیادگەرایی ئایینی سێهەمین گرووپی تایبەتخوازییەکان پێك دێنن، کە بۆ خۆیان بە گرووپی بچووکتر دابەش دەبن. سەرەڕای ئەمانە تایبەتخوازیی کولتووریی واش هەن کە لە چوارچێوەی بزووتنەوەگەلی توندڕەوی کۆمەڵایەتی- رەگەز پەرەستییە نوێییەکان، گرووپێکی بێزاری و هی لەم چەشنەدا دەردەکەون.

پێدراوە جۆراوجۆرەکان نیشانی دەدەن کە ئەم تایبەتخوازییانە لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا (لە ١٩٧٠ بەو لاوە) بەربڵاوتر و زۆرتر بوون. بە گوتنێکی دیکە ئیتر لەم سووڕە دا مرۆڤگەلێکی زیاتر و زیاتر بە سرووش (سەروو) وەرگرتن لە ئایدیۆلۆژییە ژیاندنەوەخوازانە، جیاوازیخوازانە، نەتەوەخوازانە و هەروەها ئایدیۆلۆژییە بونیادگەرا توندڕەوەکان ئامادەبوون کە زۆرتر کرداری کوێیی و پڕ ئاڵۆزی و کێشە ئامێزیان لێکەوتۆتەوە. ئەگەرچی پەرەگرتن و زیادبوونی تایبەتگەرایی کولتووری خۆی لە خۆیدا پرسێکی گرنگە، کاتێك گرنگیی زیاتر دەبێ کە سەرنج بدەینە هاوکاتیی ئەو لەگەڵ رەوتی "بچووك بوونەوەی جیهان" بە هۆی گۆڕان و پێشکەوتنە سەرسووڕهێنەرەکانی تێکنۆلۆژیی پێوەندی و گوازتنەوە. بێ گومان سەرنج دان

بەم رەوتە دیالیتیکی و دژوازە نوێیە شتێکی پرسیار خولّقێنە: چونکە لە دەیەکانی ئەم دواییە دا زۆربەی کۆمەڵگەکان شایەدی گەشە و پەرەگرتنی تایبەتیگەراییە کولتوورییە جۆراوجۆرەکان بوون. بەم پێیە کە تایبەتگەرایی کولتووری نیشانەگەلی جۆراوجۆری هەیە، بگۆڕی جیاجیاش لەم دیاردەیەدا بەشدارن. پێداچوونەوەی بەرهەمە پڕژمارەکانی پێوەندیدار بە گرۆیی (ئینتما) و بزووتنەوە جۆراوجۆرە ئیتنیکی، ئایینی و رەگەزییەکان دەری دەخا کە توێژەران بۆ روونکردنەوەی ئەو جۆرە دیاردانە پەنا دەبەنە بەر بگۆڕی جۆراوجۆری وەك کلۆنیالیزم، ئیمپریالیزم، دەستێوەردانی دەرەکی، جیاوازیدانان، ناوەندێتی، نایەکسانی و بژاردەی سیاسی. ئەگەرچی یەکە یەکەی ئەم هۆکار و بگۆڕانە لە قەوارەگرتن و پەرەگرتنی جۆرە جیاجیاکانی تایبەتگەرایی کولتووری دا شوێندانەر بوون و هەن، ناتوانین بە باشی تایبەتگەرایی کولتووریی بە واتا گشتییەکەی و وەك دیاردەیەکی گشتگیر و جیهانی بەم بگۆڕانە پێناسە بکەین.

بە واتایەکی روونتر ئەگەر بتوانین هاوچەشنی گەلێك لە گرووپێك لە مەیلەکان دا و ئاکاری کۆیی سەرچاوەگرتوو لە توخمە ناسنانە بەخشە کولتوورییەکان بناسین و دیاردەگەلی لەم چەشنە بە نیشانە جۆراوجۆرەکانی تایبەتگەرایی کولتووری بزانین، دەبێ بتوانین بگۆڕ یا بگۆڕگەلی کاریگەری هاوبەشیش لەو دیاردانە دا بدۆزینەوە. لەم توێژینەوەیەدا دەگوترێ کە بگۆڕی مەبەست هەمان رەوتی بەجیهانیبوونە و کەواتە، گریمانەی توێژینەوەکە دەتوانێ ئەمە بێ: **"پرۆسەی بەجیهانیبوون تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بەهێز دەکا".**

مەبەست لە بەجیهانیبوون بریتییە لە رەوتی پەستێوتراوی بەرزە رووی زەمەن و فەزا کە لە رێگای ئەوانەوە خەڵك کەم تا زۆر و بە شێوەیەکی تاڕادەیەك وشیارانە لە کۆمەڵگەی جیهانیدا ئاوێــتە دەبن.

نیشانەکانی ئەم رەوتە بریتییە لە:

- دابەزینی ئەو تێچووانەی شوێن، زەمەن و فەزا دەیان خستە سەر پێوەندی و راگوازتن.
- پووکانەوە و رمانی سنوورەکان و هۆکارەکانی دیکەی سنووردارکردنی ئەرکی کۆمەڵایەتی.
- چوونە سەرەوەی لێك گرێدراویی دوو لایەنەی مرۆڤەکان لە ئاستی جیهانی دا.
- لێك چوویی پێکهاتەیی و دامەزراوەیی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی جیهان.
- ئەم راستییانەش دەتوانن بە هۆی ئەم پێوەرانەی خوارەوە هەڵسەنگێنین:
- زۆربوونی بارستایی جۆرەکانی پێوەندیی کۆمەڵایەتی
- زۆربوونی بارستایی گوازتنەوە



- زۆربوونی پانتایی کاریگەری وەرگرتن و کاریگەری دانانی
- دروست بوون و زۆربوونی دامەزراوە بان نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکان
- جیهانگیربوونی دامەزراوە تەوەرییەکانی رۆژئاوا (ئابووریی سەرمایەداری مۆدێڕن و ئەقلانیەت کار لە شکڵی تێکنۆلۆژیی مۆدێڕن دا).

تایبەتگەرایی کولتووریش هەم بریتییە لە دەستەوداوێن بوونی ئەو ئایدیۆلۆژییانەی کە لەوان دا پێداگری لە سەر بێ هاوتایی و تەنانەت باڵادەستیی شێوەی گوزەران، کردەوە و بڕواکانی گرووپ یا کۆمەڵێکی دیاریکراو دەکرێ. ئەم دیاردەیە لە شێوە جۆراوجۆرەکانی ئاکاری توندوتیژانە و ناتوندوتیژانەی وەك راپەڕین و کێشە ئیتنکییەکان، بزووتنەوە نەتەوایەتییەکان، بونیادگەرایی، نژادپەرستیی نوێ و...دا خۆ دەنوێنێ.

ئەگەرچی تایبەتگەرایی کولتووری و پێوەندیی ئەو لەگەڵ بەجیهانیبوون دا باسێکی تاڕادەیەك نوێیە، ئێستا بەرهەمگەلێکی زۆر و جۆراوجۆر بە زمانە رۆژئاواییەکانی وەك بریتانیایی هەن و ژمارە و جۆراوجۆرییان رۆژ لەگەڵ رۆژ لە زیادبوون دایە. لەم بەرهەمانەدا، تایبەتگەرایی کولتووری بە شێوەیەکی بابەتی و هەروەها وەك دیاردەیەکی گشتی و گشتگیر بە درێژی خراوەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە و باس لە سەرچاوەکان و بەستێنەکانی تایبەتگەرایی کولتووری بۆ وێنە بەجیهانیبوون دەکرێ. بەڵام لە زمانی فارسیدا سەرچاوەی کەم لەبارەی تایبەتگەرایی فەرهەنگییەوە هەیە.

لەم سەرچاوانەدا باس لە تایبەتگەراییە کولتوورییە جۆراوجۆرەکانی وەك بونیادگەرایی ئایینی، گەشەی شوناس ئیتنیکییەکان، بزووتنەوە سەربەخۆییخوازانە و جیاییخوازانەکان دەکرێ، بەڵام تایبەتگەرایی کولتووری بە واتای گشتیی وشە بابەتی لێدوانی سەربەخۆی هیچ کام لەم سەرچاوانە نیە. دیارە نەك هەر سەرچاوە یان سەرچاوەگەلێکی سەربەخۆ سەبارەت بە تایبەتگەرایی کولتووری لە ئارادا نیە، تەنانەت سەرچاوەگەلی پێوەندیدار بە تایبەتگەرایی کولتوورییەوەش چوارچێوە و نێوەڕۆکێکی زانستیی ئەوتۆیان نیە. لە زۆربەی ئەم سەرچاوانەدا تایبەتگەرایی کولتووری لە روانگەیەکی بایەخیانە و ئایدیۆلۆژیکەوە باسیان لێوەکراوە. بە وتەیەکی روونتر، لە روانگەیەکی ئەوتۆوە تایبەتگەرایی کولتووری بە دیاردەیەکی ئەرێنی و جۆرێك "بەرگریی کولتووری" لە بەرانبەر "پەلاماری کولتووری"دا لە قەڵەم دەدرێ و تایبەتگەرایی کولتووریی جیاواز لە ئایدیۆلۆژیی زاڵ و فەرمی، بە دەرکەوتەی پیلانی نەیاران و هەوڵ دان بۆ لە نێو بردنی ناسنامە، کولتوور و داب و نەریتە باوەکان دەژمێردرێ.

خالێکی دیکە ئەوەیە کە لەو سەرچاوانە دا کە باسیان کرا زۆرتر هەوڵ دراوە *وەسفی* جۆرێکی تایبەتخوازیی نەتەوەیی، مەزهەبی، رەگەزی و هی لەم بابەتە بکرێ، تا شیکاری و روونکردنەوەی ئەو. ئەوەی لەو بەرهەمانەدا دەکەوێتە بەرچاو بریتییە لە *وەسف* یان باسی مێژوویی تایبەتگەراییە دیاریکراوەکان کە لە چوارچێوەی بزووتنەوەی لێکدوورکەوتنەوەی (واگرایی) ئیتنیکی و ئاینییەکان دا دەردەکەون. کەواتە نە تەنیا لە روانگەیەکی گشتییەوە سەرنج نادرێتە ئەو دیاردانە، روون کردنەوەی ئەوانیش وەك نیشانە و راستێتیی دیاردەیەکی گشتگیر گرنگیی دووهەمی دەدرێتێ.

ئەو سەرچاوە کەمانەش کە پێوەندییان بە پرۆسەی بەجیهانیبوونەوە هەیە کەموکووڕییەکی ئەوتۆیان هەیە. ئەگەرچی لەم دواییانەدا لە کۆڕە زانکۆیی، رۆژنامەوانی و سیاسییەکان دا پرسگەلی پێوەندیدار بە دیاردەی بەجیهانیبوونەوە لە روانگەی جۆراوجۆرەوە خراونەتە بەرباس، بە بێ ترس دەتوانرێ بگوترێ کە لە کۆمەڵگەی ئێمە دا گرنگییەکی ئەوتۆی پێ نادرێ و هاوسەنگیی لۆژیکی لە نێوان گرنگیی ئەم دیاردەیە و رادەی سەرنجدان بەو لە گۆڕێ دا نیە. لەگەڵ ئەوەی کە ژیان لە جیهانی مۆدێڕن دا پێویستی بە وشیاریی سەبارەت بە کارکردی سیستمی جیهانی و دەرهاویشتە و باندۆری ئەو لە سەر تاکەکان و کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان هەیە، هێشتا بۆ دابین کردنی ئەو پێویستییە هەنگاوی مکوم نەنراوە. ئەو هەوڵە کەمانەش کە لەم دواییەدا لەم پێناوەدا دراون ناتوانن شیاو و وڵامدەر بن.

بەشێك لەم بەرهەمە کەمانەی پێوەندییان بەم بابەتەوە هەیە کەم تا زۆر قورساییەکی بایەخی و ئایدیۆلۆژیکیان هەیە و روانینێکی نەرێنییان بۆ دیاردەی بەجیهانیبوون و دەرهاویشتەکانی هەیە. نێوەڕۆکی هێندێك لەم جۆرە بەرهەمانە ئەوەیان لـێدەردەکەوێ کە تەواوێتی پرۆسەی بەجیهانیبوون جۆرێك "هێرشی کولتووری"یە و لە سەر پێویستیی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵی پێدادەگرنەوە. لە بەرهەمگەلی دیکەی لەم جۆرە دا بە راشکاوی لافی ئەوە لـێدەدرێ کە ئەم دیاردەیە بەرهەمی گەلاڵە و تەنانەت پیلانێکی مەبەستدارە و هەر بۆیە دەبێ قسە لە "جیهانیکردن" بکرێ نەك "بەجیهانیبوون". پاڵنەر و مەبەستی ئەم گەلاڵە جیهانییە، زاڵ کردنی کولتووری رۆژئاوایە بە سەر جیهان دا لە رێگای ئاوێتەکردن و لاوازکردن و رماندنی کولتوورەکانی دیکەوە. هێندێك لە نووسەران لەوەش واوەتر چوون، "بەجیهانیبوون" یان بە واتای بە"ئەمریکاییکردنی کولتووری جیهان" داناوە. لە روانگەیەکی ئەوتۆوە،





بەجیهانی "بوون" یان "کردن" بە دەرئەنجامی پرۆسە، گەلاڵە یا پیلانێك دادەنرێ کە مەبەست و ئەنجامەکەی بڵاوکردنەوەی هەرچی زیاتری شێوە ژیانی رۆژئاوایی و تەنانەت ئەمریکاییە*

ناتوانرێ نکۆڵی بکرێ کە لەوەی رۆڵی دامەزراوە رۆژئاواییەکان لە خێرایی کردنی پرۆسەی بەجیهانیبوون دا و پشکی کۆمەڵگە رۆژئاواییەکان لە بەرهەمەکانی ئەم پرۆسەیەدا زۆر زیاترە لە رۆڵ و پشکی دامەزراوە ناڕۆژئاواییەکان. هەروەها بە سانایی دەتوانین بەوە بگەین کە تەنینەوە و جیهانگیربوونی کولتووری رۆژئاوایی و تەنانەت ئەمریکایی یەکێك لە لایەنە تایبەتمەندکەرەکانی پرۆسەی بەجیهانیبوونە و دەگەڵ هەشتاوتر بوونی ئەو پڕۆسەیە، مەیدان بە کولتوورە ناڕۆژئاواییەکان تەنگتر دەبێ. بەڵام بەوحاڵەش ناکرێ بەجیهانیبوون بە پرۆسەیەك دابنرێ کە لە سەر بنەمای گەلاڵە یا پیلانێکی مەبەستدار راوەستاوە یان جۆرێك هێرشی کولتوورییە. پرۆسەی بەجیهانیبوون زۆر بەرفرەتر و پێکهاتەمەندتر لەوەیە کە لە چوارچێوەی گەلاڵە یا پیلان دا جێگای بێتەوە. هەروەها ئەم پرۆسەیە تەنانەت کولتوور و ژیاری رۆژئاواشی خستۆتە ژێر گوشارەوە و ململانێی لەگەڵ دەکا. کەواتە تیۆر و روانگە "پیلان" تەوەرەکان تواناییەکی ئەوتۆیان بۆ تێگەیشتن و روونکردنەوەی پرۆسەی بەجیهانیبوون و دەرکەوتەکانی نیە.

دیارە هێندێك بەرهەمی کەم ژماریش هەن کە هەرچەند لە روانگەی "گەلاڵە" یا "پیلان"ەوە لە دیاردەی بەجیهانیبوون دەکۆڵنەوە، تەنیا گرنگی بە تەواوێتی و لایەنە تایبەتەکانی ئەم دیاردەیە دەدەن. لە ژمارەیەك لەو بەرهەمانەدا بەجیهانیبوون وەك پرۆسەیەك کە لە سەر بنەمای زنجیرە گۆڕانێکی پێکهاتەیی بەربڵاو لە بیاڤە جۆراوجۆرەکان دا جێگیر بووە و هەموو کولتوورە نەتەوەیی، بان نەتەوەیی و ژێرنەتەوەییەکانی خستۆتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە، ململانێی لەگەڵ دەکرێ. ژمارەیەکی دیکە لەو بەرهەمانەش هەم لایەنەکان و راستییە بینراوترەکانی بەجیهانیبوون دەخەنە بەر لێکۆڵینەوە و باس لە تەڤینەوەی زانیارییەکان،

---

* بە چاوخشاندنێکی خێرا بە ناو و نیشانی ئەو کتێب و وتارە کولتوورییانەی لەم ساڵانەی دواییدا بڵاوبوونەتەوە بە سانایی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە بەشی زۆری ئەم بەرهەمانە، لە لایەنی نێوەڕۆك و بابەتەوە لە ژێر سەردێڕی وەك "شەڕ لەگەڵ کولتوور" و "هێرشی کولتووری"دا نووسراون. ناوونیشانی وتار و کتێبەکانیش ئەم وتەیە پشت راست دەکەنەوە: "جیهانی سازی یا وێران کردنی کولتووری"، "بەجیهانیبوون یا ئەمریکایی کردنی کولتووری جیهانی"، "هێرشی کولتووری بەرگریی کولتووری"، "خواوەندەکانی گوندی جیهانی"، "کولتوور و بەرگریی کولتووری" و هی وەك ئەمانە.

دامەزراوە ئابوورییەکانی جیهانییەکان و پێوەندییە زۆر پێشکەوتوو و بەربڵاوەکان دەکەن. ئەگەرچی زۆربەی ئەو بابەتانەی ئەو جۆرە بەرهەمانە دەیخەنە بەرباس پێوەندی بە پرۆسەی بەجیهانیبوون و دەرکەوتەکانی ئەوەوە هەیە، لەوان دا روانینێکی گشتگیری بنچینەیی بۆ دیاردەی بەجیهانیبوون و باندۆری ئەو، جێگایەکی لە تایبەتگەرایی کولتووری دا بۆ تەرخان نەکراوە. تەنانەت "دیمانەی ژیارەکان"یش کە تارادەیەك باسی بەجیهانیبوون و دەرکەوتەکانی ئەوی هێناوەتە گۆڕێ، نەبۆتە هۆی توێژینەوەی جیددی لەبارەی ئەم بابەتەوە.

لەم رووەوە دەکرێ بگوترێ کە پێشینەی بابەتی ئەم توێژینەوەیە هێندە جێگای رەزامەندی نیە. بەرهەمە پێوەندیدارەکان زۆر کەم و کەم بارستایین و ئەم بەرهەمانەش یان بە پێش گریمانەی نازانستی و بەهایی لەبارەی بەجیهانیبوون و دەرکەوتەکانی لێکۆڵینەوەیان تێداکراوە و یان لە رادەی خستنە رووی کۆیەتییەك واوەتر ناچن. هەروەها ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم خاڵەش کە کۆمەڵگەی ئێران کەلەبەرگەلێکی کۆمەڵایەتیی گەورەی هەیە و هەر ئەو ئاوێتە کۆمەڵایەتییە رادەی خەسارهەڵگری لە ئاست بەجیهانیبوون و تایبەتگەرایی کولتووری دا زیاد دەکا، پێویستیی ئەو جۆرە توێژینەوانە باشتر دەردەکەوێ. ئامانجی ئەم توێژینەوەیە ئەوەیە کە وێڕای خۆپاراستن لە باسی بەهاییانە و دەرچوون لە سنووری کۆیەتییەکان، هەنگاوێکی هەرچەند کورت بۆ دابین کردن و پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە لە بواری توێژینەوە دا هەیە هەڵگرێ.

بەم مەبەستە، لێکۆڵینەوە لە پرۆسەی بەجیهانیبوون و تایبەتخوازیی کولتووری و روون کردنەوەی پێوەندیی نێوان ئەو دوو بگۆڕە لە چوارچێوەی سێ بەش دا رێك دەخەین. لە بەشی یەکەم دا دوای باسێکی کورت سەبارەت بە واتا، چەمکبەندی و گرنگیی بەجیهانیبوون، بە بیروڕای سێ بەرە لە تیۆرداڕێژە جۆراوجۆرەکان لە پێوەندی لەگەڵ جیهانی بوون دا دەچینەوە. بەشی سەرەکی و کۆتایی ئەم بەشەش تایبەت دەکەین بە روونکردنەوەی بەجیهانیبوون لەم بەشەدا وێڕای شیکردنەوەی بەجیهانیبوون لە سێ لایەنی ئابووری، سیاسی و کولتووری دا، بە هەڵپەتر (بەهەشتاوتر) بوون و تەنینەوەی پرۆسەی بەجیهانیبوون لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا نیشان دەدەین.

لە بەشی دووهەم دا قسە لە تایبەتخوازیی کولتووری دەکەین. لەم بەشە دا سەرەتا گشتخوازیی کولتووری و جۆرەکانی بە کورتی شی دەکەینەوە تا تێگەیشتنی تایبەتگەرایی ساناتر بێ. دواتر وێڕای واتاکردن و چەمکبەندیی تایبەتگەرایی کولتووری جۆرە سەرەکییەکانی تایبەتخوازی شی دەکەینەوە، بە بەهرە وەرگرتن لە زانیاری و توێژینەوە متمانە پێکراوەکان



دەری دەخەین کە لە سنووری کات(زەمان)ی جێگای باس دا، تایبەتگەرایی‌ە کولتوورییەکانیش زۆرتر و بەرینتر بوون. دیارە باس لە تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی تایبەتگەراییە کولتوورییە جۆراوجۆرەکانیش کە بنەما و پاساودەری واتا و لێکۆڵینەوە لە دیاردەیەکی لەم چەشنە(تایبەتگەرایی کولتووری)یە، لە بیر ناکەین.

دوای باس کردن لەم دوو دیاردەیە و نیشاندانی فرەبوون و تەنینەوەیان لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا کە هێمای بوونی جۆرێك هاوپێوەندیی واتادارە لە نێوانیان دا، نۆرە دەگاتە پێوەندیی نێوان دوو بگۆڕ. لە بەشی سێهەم دا ئەم [ئەرکە] گرنگە ئەنجام دەدەین. بۆ ئەم مەبەستە سەرەتا بە ئاماژەکردن بەو روانگانەی بوونیان هەیە و نیشاندانی توانایی کەمی ئەوان بۆ روونکردنەوەی تایبەتگەرایی کولتووری، لە سەر پێویستیی دروست کردنی تیۆرێکی نوێ پێدادەگرین. بە پێی ئەو تیۆرە نوێیە کە تێکەڵاوێکە لە چەند روانگە، پێوەندیی نێوان پرۆسەی بەجیهانیبوون و تایبەتگەرایی کولتووری دروست دەبێ.

بە دوای ئەو باسەدا، شیکردنەوەی پێوەندیی نێوان ئەو دوو بگۆڕە، یان ئەوەی پێی دەگوترێ میکانیزمی زانستی دەخەینە رۆژڤەوە. بۆ ئەم مەبەستە، بە ریز باس لە شوناس و شێوەی شوناس سازی دەکەین، باندۆری بەجیهانیبوون لە سەر شوناس سازیی نەریتی شی دەکەینەوە و دەڵێین کە ئەم پرۆسەیە چۆن قەیرانێکی بەربڵاوی شوناس و واتا دروست دەکا. ئەو کات بە لێکۆڵینەوە لە ئایدیۆلۆژیی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان، نیشانی دەدەین کە بونیادگەراییە کولتوورییەکان لە پلەی یەکەم دا کاردانەوەگەلێکن لە بەرانبەر قەیرانی بەرهەم هاتوو لە پرۆسەی بەجیهانیبوون.

بە وتەیەکی شێوازناسانە، ئەم توێژینەوەیە لە سێ بەشی سەرەکی پێك دێ. لە بەشی یەکەم دا باس لە بگۆڕی سەربەخۆی توێژینەوەکەمان کە هەمان دیاردەی بەجیهانیبوونە دەکەین و ئەم دیاردەیە وەك پرۆسەیەکی چەند لایەنە لە گۆشەنیگای جۆراوجۆرەوە لێی دەکۆڵینەوە. لە بەشی دووهەم دا لە بگۆڕی گرێدراو بە توێژینەوەکەمان دەکۆڵینەوە. بگۆڕی گرێدراو بەم توێژینەوەیە تایبەتگەرایی کولتوورییە کە هێما و وێنەی جۆراوجۆری هەیە. بەشی سێهەم یا کۆتایی توێژینەوەکەش بۆ روونکردنەوەی پێوەندی و خستنە رووی میکانیزمی هۆکرد تەرخان دەکەین. دیارە ئەو ئەنجامانەش کە لەو توێژینەوەیە وەدەست هاتوون دەردەخەین.

# بەجیهانیبوون

سالّەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم و مانگەکانی دەست پێ کردنی هەزارەی سێهەمی زانینی هاوڕێ بوو لەگەڵ باسی گەرم و دەمەتەقەهێنەر لەمەڕ بەجیهانیبوون. بەرپرسە حکوومەتییەکان، گرفتە ئابوورییەکانی وڵات دەبەستنەوە بەو گوشارانەی لە بەجیهانیبوونەوە سەرچاوەیان گرتووە، هەڵسوڕێنەرانی دەزگا ئابوورییە جۆراوجۆرەکان، بچووك کردنەوەی کۆمپانیاکانی خۆیان بۆ درێژەی ژیان لە چوارچێوەی ئابووریی جیهانیدا بە پێویست دەزانن: لایەنگرانی ژینگە لە دەست شوێنەواری وێرانکەری بەجیهانیبوونی کۆنترۆڵ نەکراو هاوار دەکەن و پشتیوانانی کۆمەڵە خۆجێیە جۆراوجۆرەکان، سەبارەت بە لە نێوچوونی وردە کولتوورەکان و کولتوورە بچووکەکان لە بەرانبەر شەپۆلە گشتگیرەکانی کولتووری جیهانی وریای دەدەن، بەڵام سەرەڕای بەکارهێنانی زۆری بەجیهانیبوون، ئێستاش واتا و نێوەڕۆکی روون نیە (دهشیری١٣٧٩: ٧٢). بۆ کەم کردنەوەی ئەم ناڕوونییە، بەشی یەکەمان بۆ واتای تیۆرییەکان و هێماکانی بەجیهانیبوون تەرخان کردوە.

## پێناسە، پێشینە و گرنگی

رەوانی و هاوبەشیی دیاردەکان و پرۆسە کۆمەڵایەتییەکان لە لقە جۆراوجۆرەکانی زانستە مرۆییەکان دا رەنگ دەداتەوە. زۆربەی چەمکە سەرەکی و باوەکانی ئەم زانستانە ناروونی و دژوازییان هەیە و زۆرجار هەوڵی تیۆردرێژان بۆ واتایەکی هەمەلایەنەی چەمك یا چەمکە بنەمابییەکانی تیۆرەکە و چەمکبەندیی وردی ئەو دیاردیەی لێکۆڵینەوەی لە سەر دەکەن بێ ئاکام دەبێ. کەواتە ئەوان بە خستنەرووی واتایەکی گشتی و ناروون قەناعەت دەکەن و هەوڵ





دەدەن ناڕوونی و کەموکۆڕییە واتاییەکان بە کەڵك وەرگرتن لە هێما و وێنە قەرەبوو بکەنەوە. چەمکی بەجیهانیبوون نموونەیەکی روونی ئەم وتەیەیە.

ئەگەرچی بەجیهانیبوون لە چەمکە باوەکانی بیاڤەکانی زانست، شێوە زانست و سیاسەتە و لە گرنگترین میراتە بەجێماوەکانی هەزارەی نوێیە، بەڵام واتایەکی وردی لێ نەکراوە. لە بەرهەمە جۆراجۆر و پڕ ئەژمارەکانی پێوەندیدار بە کولتوور، ئابووری و سیاسەت لە جیهانی هاوچەرخ دا، واتاگەلی جیاواز و هێندێك جار دژواز لەبارەی ئەم پرۆسەیەوە دەخرێنە بەرچاوو و نیشانەگەلی هیوابەخشی ئەوتۆ لە کۆدەنگیی رێژەیی سەبارەت بە چەمکبەندی پێناسەی ئەوەوە بەرچاو ناکەوێ. رەنگە بتوانین بڵێین کە ئەم ناکۆکی و ناڕوونییە زیاتر لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە زۆرتر دەستەویەخەی ئەو چەمکە باوانە لە بیاڤە جۆراوجۆرەکانی زانستە مرۆیی-کۆمەڵایەتییەکان دەبێتەوە.

ئەم لێڵی، ناکۆکی و دژوازییە زۆرانەی لە واتای بەجیهانیبوون دا هەن لەو هۆکارە جۆراجۆرانەوە سەرچاوە دەگرن کە ژمارەیەك لەوان دەتوانین بناسێنین کە یەك لەو هۆکارانە، چەند لایەنە بوونی دیارە یا پرۆسەی بەجیهانیبوونە. ئێستا هەموو لایەنەکانی ژیان لە دنیای هاوچەرخ دا، کەم تا زۆر کاریگەری لە پرۆسەی بەجیهانیبوون وەردەگرن و پرۆسەی جێگای باس، هەم ئابووری، هەم سیاسی و هەم کولتوورییە. بێ گومان تەکەزی کردن لە سەر هەرکام لە لایەنەکانی ئەم پرۆسەیە، واتا و چەمکبەندیی تایبەت و گرێدراو بە نیشانەگەلێکی دیاریکراوی لێ دەکەوێتەوە.

گشتگیر بوونی ئەم دیاردەیە و باندۆرە بێ ئەملاو ئەولاکانی لە سەر کۆمەڵگە جۆرەکان، دزەکردنی چەمکی بەجیهانیبوونی بۆ نێو بوارە چاپەمەنی و سیاسییەکانی بەدواوە بووە. ئێستاکە رۆژنامەنووسان سەبارەت بە لایەنە جۆراوجۆرەکانی بەجیهانیبوون خەریکی نووسینن، لە کۆڕ و ناوەندە جۆراوجۆرەکانی بڕیاری سیاسی دا باس لە بەجیهانیبوون دەکرێ و تەنانەت بۆ مەحکووم کردنی [ئەو] خۆپیشاندانی توندوتیژانە وەڕێ دەخرێ. لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا هەر جۆرە واتاکردنێك لە بەجیهانیبوون، کەم تا زۆر لە ژێرباندۆری دابەشبوونە سیاسی-ئایدیۆلۆژیکەکاندا دەبێ و پێداگرتن لە سەر خوازراو و وشیارانەبوون یا نەبوونی بەجیهانیبوون، بەنموونەی زەقی ئەم باندۆرهەڵگرییە ئایدیۆلۆژیکییە دەژمێردرێ.

زێدەتر لەو دوو هۆکارە، ساوابوونی تیۆرداڕێژی و موتاڵا لەبارەی بەجیهانیبوونەوە دەتوانین بە هۆکارێکی کاریگەر لە بواری واتاکردن و چەمکبەندییە ناڕوون و دژوازەکانی بەجیهانیبوون

لە قەڵەم بدەین. ئەگەرچی لەو دەیەیانەی دواییدا، بە تایبەت دەیەی نەوەد دا، بەرهەمی پڕ ئەژمار لە چوارچێوەی کتێب و وتار خراوەتە بەردەست ئۆگرانی بەجیهانیبوون، بەڵام تیۆرداڕێژی لەبارەی ئەم دیاردەیە تەمەنێکی زۆری نیە. تەنانەت لە زانکۆکانیش لقێکی تایبەت نیە و لە لقە جۆراوجۆرەکانی ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتیدا باس لە هێندێك لایەنی ئەو پرۆسەیە دەکرێ.

لە ژێر کاریگەریی ئەو هۆکارانەدا، ئەم واتایانەی لەبارەی بەجیهانیبوون خراونەتە بەرچاو جۆراوجۆریی زۆریان تێکەوتوە: "پەستێوتراویی جیهان"، "بەستراوەتربوونی بەشە جۆراوجۆرەکانی جیهانی"، "زیادبوونی بەستراوەیی و لێك تەنراویی جیهان"، "پرۆسەی رۆژئاوایی کردن و یەك جۆر کردنی جیهان"، "ئاوێتە کردنی هەموو لایەنە ئابوورییەکان لە پانتایی جیهانی دا"، "بەرین بوونەوەی پانتایی شوێندانەری و شوێن هەڵگریی کردارە کۆمەڵایەتییەکان"، "کەم بوونەوەی تێچووەکانی فەزا و زەمەن" و هی وەك ئەمانە. دیارە لەم چەشنە واتا و چەمکبەندییە جۆراوجۆر و جیاوازانەدا، تەوەر و توخمی هاوبەشی زۆر دەتوانین دەس نیشان بکەین.

لە زۆربەی ئەو واتایانەی خراونەتە روو، بەجیهانیبوون وەك پرۆسەیەکی پلە بە پلە و بەردەوام دەناسرێ کە لە رابردوویەکی دوور یا نزیکەوە دەستی پێکردوە و ئێستاش درێژەی هەیە، بەم جیاوازییەوە کە هەرچی بە تەمەنییەوە زیاتر دەبێ، هەڵپە و پانتاییەکەی زۆرتر دەبێ. بەواتایەکی دیکە، ئەگەرچی زۆربەی تیۆرداڕێژان، نوێ بوونی پرۆسەی بەجیهانیبوون ناسەلمێنن و لانیکەم مێژوویەکی چەندین دە ساڵەی بۆ لە بەرچاو دەگرن، بەڵام لە سەر گۆڕتربوونی زۆر بەرچاوی ئەو لەم دەیانەی دوایی دا هاوڕان و تەنانەت بڕوایان وایە کە بەرەکانی داهاتوو ئەم پرۆسەیە بە شێوەیەکی بەربڵاوتر و پڕهەشتاوتر ئەزموون دەکەن (Archibugi, 1998: 1).

پێداگرتن لە سەر فرەبوونی بێ وێنەی پێوەندییەکان و رێککەوتنە کۆمەڵایەتی، ئابووری و کولتوورییەکان، تایبەتمەندییەکی دیکەی واتاکانی بەجیهانیبوونە. دەکرێ بڵێین لە هەموو ئەو بەرهەمانەی لەبارەی بەجیهانیبوونەوە لەبەردەست دان، بارستایی یەکجار زۆری پێوەندییەکان لە ئاست و بوارە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگەی جیهانی بۆتە تایبەتمەندییەکی ئەو پرۆسەیە. ئەم پێوەندییانە لە هێندێك حاڵەت دا وشیارانە و خوازراو و لە حاڵەتەکانی دیکەدا ناوشیارانە و نەخوازراو و خۆلـێلانەدراون. پێکهێنەرانی پێوەندیی پڕ ئەژمار و بەربڵاوی ئەوتۆش رەنگە



تاکەکان، گرووپەکان، دامەزراوەکان و دەوڵەتەکان بن. هەروەها ئەوەش لە بیر نەکرابێ کە رادەی دەستێوەردان و بەشداریی لە رایەڵکەی پێوەندییە جیهانییەکان دا بە پێی تاکەکان، گرووپەکان، نەتەوەکان، وڵاتەکان و ناوچە وشکاییەکان جیاوازە.

ئەم چەشنە پێوەند و دانوستاندنە پڕ بارستاییە نیشانەی فرەبوونی بەستراوەیی دوو لایەنە لە بواری جیهانی دایە کە پێداگرتن لە سەری یەکێکی دیکە لە لایەنە هاوبەشەکانی واتاکانی بەجیهانیبوونە. لەم روانگەیەوە، بەجیهانیبوون چەمەوازەی فرەبوونی پێوەندییەکان و هاوپێوەندییەکانی نێوان دەوڵەتەکان و کۆمەڵگەکانی پێکهێنەری سیستمی جیهانی مۆدێڕنە. بەهێزبوونی هۆکارە شوێندانەرەکان لە رایەڵکەی جیهانیدا و بەستراوەیی دوو لایەنە و توندبوونی لێك تەنراویی جیهانی، پانتایی و رادەی شوێنهەڵگریی تاکەکان و کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی گۆی زەوی بەرەو ژوور دەبا و ئەگەر و دەرەتانی گۆشەگیری و دوورکەوتنەوە لە کاریگەریی ژینگەی جیهانی کەم دەکاتەوە (McGrew, 1992: 23).

زێدەتر لەمانە، لە زۆربەی واتاکردنەوەکان دا، بەجیهانیبوون بە جۆرە پرۆسەیەکی هاوجۆری و هاوئاستی دەژمێردرێ. فرەبوون و زۆربوونی ئامرازەکانی پێوەندی و بە شوێن ئەودا خێراتربوونی پێوەندییەکان، بەریەککەوتنەکان (کۆنتاك)، لێك گرێدراوییەکان و باندۆرهەڵگرییەکان لە ئاستی جیهان دا، جۆرێك هاوجۆری و هاوئاستیی جیهانیی خوڵقاندوە. ژمارەیەك لە تیۆرداڕێژان ئەم پرۆسەی هاوجۆرییە بە تەنینەوەی نوێخوازی بۆ دوورترین شوێنەکانی جیهان و جیهانگیربوونی تایبەتمەندییە تەوەرییەکانی کولتوور و ژیاری رۆژئاوایی دەزانن (Clark, 1997: 23). هێندێك لە تیۆرداڕێژان لەوەش واوەتر چوون و بەجیهانیبوون بە جۆرێك یەکدەست کردنی ئابووری لە ژێر چاوەدێریی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەسف دەکەن (والتێز، ١٣٧٩: ٧).

ئەگەرچی بە سەرنجدان بەوەی پێشتر گوترا، خستنە رووی واتایەکی گشتگیر لە بەجیهانیبوون زۆر دژوارە، بەو حاڵەش لە سەر بنەمای لایەنە هاوبەشە ناوبراوەکان، واتایەك لە بەجیهانیبوون دەخەینە روو کە ببێتە تەوەری ئەم توێژینەوەیە:

***"بەجیهانیبوون بریتییە لە پرۆسەی پەستێوترانی بەرزە رووی زەمەن و فەزا کە لە رێگای ئەوەوە خەڵکی دنیا کەم تا زۆر و بە شێوەیەکی وشیارانە ئاوێتەی کۆمەڵگەی جیهانیی تاقانە دەبن"***. بە دەربڕینێکی دیکە بەجیهانیبوون بە پرۆسەیەکەوە گرێ دراوە کە لە رەوتی ئەودا تاك و کۆمەڵگە لە پانتاییەکی جیهانیدا لێك گرێ دەدرێن.

لەبارەی ئەم واتایەوە چەند خاڵێك پێویستە باس بکرێ: ئەم واتایە کە خراوەتە روو لە راستیدا پشت ئەستوورە بە واتا و روانگەکانی چەند تیۆرداڕێژێکی هەڵکەوتووی بەجیهانیبوون. تەوەری باسەکەی دەیوید هاروی لە جیهانی هاوچەرخ، چەمکی پەستێوتراویی زەمەن و فەزایە: گیدێنز لە دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم پەستێوتراوییە دەکۆڵێتەوە: رابێرتسۆن توخمی وشیاری بە خاڵی وەرچەرخان لە پرۆسەی درێژماوەی بەجیهانیبوون دا دەزانێ و مارتین ئالبرۆش بەجیهانیبوون بە قەوارەگرتنی کۆمەڵگەیەکی جیهانی لە "سەردەمی جیهانی"دا لە قەڵەم دەدا.

(Albrow; 1996: Robertson; Giddens 1991; Harvey, 1989).

خاڵی دواتر پێداگرتنە لە سەر پەستێوتراویی فەزا و زەمەن یان بە واتایەکی دیکە لە نێوچوونی فەزا بە هۆی زەمەنەوە کە ئاماژەیە بە لایەنە ماددی و هۆکارە بەستێن سازە و ساکارکەرەکانی بەجیهانیبوون. تێکنۆلۆژییەکان و ئامرازەکانی پێوەندی و پێشکەوتنە سەرسووڕهێنەرەکان لەم بوارەدا، لەم رووەوە پێگەیەکی گرنگیان هەیە و لە زۆربەی تیۆرەکان و بەرهەمە پێوەندیدارەکان بەجیهانیبوونەوە دەخرێنە بەرباس و لێکۆڵینەوە. ئەم هۆکارە خێراکەر و هەشتاوکەرانە لەو رووەوە گرنگییەکی زیادیان هەیە کە پرۆسەی بەجیهانیبوون لە دەیەکانی ئەم دواییانەی مێژووی تا رادەیەك درێژی بەجیهانیبوون جیادەکەنەوە.

لەم واتایە دا، پلە پلەیی، کاتمەند و روو لە تەنینەوە بوونی پرۆسەی بەجیهانیبوون لە بەرچاوگیراوە. هەروەك پێشتر باس کرا، بەجیهانیبوون مێژوویەکی چەندین دە ساڵە و بە گوتەیەك چەند سەد ساڵەی هەیە، بەڵام لە دەیەکانی دوایی دا هەڵپە و تەنینەوەی بەرچاوی بووە و پێش بینی دەکرێ لە ساڵەکان و دەیەکانی داهاتوودا تەنانەت پڕ هەڵپەتر و بەرین تر بێ. دیارە ئەم فرەبوونە پلەپلەیە تەنیا تایبەت بە خێرایی و پانتایی بەجیهانیبوون نابێ و بەگوڕتربوون و قووڵبوونەوەی ئەم پرۆسەیەش لە بیاڤە جۆراوجۆرەکاندا دەگرێتەوە (Mc Grew, 1992: 23).

ئەم تەنینەوە و قووڵبوونەوەیە بە هیچ شێوەیەك هاوشێوە و هاوسان نیە و لە وشکاییەکەوە (قارە) بۆ وشکاییەکی دیکە، لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە، لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە و تەنانەت لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە جیاوازیی هەیە. ئەگەرچی ئەمڕۆکە دوورترین ناوچەکانی جیهانیش پرۆسەی بەجیهانیبوونیان ئەزموون کردوە: شارێکی گەورەی ئەفریقایی بە بەراورد لەگەڵ گوندێکی بچووکی یەکێك لە هەرێمەکانی ئەمریکا،



بەرادەیەکی زۆر کەم لە رایەڵکە و رەوتە جیهانییەکانی سامان، دەسەڵات و زانیاری دا ئاوێتە بووە. وشەی "کەم تا زۆر" لە واتای باس کراودا پێوەندیی بەم لایەنەی بەجیهانیبوونەوە هەیە.

بێجگە لە تەنینەوە و کاریگەریی ناهاوشێوەی پرۆسەی بەجیهانیبوون، رادەی وشیاری سەبارەت بە پرۆسەیەکی ئەوتۆش رێژەیی و نایەکسانە. وشیاربوون سەبارەت بە ئەندامەتی لە "گوندێکی جیهانی"دا، ئاگاداربوون لە چارەنووسی هاوبەشی جیهانی و هەستیاری سەبارەت بە مەترسییە جیهانداگرەکان، تایبەتمەندیی ژیانی لە جیهانی هاوچەرخ دایە و تەنانەت هێندێك لە تیۆرداڕێژان، توخمی وشیاری بە لایەنی جیاکەرەوەی قۆناخە دواییەکانی پرۆسەی دوور و درێژی بەجیهانیبوون دادەنێن. ئەم وشیارییە سەبارەت بە گرێدراوی بە کۆمەڵگەی جیهانی و کەڵکەڵەی گرێدراوییەکی ئەوتۆ هەم لە لایەنی زەمەنی و مێژووییەوە و هەم لە لایەنی شوێنەوە، رێژەیی و نایەکسانە: بە گشتی، وشیاریی بەرەی ئێستا سەبارەت بە لێك گرێدراوی و لێك ئاڵاویی جیهانی زۆرترە لە وشیاریی بەرەی رابردوو و هەست کردن بە چارەنووسی هاوبەشی جیهانی، لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە جیاوازیی هەیە.

دوای ئەم باسە کورتە سەبارەت بە چەمکبەندی و واتای بەجیهانیبوون، ئێستا بە کورتی چاوێك بە رابردووی مێژوویی و چەمکیی بەجیهانیبوون دا دەخشێنین. هەروەك پێشتر گوترا تیۆرداڕێژە جۆراوجۆرەکان لە سەر بنەمای ئەم واتایە و واتا هاوشێوەکانی دیکە، لە دەیەکان، سەدەکان و تەنانەت هەزاران ساڵ لەوە پێش بە شوێن قۆناخە سەرەتاییەکانی پرۆسەی بەجیهانیبوون دا دەگەڕێن و زانیاریی لەبارەوە وەدەست دێنین. ئەوان پڕ تەوژمتربوون و بەربڵاوتربوونی پرۆسەی بەجیهانیبوون لە دەیەکانی ئەم دواییانەدا قەبووڵ دەکەن، بەڵام ئەو زۆر بە کۆنتر دەزانن و، لە سەر ئەو کۆن بوونە جیاوازیی بۆچوونی گەورەیان هەیە.

هێندێك لە تیۆرداڕێژانی ئۆگری لێکدانەوەی بنچینە مێژووییەکانی پێکهاتەکان و رایەڵکە جیهانییەکانی ئێستا لەو بڕوایەدان کە دەبێ سەرەتا پرۆسەی بەجیهانیبوون لە شارستانییەتە کۆنەکان دا بدۆزینەوە. لە روانگەی ئەوانەوە بە قەوارەگرتنی ئەو ژیارانە لە راستیدا رەوتی بەجیهانیبوونیش دەستی پێکرد، چونکە ئەو ژیارانە بە پێی لۆژیك و پێکهاتەی دەروونیی خۆیان، ژیارگەلێکی پەرەخوازبوون. ئەم ژیارانە بەردەوام لە لایەنی سیاسی، سوپایی و کولتووری، مەیلی تەنینەوە و جیهانگیربوونیان هەبوو و بە ناسك کردنەوەی سنوورەکانی یەکە کۆمەڵایەتییە بچووك و داخراوەکان، تێکەڵاوبوونی ئەوانیان لە یەکە کۆمەڵایەتییە گەورەتر و گشتگیرترەکان دا دەستەبەر دەکرد.

لە روانگەی نوێ مارکسیستەکانی وەك ئاندرە گوندر فرانك[1] و ئیمانوئیل والرشتین[2]، پرۆسەی بەجیهانیبوون کاتێك دەستی پێ کرد کە گەرای سیستمی جیهانی بەستراو ئەم مێژووە بۆ ٢٥٠٠ ساڵ بەر لە دایك بوونی مەسیح دەگەڕێتەوە. لە راستی دا ئەوان باس لە پێنج هەزار ساڵ مێژووی سیستمی جیهانی و لە رێگای ئەویشەوە لە پێنج هەزار ساڵ مێژووی پرۆسەی بەجیهانیبوون دەکەن. دەستەیەکی دیکە لە تیۆردارێژان- کە روانگەیەکی تاڕادەیەك وەك یەکیان هەیە- مێژووی بەجیهانیبوون بە مێژووی ژیاری جیهانی دادەنێن کە نزیکەی ١٥٠٠ ساڵ بەر لە زایین و لە میسری کۆن و ژیاری سۆمێرەوە دەست پێ‌دەکا: نووسەرانێکی وەك ئەریك وۆڵف[3] و ویلکینسن[4] سەر بەم دەستەیەن. نووسەران و خاوەنڕایانێکی وەك عەلی مەزرووعیش یەکەم نیشانەکانی پرۆسەی بەجیهانیبوون لە ژیاری ئیسلامی و رۆژهەڵاتی کۆن دا دەس نیشان دەکەن (Holton, 1998: 24 – 2).

دەستەیەکی دیکە لە تیۆردارێژان قەوارەگرتن و خاڵی دەستپێکی پرۆسەی بەجیهانیبوون زۆر بە کورتتر دەزانن. ژمارەیەك لەو تیۆردارێژانە پێیان وایە کە بە قەوارەگرتنی نوێخوازی، رەوتی بەجیهانیبوونیش دەستی پێ‌کردوە. بۆ وێنە گیدێنز پرۆسەی بەجیهانیبوون بە شتێکی جیاواز لە تەنینەوەی نوێبوونەوە نازانێ (Clark, 1997: 23). مارکس و ئەنگلێس– یش تێگەیشتن لە مێژووی بەجیهانیبوون و دەست پێکردنی ئەم پرۆسەیە دەبەستنەوە پێویستی بە تێگەیشتن و ناسینی مێژوویی سەرمایەداری، چونکە لە روانگەی ئەوانەوە سیستمی سەرمایەداری بەردەوام خەریکی یەکپارچەکردنی ئابووری و کولتووری جیهان بووە (Löwy, 1997; 17).

تەمەنی پرۆسەی بەجیهانیبوون لەگەڵ تەمەنی چەمکە پێوەندیدارەکانی یەکسانە و لە بەرهەمە جۆراوجۆرەکانی پێوەندیدار بەم باسەوە، وشە و چەمکی جۆراجۆر بۆ باس و روونکردنەوەی ئەو بەکار هێنراوە کە لەم نێوەدا وشەی "جیهانی"[5] پێگەیەکی بەرچاوی هەیە، ئەم وشەیە زۆرتر لەبارەی هێزەکان، هۆکارەکان، رووداوەکان و پرۆسەی کاریگەرەکان لە پێوەندیدا، یەکیەتی و یەك جۆری بەکار دەهات و بە وتەیەك تەمەنێکی چوار سەد ساڵەی

1 - A. G. Frank
2- I. Wallerstein
3- E. Wolf
4-Wikinson
5- global



هەیە (Waters, 1995: 2). دیارە لە دەیەکانی دواییدا کە پرۆسەی بەجیهانیبوون هەڵپەگرتن و تەنینەوەیەکی بێ وێنەی پەیداکردوە، وشەی جێگای باس زۆرتر بۆ پێداگرتن لە سەر "جیهان"[6] وەك یەکەیەکی کۆمەڵایەتیی سەربەخۆ، جیاواز و سەربەخۆ بەکار دەبرێ کە بۆ خۆی دەتوانێ ئاستی لێکدانەوەی جیاواز و بەم پێیەش بابەتی زانستێکی جیاواز بێ (Albrow, 1992 b: 5 – 6).

بە پێچەوانەی وشەی "جیهانی" زیاتر لە چەند دەیە لە بەکار هێنانی وشەی بەجیهانیبوون تێناپەڕێ و بەکارهێنانی گشتیی ئەم وشەیە و وشە هاوواتا و هاوبنەماڵەکانی دیکەی تا نزیکەی ساڵی ١٩٦٠ دەستی پێ نەکردبوو. ئەگەرچی لە ساڵەکانی دوای شەڕی جیهانی دووهەم، جارناجارێك وشەی بەجیهانیبوون لە کۆڕ و کۆبوونەوەکان و لە بەرهەمگەلێکی تایبەت دا بەکاردەبرا، بەڵام بۆ یەکەم جار ساڵی ١٩٦١ چووتە فەرهەنگی "وێبستەر"ەوە کە واتای دووبارە ناسینی راشکاوانەی گرنگیی روو لە زیادبوونی پێوەندییە جیهانی داگرەکان بوو (Kilminster, 1998: 93). بەو حاڵەش کۆمەڵگەی زانستی هۆگرییەکی زۆری بۆ وەرگرتنی ئەم وشەیە نیشان نەدا.

لە درێژایی دەیەی حەفتادا بێ مەیلی و خۆپارێزیی کۆڕە زانکۆییەکان وردە وردە کەم بۆوە و لقەکانی وەك ئابووری ملیان بۆ بەکارهێنانی ئەم وشەیە راکێشا. لەگەڵ پڕ خێراتربوون و تەنینەوەی پرۆسەی بەجیهانیبوون بە هۆی پێشکەوتنە سەرسام کەرەکان لە بیاڤەکانی پێوەندییەکان دا، ئەم وشەیە زیاتر لە پێشوو گرنگیی پەیدا کرد و پسوولەی چوونە ناو لقەجۆراوجۆرەکانی وەگرت. لە نیوەی دووهەمی دەیەی هەشتادا ئەم وشەیە چووە بواری کۆمەڵناسیشەوە تاوەکوو بەستێن بۆ دارشتنی تیۆری کۆمەڵناسیی سەربەخۆ سەبارەت بە پرۆسەی بەجیهانیبوون و لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی خۆش بێ. لە راستیدا ئێستا چەمکی بەجیهانیبوون لە جەرگەی زۆربەی باسە سیاسی، ئابووری و کۆمەڵناسییەکان دایە (Giddens, 1998: 28).

لە پاڵ وشەی بەجیهانیبوون دا، وشەگەلی تاڕادەیەك هاوواتا و هاوبنەماڵەی دیکەش هەن کە روونکردنەوەی نزیکایەتی و جیاوازیی ئەوان لەگەڵ وشەی بەجیهانیبوون بێسوود نابێ. وشەی جیهانی کردن[7] ئەگەرچی لە پرۆسەکانی لێك گرێدراوی و هاوجۆریی جیهانی نزیکە،

6- the globe
7- globalizing



بەڵام ئاماژەیە بۆ ئەوە کە مەبەست، بەرنامە و وشیاریەکی دیاریکراو لە پشت ئەم رەوتەوەیە. بەدەربڕینێکی دیکە، جیهانی کردن هەڵگری ئەو واتا و چەمکەیە کە هێزگەلێکی بە توانا لە چوارچێوەی دەوڵەت- نەتەوەکان و یان کۆمپانییە فرە نەتەوەییەکان، لە پێناوی ویست و بەرژەوەندییەکانی خۆیان دا خەریکی یەکدەست کردنی جیهانن و هەر بۆیە دەبێ قسە لە جیهانیکردن بکرێ نەك بەجیهانیبوون، بەڵام وشەی بەجیهانیبوون ئەو واتایەیە کە زۆر لە هێزە بەجیهانیکەر و هاوجۆری خوڵقێنەکان، ناکەسێنی (غیر شخصی) و بانتر لە کۆنترۆڵ و مەبەستەکانی تاك و دەستەیەك لە تاکەکان دان (Waters, 1995: 2).

سەبارەت بە نزیکیی بەجیهانیبوون لەگەڵ گلۆبالیسم[8] و یۆنیورسالیسم[9]یش دەبێ قسە بکرێ. یۆنیورسالیسم ئەو بایەخانە دەگرێتەوە کە مرۆڤ لە هەر کات و شوێنێك دا، بەدەر لە بەستراوەییە کولتوورییەکانی، وەك سووژەیان بکەرگەلێکی سەربەست لە بەر چاو دەگرن. گلۆبالیسمیش- کە مادرتر و زۆر نوێتر لە یۆنیورسالیسم- کۆمەڵە بایەخێك دەگرێتەوە و کەسانی پێبەند بەو بایەخانە- کە بە ئۆگری هەموو خەڵکی جیهانی- تەواوی زەوی بە ژینگەی ماددی و تاکەکانی سەر ئەو بە هاوڵاتیان، بەکارهێنەران و بەرهەمهێنەرانی جیهانی دەزانن و خوازیاری هەوڵی بە کۆمەڵن بۆ چارەسەری کێشەکانی جیهانن. گلۆبالیسم یەکێك لەو هێزانەیە کە یارمەتی بە تەنینەوەی پرۆسەی بەجیهانیبوون دەکا و نزیکی و پێوندیی گلۆبالیزم لەگەڵ بەجیهانیبوون وەك نزیکی و پێوەندیی یۆنیورسالیسم لەگەڵ دانانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان وایە (Albrow and King, 1990: 8 – 9).

دوای باس لە "واتا" و "سنووردارێتی"ی بەجیهانیبوون، باس لە "گرنگی"ی لێکۆڵینەوە لەم دیاردەیەو هەلومەرج و ناچارییەکانی دەکەین. ئەم گرنگییە لە پلەی یەکەم دا لە هەڵپە وگوڕی هەناسەبڕی پرۆسەی بەجیهانیبوونەوە سەرچاوە دەگرێ بە هەڵپە و گوڕێك کە لە سەر بنەمای ئامراز و کەرەستەکانی پێوەندییەکان راوەستاوە. ئەمڕۆکە شۆڕشێکی سەرسووڕهێنەر لە تێکنیکەکانی پێوەندی و زانیارییەکان دا و قەوارەگرتنی سیستمێکی پێوەندیی نوێی پشت ئەستوور بە زمانێکی گشتیی دیجیتاڵی، بنچینەی ماددیی کۆمەڵگای بە چەشنێك گۆڕیوە کە هیچ جۆرە پەراوێز گرتنێك و گۆشە گیرییەك وەخۆناگرێ و تەنانەت دوورکەوتووترین و نەریتیترین کۆمەڵگاکانیش لە داخستنی سنوورەکانی خۆیان بە رووی رەوت و رایەڵکە

8- globalism
9- universalism





جیهانییەکان دا بێ توانان (Castells, 1996: 1). ئەم قۆناغە لە پرۆسەی بەجیهانیبوون کە زیاتر لە چەند دەیە تەمەنی نیە و بە هەڵپە و گوڕییەك روو لە زیاد بوونی بێوێنە بەرەو پێش دەڕوا، بە زمان و دەربڕینگەلێکی جۆراجۆر لە لایەن تیۆرداڕێژانەوە پێی لە سەر داگیراوە. داکۆکیارانی نوێبوونەوە، ئەم قۆناخە بە بەشێك لە مێژووی نوێبوونەوە دادەنێن و بڕوایان بە هیچ چەشنە پچڕان یان گۆڕانێکی چۆنایەتی و بنچینەیی نیە. لە روانگەی ئەوانەوە ئەم گۆڕان و گۆڕانکارییە پڕە لە خێرایی و لە پانتایی جیهانیدا، لە راستی دا هێماکانی گەیشتنی دوایین و بەم پێیە پێشکەوتووترین قۆناخی نوێبوونەوەن. ئەم قۆناخە پێشکەوتوویە هێندێك جار "کۆمەڵگەی زانیاری تەوەر[10]"، هێندێك جار "قۆناخی بەرزی نوێبوونەوە[11]" و جاری واشە "نوێبوونەوەی ریفلیکسیۆ[12]" ناو دەبرێ (Lyon, 1999: 45 – 49).

رەخنەگران و بەرهەڵستکارانی نوێبوونەوەش باس لە دوایین قۆناخی پرۆسەی لێك تەنراوی جیهانی دەکەن، بەڵام ئەم قۆناخە نوێیە بە درێژکراوە یان تەنینەوەی نوێبوونەوە ناژمێردرێ. ژماریەك ئەو قۆناخە بە جۆرێك ئەمریکایی کردن یان ئەمریکایی بوونی جیهان دەزانن کە هاورێیە لەگەڵ سەقامگیربوونی رێبەریی هێژمۆنیکی ئەمریکا (Taylor, 1999: .123) لە روانگەیەکی دیکەوە، پێشکەوتووترین قۆناخی پرۆسەی بەجیهانیبوون، قەوارەگرتن و دەرکەوتنی "کۆمەڵگای رایەڵکە تەوەر[13]"ە کە تایبەتمەندیی ئەو لێك تەنراوی ئابووری نەتەوەیی لە ئاستی جیهانی و پێك هاتنی گۆڕانی بنەڕەتی لە پێوەندی ئابووری، دەوڵەت و کۆمەڵگە دایە. بە دەربڕینێکی دیکە ئەو شتەی کۆمەڵگەی نوێ تایبەتمەند دەکا، سەرمایەداری بە تەواوی نوێژەن کراوەی چەمهەڵگر و رەوانە (catell, 1996: 1).

تیۆری زانانە پێڕەوی رێوشوێنەکانی مارکس ددان بە دەرکەوتنی قۆناخێکی نوێ لە بزاوتی سیستمی سەرمایەداریدا دێنن. هێندێك لە مارکسیستەکان و نوێ مارکسیستەکان لەو بڕوایە دان کە ئەمڕۆکە رەوتی نەپساوەی سەرمایە و نوێژەن بوونەوەی بەردەوامی ئەو، سەرمایەداری جیهانی لەگەڵ گرفتی جیددی کەڵەکە کردن و دەفرایەتی بێ سنوور رووبەڕوو کردوە کە لە قەیرانی ئابووریی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا دەرکەوتووە: (McNally, 1998. 2). ژمارەیەکی دیکەش دەڵێن کە لە سەرەتای دەیەی حەفتا بەم لاوە، گۆڕانکارییە تێکنیکی و

10- information society
11- hig modernity
12- reflexive modernity
13- the network society

سیاسییەکان، توانای سەرمایە بۆ هێنانە دی ئارەزوە لە مێژینەکانی خۆی (گۆڕینی جیهان بە "بازاڕی ئازاد" بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوە) زۆر زیادی کردوە و لە راستی دا تێزی بەجیهانی بوون هی ئەم قۆناخە لە مێژووی سیستمی سەرمایەدارییە (Du Boff, 1997: 27 – 28).

سەرەڕای ئەو تیۆری زانانە، ژمارەیەك لە پۆست مۆدێڕنەکانیش هەنگاوێك زیاتریان ناوەو ئەم قۆناخە لە بەجیهانیبوون بە دەرکەوتنی سەردەمێکی نوێ لە مێژووی مرۆڤ دادەنێن. مارتین ئاڵبرۆ لە بەرهەمە سەرنج راکێشەکەی خۆیدا ئیدعایەکی ئەوتۆ دێنێتە گۆڕێ و بەرگریی لـێدەکا. بە رای ئەو گۆڕان و وەرچەرخانە تێکنیکی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان لە دەیەکانی دواییدا ئەوەندە قووڵ، هەمە لایەنە و خێراتر بوون کە دەبێ قسەکردن لە قۆناخە باڵاکانی نوێبوونەوە و بان نوێبوونەوە وەلا بنرێن (Lyon, 1999: 64). سەردەمی مۆدێڕن کۆتایی پێهاتوە و دەبێ لە بە کارهێنانی وشەکانی وەك "سەردەمی ئۆتۆماسیۆن"، "سەردەمی ئەتۆم"، سەردەمی فەزا" و "سەردەمی ئەلکترۆنیك"دا وریا بین، چونکە هەر وا هەستی مۆدێڕن بوون بڵاو دەکەنەوە (Albrow, 1996: 1).

لە روانگەی ئالبرۆوە ئەگەرچی نوێبوونەوە کۆتایی هاتووە، بەڵام مێژوو کۆتایی نەهاتووە. مرۆڤ ئێستا پێ دەنێتە سەردەمێکی نوێوە کە دەبێ ناوی "سەردەمی جیهانی"[14]ی لـێ بنرێ. ئەم سەردەمە گۆڕانکاریی سەرەکیی لە بنەماکانی کردار و رێکخستنی کۆمەڵایەتی تاك و دەستەکان لە گەڵ خۆی هێناوە (Albrow, 199:4). گەیشتنی سەردەمی جیهانی بۆیە راستییەکە کە ئێستا تاك و دەستە جۆراوجۆرەکان، لە هزر و کرداری خۆیان دا یەك چاوگ و چوارچێوەی جیهانی بە کار دێنن، نەك یەك چاوگ و چوارچێوەی ناوچەیی و نەتەوەیی.

دیارە دەتوانین ژمارەی ئەو تیۆرانەوە زیاد بکەین کە بە شێوازێك لە شێوازەکان سەرنجیان داوەتە دەیەکانی ئەم دواییەی پڕۆسەی بەجیهانیبوون، بەڵام خاڵی گرینگ ئەمەیە کە لە بۆچوون و رووانگانەدا، کەم تا زۆر لە سەر تێگەیشتن و روونکردنەوەی ئەم پڕۆسەیە و لێکدانەوەی دەرهاویشتە جۆراوجۆرەکانی پێداگیراوە. هەم ئم توێژەرانەی کە بەجیهانیبوونی ئابووری، سیاسەت و کولتوور لە دەیەکانی ئەم دواییانەدا بە قۆناخێکی پێشکەوتووتری نوێبوونەوەیان سیستمی سەرمایەداری دەزانن و هەم تیۆرداڕێژەرانی دیکە وەبیریان هێناوەتەوە کە لێکۆڵینەوە لەم دیاردەیە دەبێ بخرێتە دەستوری کاری تیۆری زانانی بەشە جۆراوجۆرەکانی زانستە مرۆیی- کۆمەڵایەتییەکانەوە.

14- the global age



پێویستییەکی ئەوتۆ لە پلەی یەکەم دا لە هەمە لایەنە بوون و کاریگەری بەربڵاوی ئەو پرۆسەیەوە سەرچاوە دەگرێ. هەروەك پێشتر گوترا، پرۆسەی بەجیهانیبوون لە دەیەکانی دواییدا، تەوژم و خێراییەکی بێ وێنەی گرتووە، هەموو تاکەکان و کۆمەڵگەکان کەم تا زۆر دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە. دیاردەیەك بە کاریگەریی ئاوا مەزنەوە بێ گومان هەر چەشنە هەوڵ و کۆششێکی زانستی تیۆری و بەکارهێنەکیی پێوەندیدار بە تێگەیشتن و روونکردنەوەی ئەو بە جێ و پێویستە. تازەیی رێژەیی چۆنایەتی یان چەندایەتیی دیاردەیەی باس لێ کراویش هۆیەکی پتەوە بۆ ئەنجام دانی توێژینەوە و داڕشتنی تیۆریی نوێ بە تایبەت لە بواری کۆمەڵناسی و زانستە سیاسییەکان دا.

بە دەربڕینێکی دیکە پرۆسەی بەربڵاو و پڕ هەشتاوی بەجیهانیبوون لە دەیەکانی دواییدا، ئاسۆ و دەرەتانێکی نوێ لە بەردەم کۆمەڵناسیدا دەکاتەوە، بە چەشنێك کە بەستێنێکی شیاوی بۆ گەشە و بڵاوبوونەوەی روانگە و تیۆرییە پۆست مۆدێڕنەکان دەستەبەر کردوە. پۆست مۆدێرنیستەکان بە رەت کردنەوەی ریالیسم و تیۆر و گێڕانەوە گەورەکان، پێداگرتن لە سەر روانگە تاکەکەسییەکان و لە ئاکام دا گەرم کردنی رکەبەرایەتی بۆ خستنە رووی گێڕانەوە کڕیار پەسندەکان، لە بەستێن و دەرەتانێکی ئەوتۆ سوود وەردەگرن. لە حاڵێك دا کە کۆمەڵناسی و زانستە سیاسییەکان دەتوانن شیکردنەوەگەلی ناوچەیی و خۆماڵی لە بەجیهانیبوون بخەنە روو کە بۆ تێگەیشتنی دانیشتوانی زەوی لە چۆنیەتی کەمتر بوونی کاریگەریی سیستمە سیاسییە نەتەوەیی و خۆجێیەکانیان و دەستڕاگەیشتن بە وێنایەکی راست بینانە لە فەزای جیهانیی ژیانی کۆمەڵایەتی پێویستە.

ئەگەر هەوڵ دان بۆ خستنەڕووی وێنە و روونکردنەوەیەکی هەمە لایەنە لە پرۆسەی بەجیهانیبوون، پێویستییەکی ستراتیژیك نەبێ، لانیکەم دەتوانرێ بگوترێ کە پێویستییەکی ئاکارییە، کە لە پێ ئەسپێردراوی کۆمەڵناسییەوە هەڵ دەقوڵێ. کۆمەڵناسی کە بەردەوام بە شێوەیەکی شاراوە و راشکاوانە کەڵکەڵەی ئاکاریی هەبووە و وای نیشان داوە بە شوێن سەرچاوە و رێگاگەلێکەوەیە بۆ بەرەو پێش بردن و خێرایی بەخشین بە پرۆسەی رزگاریی مرۆڤ، دەبێ مرۆڤەکان فێر بکا کە لە پڕۆسەی لە نێوچوونی دامەزراوە نەریتییەکانی هێمنایەتی و شوناس بەخشەکاندا (بە تایبەت دەوڵەت) و ئاوێتە بوون لە رایەڵکە ناکەسێنی و رەوانەکانی هێز (سامان و زانیاری) دا چۆن ئامرازگەلێکی نوێ بۆ وەدەستهێنانی

هێمنایەتیی کۆمەڵایەتی و خۆرانانی سیاسی وەدەست بێنن و یان لانیکەم پێویستی بەو ئامرازە و ڕێوشوێنانەیان لـێ دەخوازێ.

کۆمەڵناسی هەروەها دەتوانێ وەئەستۆگری جۆرێك وشیاریبەخشیی هیوادارکەر بێ. ئەگەرچی پرۆسەی بەجیهانیبوون دەرەنجامگەلی نەرێنیی هەیە، لە کاریگەری و دەرهاویشتەی ئەرێنیش بە تاڵ نیە. کەواتە ئەم دەرەتانە بۆ کۆمەڵناسی هەیە کە تاك و دەستە جۆراوجۆرەکان سەبارەت بەو دەرەتانانەی کە پڕۆسەی بەجیهانیبوون دەی خاتە بەردەمیان وریا بکاتەوە؛ دەرەتانگەلێك بۆ بواژندنەوەی شوناسە سەرکوت کراوەکان، ئازادی مەزهەبیی ڕاستەقینەی سەرچاوەگرتوو لە هەڵبژاردنی ئازادنە، خەوشدارکردنی پێوەندی و پێکهاتە هێژموونییانە ئابووری سیاسی‌یەکان، دەرباز بوون لە پیاوسەرداریی ناوچەیی و خۆجێیی و کۆچ کردن بە مەبەستی ڕاکردن لە ستەم و ... (Waters, 1995: 163).

دیارە جێ بە جێ کردنی ئەم گرنگە پێویستی بە پێداچوونەوە بە چوارچێوەی نموونە زاڵەکانی بە سەر زانستی کۆمەڵایەتی باو دا هەیە. دەکرێ بگوترێ هەموو ئەو تیۆریستانەی ئۆگری پڕۆسەی بەجیهانیبوونن- کە گرینگی ئەم دیاردەیە و پێویستیی تێگەیشتن و ڕوونکردنەوی ئەویان سەلماندوە- لێهاتوویی و توانایی تیۆرەکان، پێش گریمانەکان و تەنانەت ئەو چەمکانەی بۆ بەڕێوەبردنی ئەم کارە بە دەستەوەن بە کەم و تەنانەت هیچ زانیوە. بە ڕای ئەوان گۆڕان و گۆڕانکارییەکانی هەڵقوڵاو لەم پرۆسەیە ئەوەندە مەزن و سەرسووڕهێنەر و نوێن کە تێگەیشتن و ڕوونکردنەوەی ئەوان ئامرازگەلی تیۆری نوێ دەخوازێ و ئەو لقە زانستییە پێوەندیدرانەی هەن، بە بێ دەرچوون لە چوارچێوەی نەریتیەکانی خۆیان توانای بەڕێوەبردنی ئەم کارەیان نیە.

لەم ڕوانگەیەوە، یەکەم هەنگاو بۆ نوێژەکردنەوە و چالاك کردنی کۆمەڵناسی، گۆڕینی ئاستی لێکدانەوەو سووژە (بەرناس) یان یەکەی سەرەکیی لێکدانەوەیە. "کۆمەڵگە" لە هزری کۆمەڵناسیی ئۆرتدۆکس و کۆمەڵناسیی مۆدێڕن دا یەکەی سەرەکیی لێکدانەوەیە کە تایبەتمەندیگەلی جێگیر و دیاریکراوی هەیە. کۆمەڵگەی مەبەست فەزایەکی کۆمەڵایەتیی داخراو و یەکپارچەیە کە زۆرتر سنووری سیاسی و کولتووری دیاریکراوی هەیە. بە گوتنێکی دیکە، یەکە سەرەکییەکانی کۆمەڵناسیی کلاسیك، کۆمەڵە سیستمێکی کۆمەڵایەتیی تاقانە یا تەواوەتییەکی سنووردار و دیاریکراون کە ژمارەیەك کارتێکەریی دوو لایەنە و پڕۆسەی کۆمەڵایەتی لە شوێن و فەزایەکی تاڕادەیەك جێگیردا لە خۆدەگرن (McGrew, 1996 97).



بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون، ئەم جێگیری، سنووردارێتی و یەکپارچەییەی تێك داوە و "کۆمەڵگە"ی کۆمەڵناسیی مۆدێڕنی کردۆتە فەزایەکی کۆمەڵایەتیی دزە هەڵگر و پارچە پارچە. ئێستا "کۆمەڵگە" نەك سیستمێکی کۆمەڵایەتی سنووردار و دیاریکراو بەڵکوو دیاردەیەکە کە لە ڕێگای رایەڵکەکانی کۆمەڵایەتی- فەزایی یەکترداگر و یەکتربڕەوە دروست دەبێ (Mann, 1986: 1). کەواتە بۆ تێگەیشتن لە لایەنە کۆییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە جیهانی هاوچەرخ دا دەبێ بەستێنی جیهانی بکەینە رووبەری لێکۆڵینەوە (Beyer, 1994: 2) و کۆمەڵناسی بەرو تێگەیشتنێك لە بابەتی کۆمەڵایەتی ڕێنمایی بکەین کە وەرگری گرینگیی وەسووڕانی جیهانتەوەرانە بێ.

قەوارەی فەزای جیهانی بەرهەمهاتوو لە پرۆسەی بەجیهانیبوون و پەستێوترانی جیهان لە چوارچێوەی یەك "شوێن"دا نیشانەی ئەوەیە کە کۆمەڵگەکان بە هیچ شێوەیەك یەکەی سەرەکی کۆمەڵناسی نین و ئەوەی کە دەبێ ببێتە جێگرەوە "کۆمەڵناسیی دنیایەکی یەکگرتوو"یە. ئەم کۆمەڵناسییە قەبووڵ دەکا کە پڕۆسەکانی بەجیهانیبوون تارادەیەك دروستکەری ڕاستیی کۆمەڵایەتی لە هەموو جێگایەك (Archer, 1991: 134). ژیانی کۆمەڵایەتی نەك لە چوارچێوەی تەکوزییەکی (نظم) سنووردار و دیاریکراو دا، بەڵکوو لە پانتایی زەمەن و فەزای جیهانیدا [دەبێ] دەستنیشان بکرێ و لێی بکۆڵدرێتەوە.

هەروەها هێندێك لە خاوەنڕایان هەنگاوێك واوەتر چوون، نەك پێداچوونەوە، بەڵکوو "دابڕانێکی پارادایماتیك"[15] بۆ تێگەیشتن لە کۆمەڵگەی جیهانی لە حاڵی قەوارەگرتن- کە بەرهەمی پرۆسەی بەجیهانیبوونە- بە پێویست دەزانن (Robinson, 1996: 615). بۆ وێنە ئالبرۆ خوازیاری تیۆرێکە کە لە سەردەمەکان و کولتوورەکان بانتر بڕوا و هەڵە مۆدێڕنیستیەکان دووبارە نەکاتەوە (Albrow, 1996: 85–89). پۆست مۆدێڕنیستەکان چەمکی کۆمەڵگەیان وەك چەمکێکی کۆساز و بێ کەڵك وەلاناوە و تەنیا باس لە فرەیی و ڕەوانیی بێ سنوور و بێ کۆتایی و نەبوونی تەکوزییەکی ئاسۆیی یا ئەستۆنی دەکەن (McGrew, 199:97).

بەڵام ئەو تیۆرداڕێژانەی لە ڕوانگەیەکی ڕەخنەگرانەوە دڕواننە هزری کۆمەڵناسانەی ئۆرتدۆکس و پۆست مۆدێرن، خوازیاری جۆرێك کۆمەڵناسیی پێبەند بە ئاوەز و مرۆڤن. بە بۆچوونی ئەوان کۆمەڵناسیی بەرهەم هاتوو لەم پێداچوونەوەیە دەبێ دووبارە پێگەیەکی بەرچاو

15- paradigmatic

بۆ ئاوەز کاری و مرۆڤ تەرخان بکا. بۆ وێنە ئارکێر خوازیاری نوێژەنکردنەوەی پرۆژەی رووناکبیرییە بەبێ لایەنە پۆزەتیویستی و مرۆڤ سڕەوەکانی. بەڕای ئەو ئاوەزکاری"دروستکەری پرۆسەی پەڕینەوە بۆ کۆمەڵناسیی نێونەتەوەیی"یە و دابینکەری "کۆمەڵناسی بۆ دنیایەك"ە (Archer, 1999: 144).

ئەم کۆمەڵناسییە داڕێژراوەیە دەبێ توانای تێگەیشتن لە لایەنە دیالتیکی، پاڕادۆکسیکال و ڕەوانەکانی پرۆسەی بەجیهانیبوونیشی هەبێ. بەو پێیە کە بەجیهانیبوون بە زێدەبوونی پڕ هەڵپەی بزووتن و گۆڕینەوەی مرۆڤ، کالاّ و وێناکان لە پانتایی جیهانی یان ڕەوتە بێ سنوورە جیهانییەکان و ڕەوانیی بێ کۆتایی لەگەڵ خۆی دێنێ لە ئاکام دا پەرچەکردارگەلێك بە مەبەستی دانانی سنووردارێتی، سنووربەندی، جێگیری و خۆماڵی کردنی پرۆسەکانی بەجیهانیبوون ئەنجام دەدرێن. بۆیە دەبێ زانستە کۆمەڵایەتییەکان بە جۆرێك خۆیان نوێژەن بکەنەوە کە توانای تێگەیشتن کە پاڕادۆکس و دیالکتیکە ڕەوت/ وەستان، ڕەوانی/ جێگیری و بێ سنووری/ سنووردارێتیی هەبێ (Meyer and Geschiere, 1999: 3- 4).

ئەگەرچی کۆمەڵگەی زانستی بۆ گەیشتن بە زانستێکی کۆمەڵایەتی دڵخواز ڕێگایەکی درێژ و پڕ هەوراز و نشێوی لەبەر دایە، بەڵام هەوڵی بایەخدار لەم پێناوەدا دراوە. هێندێك لە تیۆردارێژان لە چوارچێوەی نەریتە فکرییەکانی کلاسیك دا هەوڵیان داوە لە پرۆسەی بەجیهانیبوون بگەن و ژمارەیەکی دیکەش هەوڵیان داوە تیۆری نوێ لەبارەی ئەم پرۆسەیەوە داڕێژن. بۆ ئاگادار بوون لەم جۆرە هەوڵە فکرییانە بەشی دواترمان بۆ "تیۆرەکانی بەجیهانیبوون" تەرخان کردوە.

## تیۆرەکانی بەجیهانیبوون

هەروەك پێشتر گوترا، پرۆسەی پڕ هەڵپە و بەرفرەی بەجیهانیبوون لە دەیەکانی دوایی دا بەستێنێکی لەبارو و پاڵنەرێکی بەهێزی بۆ لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئەم پرۆسەیە پێك هێناوە و ئێستاکە ژمارەیەکی زۆر لە ئابووریزانان، کۆمەڵناسان و زانایانی سیاسی سەبارەت بە لایەنە جۆراوجۆرەکانی بەجیهانیبوون بیر دەکەنەوە کە بەرهەمی کارەکانیان تیۆریگەلێکە لە پێوەندی لەگەڵ سەرهەڵدان، تەنینەوە و بەگوڕبوونی پرۆسەی بەجیهانیبوون، کاریگەری و دەرەنجامەکانی لە ژیانی کۆمەڵایەتی لە جیهانی هاوچەرخ دا. دووره دیمەنی بەجیهانیبوونیش لە بابەتەکانی ئەو تیۆرییانەیە.



دیارە تیۆرەکانی بەجیهانیبوون لەو تیۆرانەدا کە لە چەندین ساڵی دوایی دا خراونەتە بەرچاو کورت نابنەوە. لە ژمارەیەك لەو تیۆریانەدا کە لە دەیەکانی دوای شەڕی جیهانیی دووهەمیش خراونەتە ڕوو باس لە پرۆسەی بەجیهانیبوون و هۆکارە جیهانیکەر و هاوچەشنی خولقێنەکان کراوە و تەنانەت کۆمەڵناسە کلاسیکییەکانی وەك دورکیم، مارکس و ڤێبێریش کەم تا زۆر لەم بارەیەوە بیریان کردۆتەوە. کەواتە بۆ خستنە ڕووی وێنەیەکی تەواو لە تیۆرەکانی بەجیهانیبوون، ڕاو بۆچوونەکانی هەر سێك بەرە بە کورتی باس دەکەین.

## بەرەی یەکەم

ئەگەرچی پێشێتی پەیداکردنی بابەتی بەجیهانیبوون لە بەرهەمەکانی مێژوونووسان، کۆمەڵناسان و تیۆردارێژانی سیستمی جیهانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی ئەم دواییانە، بەلاّم باس کردن لە پرۆسەکانی بەرەویەك چوون و لێك گرێدراوی و هێزە جیهانیکەرەکان ڕابردوویەکی زۆری هەیە. نووسەران و تیۆرەدارێژە جۆراوجۆرەکان کەم تا زۆر لە ژێر ناوی جۆراوجۆردا باسیان لە پرۆسە و هێزگەلێکی ئەوتۆ کردوە و لە هەوڵی وەسف کردن و ڕوونکردنەوەی ئەوان دا بوون، بەلاّم لەم نێوەدا، کۆمەڵناسان و ئابووریزانانی ناسراوی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم پێگەیەکی تایبەتیان هەیە.

سێن سیمۆن، کۆمەڵناسی فەرەنسی کە ئێنتێرناسیۆنالیستێکی بە کوڵ بوو ئاواتی سڕینەوەی سنوورەکانی دەخواست، ئایدیالی بوونی ئەم جۆرە بیرانەی بە ساکاری وەرنەدەگرت. ئەو بڕوای وابوو بە هۆی هێزە جیهانیکەرەکان و هاوچەشنی خولقێنەکانەوە، سنوورە سیاسی و کولتوورییەکان زیاتر لە پێشوو لاواز دەبن و کۆمەڵگەی جیهانی دروست دەبێ. دوو هێز یان هۆکار کە لە ڕوانگەی سێن سیمۆنەوە لە ڕەوتی بەجیهانیبوون دا کاریگەرن، پیشەسازیبوون و زانستە کۆمەڵایەتییەکانن (Holton, 1998: 22).

بە بۆچوونی سێن سیمۆن سنعەتی بوون لە ناخی دا پرۆسەیەکی بەرفرەخوازە و تەنینەوەی پرۆسەیەکی ئەوتۆ بۆ کۆمەڵگە نائابوورییەکان، گشتگیر بوونی کولتووری ئەورووپایی بەدواوە دەبێ. بەم شێوەیە سنعەت و ئابووری لە خزمەتی هاوجۆریی کولتووری و کەواتە لە خزمەتی قەوارەگرتنی کۆمەڵگەی جیهانی دا دەبێ. کۆمەڵگاناسیش کە بە بێ لەبەرچاوگرتنی گرێدراوییە کولتوورییەکان لە مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی دەکۆڵێتەوە، ڕۆڵێکی گرنگی لە یەکگرتوو کردنی مرۆڤەکان دا دەبێ. کەواتە سنعەتی بوون

و زانست رەنگدانەوەی لۆژیکی خۆ لـێ لانەدراوی جیهانگەرایی و هاوپێوەندیی پێشکەوتووی جیهانین (Waters, 1995: 5).

ئاگۆست کێنت، قوتابیی سێن سیمۆن، کە ئۆگری پێشکەوتنی مرۆڤ بوو، هاوجۆری و هاوپێوەندیی بەرزەروو و سەرەنجام قەوارەگرتنی کۆمەڵگەیەکی جیهانی بە تێپەڕاندنی "قۆناخە سیاسییەکان"ەوە دەبەستەوە. کێنت لەم بڕوایەدا بوو کە هەموو کۆمەڵگەکان سەرەنجام لە قۆناخی خواناسانە و قۆناخی بان سروشتی تێدەپەڕن و دەگەنە قۆناخی سەلماندن. قۆناخی سەلماندن- کە پێشکەوتووترین قۆناخی کامڵ بوونی مرۆڤە- "لە ژێر هێژمونیی بەڕێوەبەرانی سنعەتی و رێنمایی بیرمەندان دا دەبێ". بە پێچەوانەی قۆناخی یەکەم کە "بنەماڵە یەکەی کۆمەڵایەتیی نموونە دروست دەکا" و دووهەمین قۆناخ کە "دەوڵەت گرنگیی کۆمەڵایەتی پەیدا دەکا"، لە "سێهەمین قۆناخ دا، کۆی جۆری مرۆڤ دەبێتە یەکەی سەرەکیی کۆمەڵایەتی ".

لە حالێك دا کە سێن سیمۆن و ئاگۆست سێنت لە زانست و گۆڕانە زەینییەکانی مرۆڤ دا بە شوێن ریشەکانی پرۆسەی بەجیهانیبوون و قەوارەگرتنی کۆمەڵگەی جیهانی دا دەگەڕان، دورکیم دیاردەی کۆمەڵایەتی بە بەستێن ساز و ساناکەری لە بەر یەك هەڵوەشانی سنوورە کولتووری — سیاسییەکان و هاوجۆریی جیهانی دەزانی. دیارە خودی ئەم دیاردە کۆمەڵایەتییە بەرهەمی پرۆسەی نوێژەنکردنەوەیە کە بناخەکانی تەکووزیی(نظم) کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا لاواز و وێران دەکا. بە دەربڕینێکی دیکە، بە پێی کۆمەڵناسیی دورکیم، لێك هەڵوەشانی تەکووزیی کۆمەڵایەتیی نەریتی بە هۆی پرۆسەی نوێژەنکردنەوە، بە هەنگاوێکی گرنگ لە پێناوی زێدەکردنی هاوچەشنی جیهانی دا دەژمێردرێ.

لە روانگەی دورکیمەوە لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا کە تایبەتمەندییەکەیان هاوپێوەندیی میکانیکییە، پێبەندی بە داب و نەریتە دیاریکراوەکان، گرێدراوی بە شوێنێکی تایبەت و هەبوونی رۆحی کۆیی، گرنگترین توخمە شوناس بەخشەکانن. لە وەها هەلومەرجێك دا، یەکە کۆمەڵایەتییەکان تا رادەیەك سنووردار، یەکپارچە، دزەهەڵنەگر و جیا لە یەکتر دەبن. هەر سیستمێکی سنووردای کۆمەڵایەتی دنیایەکە خاوەنی سنوورگەلی بە تەواوی دیاریکراو و پتەو کە ژیانی ئەو بە پاراستن و بەهێزکردنی جیاوازیی خۆی لەگەڵ یەکەکانی دیکە و بە هێزکردنی هاوئاستییە دەروونییەکان درێژە دەکێشێ. ئەندامانی ئەم جۆرە سیستمانە بۆ پاراستنی شوناسی خۆیان زۆر گرنگی بە پتەویی سنوورەکانیان دەدەن.



بە قەوارە گرتن و تەنینەوەی پرۆسەی نوێژەنکردنەوە، ئەم هاوپێوەندییە بە هێزەی نێوان تاك و کۆمەڵگەی سنووردار و دیاریکراو وردە وردە لاواز دەبێ یان بە واتایەکی دیکە، نوێژەنکردنەوە جۆرێك پرۆسەی جیاکردنەوەی پێکهاتەیی لەگەڵ دایە. لە ژێر کاریگەریی پرۆسەیەکی ئەوتۆدا، نەریتەکان، دەروەستییە کۆمەڵاتییەکان و توخمە شوناس بەخشە سنووردارەکانی دیکە، وەك ناسیۆنالیتە و ئیتنیستیە زیاتر لە پێشوو پێگە و گرنگیان لە دەست دەدەن و دزە هەڵگریی نێوان کۆمەڵە جۆراوجۆرەکان زۆرتر دەبێ. لە راستیدا نوێبوونەوە، نوێکردنەوە و جیاکردنەوەیی پێکهاتەیی سەرچاوەگرتوو لەو، بەم هۆیە هێزگەلێکی جیهانسازن کە پێوەندییە نەریتییە سنووردارەکان لە نێوە دەبەن و هەلومەرجێکی تاڕادەیەك وەك یەك لە هەموو کۆمەڵگەکان دا زاڵ دەکەن (Lyon, 1999: 39). وێبریش لەگەڵ ئەوەی هێندێك تایبەتمەندیی ریزپەڕ بۆ کۆمەڵگە ئەوروپاییەکان و ژیاری رۆژئاوایی لە بەرچاو گرتوە (Dussel, 1998: 3)، نوێکردنەوە و نوێبوونەوە بە هۆکارگەلێکی زۆر کاریگەر لە پرۆسەی بەجیهانیبوون دا دەزانێ. ئەم کاریگەرییە لە پلەی یەکەم دا بە هۆی تەنینەوەی ئاوەزمەندێتی دەرەتانی بۆ پێك هاتووە. هەروەك کە زۆربوونی دابڕانی پێکهاتەیی کەم رەنگ بوونەوەی سنوورەکانی نێوان یەکە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵی لـێدەکەوێتەوە، بە پەرەگرتنی پرۆسەی ئاوەزمەندێتی لە پانتایی جیهانی دا، جیاوازییە کولتووریی، کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی نێوان سیستمە سنووردار و دیاریکراوە کۆمەڵایەتییەکان (بۆ وێنە کۆمەڵگە نەریتییەکان) کەم دەبێتەوە و بەو رادەی بە رادەی هاوچەشنی و یەك ئاستییەکانەوە زیاد دەبێ. کەواتە لە روانگەی وێبرەوە، پرۆسەی ئاوەزمەندێتی وەك توێنەرێکی(حلاّل) جیهانی ساز وایە کە بە تەنینەوەی ئەو، هەموو کولتوورەکان کەم تا زۆر تایبەتمەندیگەلێکی هاوبەش وەدەست دێنن. ئەم تایبەتمەندییانە بریتین لە ناکەسێنی بوونی پێوەندییەکان، پێشکەوتنی تێکنیك، گرنگی پەیداکردنی پسپۆڕی و پەرەگرتنی کۆنترۆڵی تێکنیکیی ئاوەزمەندانە بە سەر پرۆسە سروشتی و کۆمەڵایەتییەکان دا (Waters, 1995:5).

ئەگەرچی تیۆردارێژە کلاسیکە ناوبراوەکان کەم تا زۆر باسیان لە پرۆسەی بەجیهانیبوون و هۆکارەکانی کردوە، بەڵام مارکس لەم بارەیەوە پێگەیەکی تایبەت و دیاری هەیە بە پێچەوانە کێنت، دورکیم و وێبێر کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و پرش و بڵاو باسیان لە بەجیهانیبوون کردوە، تیۆریستی سیستمی سەرمایەداری بە درێژە سەبارەت بەم دیاردەیە قسەی کردوە. لە راستی دا ئەو بە دۆزینەوەی لۆژیکی سیستمی سەرمایەداری، پەردەی لە سەر لۆژیکی پرۆسەی

بەجیهانیبوون لادا. مارکسیش وەك دورکیم و ڤێبێر نوێبوونەوە بە سیستمێکی جیهانی بوو و روو لە پەرەگرتن دەزانێ، بەڵام لە گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە.

لە روانگەی مارکسەوە، بە پێچەوانەی سیستمە کۆمەڵایەتی- ئابوورییەکانی پێشوو، سیستمی سەرمایەداری لە ناخی دا سیستمێکە مەیلی لە قووڵبوونەوەی دەروونی و تەنینەوەی دەرەکییە. کەواتە ئەم سیستمە دوای ئەوەی قەوارەی پەیدا کرد، گەشە و تەنینەوەی خۆی دەست پێ دەکا. ئەگەرچی ئەم گەشە و تەنینەوەیە هەوراز و نشێو و بەرزی و نزمیی لەگەڵ بووە، بەڵام راناوەستێ و درەنگ یان زوو هەموو کۆسپەکان و سنوورە سروشتی، سیاسی و کولتوورییەکان دەبڕێ. کەواتە دەتوانرێ بگوترێ بەجیهانیبوون پرۆسەیەکە کە دەکرێ بڵێین هاوکات لەگەڵ دەرکەوتنی سەرمایەداری دەستی پێ کردوە (Sweezy, 1997: 1).

پەرەگرتنی سیستمی سەرمایەداری لە لۆژیکی کەڵەکە کردن دایە. لەم سیستمەدا، پاراستنی بایەخ و سەنگی سەرمایە بەستراوەتەوە بە کەڵەکردن و پەستێوترانی بێ راوەستان و سەرمایە بەردەوام دەبێ بە کار بهێنرێ تا لانیکەم بتوانێ بایەخی خۆی راگرێ و دووبارە بەرهەم هاتنەوەی سەرمایە پێویستی بە بازاڕ گەلی نوێ بۆ سەرمایەدانان و فرۆشتنی کاڵای بەرهەم هاتوو هەیە. کەواتە سەرمایەداری بمانهەوێ یان نا لە سنوورە نەتەوەییەکان دەرباز دەبێ و پێوەندی و دامەزراوەی شیاو بۆ گەشە و تەنینەوەی خۆی لە سەرزەوییە نوێیەکان دا دادەمەزرێنێ.

بە سەرنجدان بەم تایبەتمەندیەی سەرمایەدارییە کە مارکس و ئینگێلس ئەم سیستمە بە خودانی یەکپارچەکردنی جیهان زانیوە. بورژوازی بۆ گەڕان بە دوای بازاڕی نوێدا لە وڵاتەکەی خۆی واوەتر دەڕوا تا جیهان بکاتە بازاڕێك بۆ سەرمایە دانان و فرۆشتنی بەرهەمەکانی خۆی. هەوڵ و کۆششی سەرمایەداری بۆ کەڵەکەکردنی هەرچی زیاتری سەرمایە، تایبەتمەندییەکی جیهانی دەبەخشێ بە بەرهەمهێنان و بەکارهێنان. کەواتە هەم ئابووری جیهانی دەبێ و هەم فەرهەنگ (Löwy, 1998: 17). لە راستیدا مارکس پێوەندییەك لە نێوان بەرهەمهێنانی سەرمایەدارانە و کولتووری بەکارهێنەکیی جیهانی دروست دەکا کە ئێستاش لە جێی خۆیەتی.

لەگەڵ ئەوەی مارکس هۆکار و ریشەکانی پرۆسەی بەجیهانیبوون لە پێکهاتەی ئابووریی سیستمی سەرمایەداری و نوێبوونەوەدا دەبینێ، لە هەمان کات دا لێکچوون گەلێکی لەگەڵ تیۆرداڕێژە پێشڕەوەکانی بەجیهانیبوونەوە هەیە. ئەوان هەموویان لە لێکدانەوە و روونکردنەوەکانیان دا سەرنجیان داوەتە پێوەندییە ناسیاسییەکانی نێوان کۆمەڵگەکان و رۆڵی دامەزراوە و بگۆڕە سیاسییەکان زۆر بە هێند ناگرن. هەروەها ئۆگری و ویستی دروست کردنی





تیۆرگەلێکی گشتگیر سەبارەت بە گۆڕانکارییە هەمە لایەنە مێژووییەکان کە درەنگ یان زوو هەموو کۆمەڵگەکان دەگرێتەوە و هەموویان لە یاساگەلێکی دیاریکراو پێڕەوی دەکەن، تایبەتمەندییەکی هاوبەشی ئەو تیۆریستانەیە. "جیاکردنەوەی پێکهاتەیی" دورکیم، "ئاوەزمەندێتی"ی ڤێبێر "پرۆسەی بە کاڵایی بوون"ی مارکس بە نموونە بەرچاوەکانی ئەم تیۆرییانە دەژمێردرێن.

**بەرەی دووهەم**

ئەم تیۆرییانە کەم تا زۆر سروش بەخشی بەرەی دووهەمی تیۆریستەکانی بەجیهانیبوون بوون. ئەم تیۆریستانە لە لایەنی جۆراوجۆرەوە لە پرۆسەی بەجیهانیبوونیان کۆڵیوەتەوە و تیۆری لێك جیاوازیان خستۆتەروو، بەڵام دەتوانین ئەوان بە پێی پێشێتییەك کە بە یەکێك لە هۆکارە ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و کولتووریەکانی دەدەن، دابەش بکەین. کەواتە لەم باسەدا قسە لە چوار دەستە لە تیۆرییە کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی و کولتوورییەکان دەکەین.

تیۆرییە کۆمەڵایەتییەکانی بەجیهانیبوون بە باس کردن لە هزر و بۆچوونەکانی کارکردگەرا ئەمریکاییەکان دەست پێ دەکەین. ئەو تیۆریستانەی کە لە چوارچێوەی نەریتی هزریی دورکیم دا بیر دەکەنەوە، نوێ کردنەوە بە هۆکارێکی ئاوێتەکەر و هاوچەشن ساز دادەنێن. لە روانگەی ئەوانەوە پرۆسەی نوێکردنەوە بە زیادکردن و بەربڵاوکردنی جیاکردنەوە لە بیاڤە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دا، ریتواڵەکان، بایەخە تایبەت و نەریتەکان لاواز و تاکگەرایی، یۆنیۆرسالیسم، سکولاریسم و ئاوەزمەندێتی بەهێز کردن. کەواتە هەڵبژاردنە ئاوەزمەندانەکان زیاتر لە پێشوو پەرە دەگرن و کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان لە ئاکامی ئەم هەڵبژاردنە ئاوەزمەندانەیەی ئەندامەکانی دا، بەرەو دۆخێکی کۆمەڵایەتی هاوبەش دەچێ و لێك نزیك دەبنەوە.

لە روانگە پارسۆنز[16]ەوە کۆمەڵگەکان لە پرۆسەی نوێکردنەوەدا بەردەوام دەگۆڕێن و جیابوونەیەکی پێکهاتەیی روو لە گەشە ئەوان دادەگرێ، بەڵام ئەم گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییە ئاراستەیەکی تاڕادەیەك جێگیر و دیاریکراوی هەیە و پێڕەوی لە یەك لۆژیك دەکا. لۆژیکی جێگای باس برێتییە لە گونجان یا توانای سیستمێکی زیندوو بۆ گونجاندن لەگەڵ ژینگەی خۆی. کەواتە

16- parsons

ئەگەر کۆمەڵگەکان لە ڕێرەوی گۆڕانکارییەکی هاوبەش دا هەنگاو هەڵێنێتەوە هاوچەشن تر [و] لە یەکدیدا ئاوێتە دەبن. ئەمە هەمان پرۆسەی بەجیهانیبوونە (Waters, 1995: 13 – 15).

تیۆریستەکانی وەك کێڕ[17]، دانلوپ[18] و هاربیسۆن[19]-یش ڕایەکی هاوشێوەیان لەبارەی پرۆسەی یەك چەشنتر بوونی کۆمەڵگەکانەوە هەیە. ئەم هاوچەشنیە ڕوو لە زیاد بوونە لە "لۆژیکی سنعەتیبوون" پێڕەوی دەکا و وردە وردە سەرانسەری جیهان دادەگرێ. ئەم لۆژیکە بە هێزە، کۆمەڵگەمان دەخاتە هەوڵی زێدەترەوە بۆ بەدەستهێنانی لێهاتووترین تێکنۆلۆژیی بەرهەمهێنان و بە پەرەگرتنی تێکنۆلۆژییەکی ئەوتۆ، سیستمە کۆمەڵایەتییەکانیش بۆ گونجان لەگەڵ پێکهاتەی ئابووری نوێ، دەگۆڕێن . بەم چەشنە هەڵبژاردنە ئاوەزمەندانەکان بۆ بەدەستهێنانی کارایی لەباری ئابووری، هاوچەشنی و هاپێوەندی ڕوو لە زیادبوونی نێوان کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان دێنێتە ئاراوە (Warers, 1995: 17).

دانیەل بێل تیۆریستێکی دیکەیە کە لە ڕوانگەیەکی ئەوتۆوە خەریکی پرۆسەی یەکپارچەکردن و هاوپێوەندبوونی کۆمەڵگەکان دەبێ. لە دەیەی شەست بەملاوە ژمارەیەك لە تیۆریستەکان بەم ئاکامە گەیشتن کە قۆناخێکی نوێ لە ژیانی مرۆڤ دا دەستی پێکردوە و تەکووزیی کۆمەڵایەتیی جیاواز پێك دێ. ئەوان گەیشتن بە تەکووزییەکی کۆمەڵایەتیی ئەوتۆیان بە چارەنووسێکی بێ ئەملاولای هەموو کۆمەڵگەکان دەزانی و لە سەر ئەم بنەمایە توندتربوون و پەرەگرتنی پرۆسەی بەجیهانیبوونیان پێش بینی دەکرد(Lyon, 1999: 49). بێلیش لە دەیەی حەفتادا بەم ئاکامە گەیشت.

کۆمەڵگەیەکی نوێ کە بێل مژدەی پێکهاتنی ئەوی دەدا، "کۆمەڵگەی زانیاری تەوەر" بوو. ئەو بە پێوانە دانانی تێکنۆلۆژی، کۆمەڵگەکان بە سێ جۆر کۆمەڵگەی کشتوکاڵی، کۆمەڵگەی سنعەتی و کۆمەڵگەی زانیاری تەوەر دابەش دەکا. لە کۆمەڵگەی زانیاری تەوەردا- کە دوای شەڕی جیهانی دووهەم پێك هاتووە و پەرەی گرتووە- زانیاری و تێکنۆلۆژی بە پێوانە دەژمێردرێن، لە کاتێك دا کە ماددەی خاو و وزە دوا بە دوای یەك دا تێکنۆلۆژیی سەرەکیی کۆمەڵگەکانی کشتوکاڵی، سنعەتی بوون. لەم کۆمەڵگەی زانیاری تەوەر و بان سنعەتییە دا، هێزی کار زۆرتر لە پێشوو لە بەشەکانی کشتوکاڵ و سنعەتەوە بەرەو بەشی

17- Kerr

18- dunlup

19- Harbison





خزمەتگوزاری دەچێ و بەڕێوەبەران و کەسانی شارەزا پێگەیەکی گرنگتر وەدەست دێنن (Dutton 1999, 410 –11). کەواتە تێکنۆلۆژییە فیکرییەکان بۆ بەرهەمهێنانی خزمەتگوزاری، دەبنە هۆی هاوچەشنی و بەرەو یەکچوون لە ئاستی جیهان دا.

تیۆریستێکی دیکە کە لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە دەڕوانێتە پرۆسەی بەجیهانیبوون نێکۆلاس لۆهمانە. ئەوەی کە تیۆرەکەی لۆهمان لەگەل پرۆسەی بەجیهانیبوون گرێ دەدا، پێناسەی ئەوە بۆ کۆمەڵگە. کۆمەڵگە لە پلەی یەکەم دا جۆرێك سیستمی کۆمەڵایەتییە و کردارگەلی سەرچاوەگرتوو لە پێوەندیی واتادار، بە توخمە پێکهێنەرەکانی ئەم سیستمە کۆمەڵایەتییە دەژمێردرێن. کەواتە کۆمەڵگە بریتییە لە سیستمێکی کۆمەڵایەتیی گشتگیر کە هەر[چەشنە] پێوەندییەکی واتادار دەگرێتەوە. سنوورەکانی کۆمەڵگە لەگەڵ پانتایی پێوەندیی واتادار یەك دەگرنەوە و لە جێگایەك کە پێوەندیەکی ئەوتۆ کۆتایی پێ بێ، دەبێ بە سنووری کۆمەڵگەی دانێین (Beyer, 1994: 33).

لە ڕوانگەی لۆهمانەوە، ئەگەر پێوەندیی واتادار بە توخمی پێکهێنەری کۆمەڵگە بزانین، دەتوانین سیستمی کۆمەڵایەتیی جیهان بە کۆمەڵگەیەك لە قەڵەم بدەین، چونکە بە کردەوە دوو کەسی هەڵکەوتوو لە دوو جەمسەری گۆی زەوی دەتوانن لەگەڵ یەکتری پێوەندی دامەزرێنن. ئێستا بە هیچ شێوەیەك پانتاییە سیاسی و کولتوورییەکان لەگەڵ پانتاییە پێوەندییەکان هاوسنوور نین و مرۆڤەکان بە یارمەتیی ئامراز و تێکنۆلۆژییەکانی پێوەندیی زۆر پێشکەوتوو دەتوانن لە پانتایی جیهان دا پێوەندییان هەبێ. بە وتەیەکی دیکە، پێوەندیی واتادارمۆدێکی[20] کۆمەڵایەتیی بنەماییە کە لە سەرانسەری جیهان دا بڵاو دەبێتەوە و لەم ڕووەوە دەتوانرێ بگوترێ کە ئێستا خاوەنی کۆمەڵگەیەکی جیهانین (Beyer, 1994: .34)

دیارە لۆهمان پرۆسەی نوێکردنەوە بە زەمینە خۆشکەری کۆمەڵگەیەکی ئەوتۆ دەزانێ و بەجیهانیبوون بە دەرهاویشتەی تاڕادەیەك لاوەکیی نوێکردنەوەی پێکهاتەیی دەژمێرێ. لە کۆمەڵگە نەریتیەکان دا کە لە ژێر هێژموونیی جیاکردنەوەی توێژبەندی کراو[21] دان، توێژە زاڵەکان سەرچاوە سەرەکییەکانی پێوەندی (بۆ وێنە سامان، هێزی سوپایی، زانست و هێما ئایینییەکان) یان لە بەردەست دایە. کەواتە پێوەندییەکان زۆرتر لەم توێژانە دا کورت دەبنەوە و

20- mode

21- Stratified

سنووردارێتیی وڵاتیش ئەو دۆخە جێگیر دەكا. بە دەركەوتنی نوێبوونەوە و دەست پێكردنی پرۆسەی نوێكردنەوە ئەم دۆخە دەگۆڕێ.

ئەو كۆمەڵگەیانەی لە ژێر كاریگەریی پرۆسەیەكی ئەوتۆ دان دەگۆڕێن و جیاكردنەوەی كاركردی وردە وردە جێگای جیاكردنەوەی توێژبەندییانە دەگرێتەوە. كاركرد بە سەر توێژدا سەردەكەوێ و ڕۆڵی سنووردارکەرانەی سەرزەوین وردە وردە كەم دەبێتەوە. كەواتە پانتایی پێوەندییانە بەرین دەبێتەوە و لە سنووره نەتەوەییەكان بانتر دەڕوا و بارستایی مەزنی زانیاریی بان نەتەوەیی لە بیاڤە جۆراوجۆرەكانی وەك بازرگانی، زانستەكان، گەشتیاری، فێركردن، كۆچ و ئایین دا، بەجیهانیبوونی پێوەندییەكان بە باشترین شێوە دەردەخات (Beyer, 1994: 46 – 49; Luhman, 1982: 229).

دەستەیەكی دیكە لە تیۆریستەكانی بەرەی دووهەم، ڕووانینێكی جیاوازیان بۆ بەجیهانیبوون هەیە. ئەگەرچی ئەوان پرۆسەی یەكپارچەبوونی جیهان قەبووڵ دەكەن و لەلادانان بە بەرەو یەكچوون و هاوپێوەندبوونی ڕوو لە زیادبوونی كۆمەڵگە جۆراوجۆرەكانی جیهان دائێنن، بەڵام ڕیشەی ئەم جۆرە گۆڕانە گشتییە جیهانداگرانە نەك لە هەڵبژاردنە ئاوەزمەندانەكانی مرۆڤەكان یان پەرەگرتنی پێوەندیی واتادار، بەڵكوو لە هۆكارە ئابوورییەكان دا دەدۆزنەوە. لە ڕوانگەی ئەوانەوە ئەو شتەی چارەنووسێكی وەك یەك بۆ كۆمەڵگەكانی جیهان دیاری دەكا، زاڵبوونی شێوە بەرهەمهێنانێكی وەك یەك بە سەر جیهان دایە. بە دەربڕینێكی دیكە ئەوان لە ژێر باندۆری ڕێوشوێنەكانی ماركس دا، بەجیهانیبوون بە تەنینەوەی سیستمی سەرمایەداری بۆ ناوچە دوورەكانی جیهان دەزانێ. تیۆریستەكانی وەك لنین، سەمیر ئەمین[22] و سكلیر[23] ڕوانگەیەكی وایان خستۆتە ڕوو، بەڵام والرشتین بە دیارترین نوێنەری ئەم ڕوانگەیە دەژمێردرێ. چەمكی تەوەریی تیۆرەكەی والرشتین لەبارەی بەجیهانیبوونەوە بریتییە لە "سیستمی كۆمەڵایەتی". ئەوەی كە قەوارە و چییەتی بە سیستمێكی كۆمەڵایەتی دەبەخشێ، بوونی دابەشكردنێكی كارە لە نێو ئەو دا. ئەم كار دابەشكردنە هەم درێژەی ژیانی سیستمەكە مسۆگەر دەكا و هەم دەبێتە هۆی بەستراوەیی دوو لایەنەی بەشە پێكهێنەرەكانی ئەو. بە دەربڕینێكی دیكە، دابەش كردنی كار لە نێو سیستمی كۆمەڵایەتیدا بە شێوەیەكە كە بەش و بیاڤە جۆراوجۆرەكانی نێو ئەو بۆ دابین كردنی پلە بە

22- S. amin
23- Sklair



پلە و بەردەوامی پێداویستییەكانی خۆیان ناچارن دانوستانی ئابووری لەگەڵ یەكتر بكەن (Wallersteitn, 1974: 390).

لەم ڕوانگەیەوە، والرشتین سێ جۆر سیستمی كۆمەڵایەتی لە مێژووی مرۆڤ دا دەس نیشان دەكا: سیستمە بچووكەكان، ئیمپراتۆریا جیهانی و ئابوورییە جیهانییەكان: سیستمە بچووكەكان لە ڕاستیدا ئابووریی سادەی پشت ئەستوور بە كشتوكاڵ یان ڕاو و شكارن كە ئێستا نەماون و ئیمپراتۆریا جیهانییەكان ئەو سیستمانەن كە لە خۆگری چەند كولتوورن، بەڵام خاوەنی یەك سیستمی سیاسی و دابەشكردنی كاری وەیەكن كە یەكەمین جۆر لە سێ جۆرە لواوەكەی سیستمی جیهانین. ئیمپراتۆریا كۆنەكان و ئیمپراتۆریای عوسمانی دەتوانین بە نموونە دیارەكانی ئەم جۆرە سیستمە جیهانییە لە قەڵەم بدەین.

سیستمی جیهانیی مۆدێرن یەكەمین سیستمی كۆمەڵایەتییە كە پانتاییەكی جیهانیی بە خۆوە گرتووە. لۆژیكی ئابووریی زاڵ بە سەر ئەم سیستمەدا، وردە وردە سەرانسەری جیهان دەكاتە شوێنێك بۆ كەڵەكە بوونی بێكۆتایی سەرمایە و جۆرێك كار دابەشكردنی جیهانی دروست دەكا (Wallerstein, 1983: 18). بەڵام بەجیهانیبوونی سەرمایە جۆرێك نایەكسانیی جیهانیی لەگەڵ دایە. سیستمی جیهانیی مۆدێرن لە سێ ناوچەی ناوەند، پەراوێز و شێوە پەراوێز پێك دێ. وڵاتانی ناوەند وەك هەرێمە (وڵاتە) یەكگرتووەكانی ئەمریكا و ژاپۆن دەوڵەمەند و باڵادەستن، وڵاتانی پەراوێز وەك زئیر و بەنگلادیش هەژاران و لە لایەن ناوەندەوە دەچەوسێنەوە و وڵاتانی دەوروبەری وەك برزیل و چین-یش وەك پێوەندەری نێوان ناوەند و دەوروبەر كار دەكەن (Beyer, 1998: 306).

هەر چۆنێك بێ لە ڕوانگەی والرشتینەوە، ئابووریی جیهانیی سەرمایەداری ئێستا بەستێنی كۆمەڵایەتیی جیهانییە كە هەموو لایەنەكانی دیكەی ژیانی كۆمەڵایەتی، لەوانە سیاسەت و كولتوور دیاری دەكا. ئێستاكە لەگەڵ ئەوەی كە جیهان بە دەیان یەكەی سیاسیی جیاواز دابەش كراوە، دەتوانین باس لە یەك سیستمی كۆمەڵایەتیی جیهانی یان یەك كۆمەڵگەی جیهانی بكەین، چونكە توخمی پێكهێنەری سیستمێكی كۆمەڵایەتی دانوستاندنی (گۆڕینەوە)ی كاڵاییە و ئەم دانوستانە بە هۆی كاردابەشكردنی نێونەتەوەییەوە، جیهانی بووە. لە ڕاستی دا دنیا خەریكە یەكێك لە پێشكەوتووترین قۆناخەكانی بەجیهانیبوون تاقی دەكاتەوە.

تێگەیشتن لە بەجیهانیبوون تەنیا كەڵكەڵەی كۆمەڵناسان و مێژوونووسانی ئابووری نەبووە. لەم ساڵانەی دوایی دا پرۆسەی بەجیهانیبوون هەڵپەیەكی سەرسامهێنەری هەڵ گرتوە، هێندێك



لە تیۆریستەکانی لقی پێوەندییە نێونەتەوەییەکان و زانستە سیاسییەکانی ئۆگری بابەتی بەجیهانیبوون بوون، لە هەوڵی لێکۆڵینەوە و روونکردنەوەی ئەو دان. ئەوان بۆ نیشاندانی پەرچەکردار لە بەرانبەر کەم تەرخەمی یان سەرنج نەدانی تیۆریستەکانی دیکە لە رۆڵ و پێگەی دەوڵەت، پرۆسەی بەجیهانیبوون لە پێوەندی لەگەڵ ئەم دامەزراوە گرنگەدا شی دەکەنەوە. بە بڕوای ئەم دەستەیە لە تیۆریستەکان، ئەرکی سەرەکیی لێکۆڵینەوە و موتاڵای بەجیهانیبوون لە ئەستۆی زانستە سیاسییەکان و پێوەندییە نێونەتەوەییەکانە، نەك کۆمەڵناسی.

بە گشتی ئەم دەستەیە لە تیۆریستەکان لەگەڵ ئەوەی کە پرۆسەی بەجیهانیبوون لە هێندێك لە بیاڤەکان دا قەبووڵ دەکەن، هەروا پێگە و رۆڵێکی دیار بۆ دامەزراوەی دەوڵەت لە بەرچاو دەگرن و نایانهەوێ ئەگەری لە بەریەکهەڵوەشانی یەکجارەکیی دەوڵەت — نەتەوەکان و کولتوورە نەتەوەییەکان بێننە بەرچاو. هێندێك لەوان تەنانەت خێرایی ئاراستە(جهت)ی پرۆسەی بەجیهانیبوون لە بواری ئابووری دا دەگەڕێننەوە بۆ باندۆری سیاسی و بە تایبەت دەوڵەتەکان. بێرتۆن[24]، بوول[25]، گیلپین[26] و رۆزنا، دەتوانین لە ریزی ئەم تیۆریستانەدا دانێین.

بیرتۆن رادەسپێرێ کە نەك [سەبارەت بە] پێوەندییە نێونەتەوەییەکان، بەڵکوو دەبێ کۆمەڵگەی جیهانییش مۆتالاَ بکەین. ئەگەرچی لە روانگەی بێرتۆنەوە پێویستیی گۆڕینی ئاستی شیکردنەوە، بەڵگەیەکە لە سەر پرۆسەی بەرین و پڕ هەڵپەی بەجیهانیبوون، ئێستاش گرنگترین توخمی پێکهێنەری ئەو کۆمەڵگەیەیە، دەوڵەتەکان و پێوەندیی نێوان ئەوانە کە لە چوارچێوەی کۆمەڵێك لە رایەڵکەکانی پێوەندیی بان نەتەوەیی دا دەردەکەوێ. بولیش زەقترین هێمای پرۆسەی بەجیهانیبوون بە شکڵ گرتنی سیستمەکانی دەسەڵاتی یەکتر داگر(همپوش) دەزانێ کە لەگەڵ دەوڵەتان دەژین یان رکەبەرییان دەکەن (Waters, 1995: 27 – .29).

گیلپین پرۆسەی بەجیهانیبوون لەگەڵ پرۆسەی بەکاڵایی بوون بە هاوواتا دەزانێ و بە کاڵابوون بە ئاکامی بێئەملاو ئەولای سیستمی سەرمایەداری دەزانێ. کەواتە لە روانگەی ئەوەوە بە پەرەگرتنی سیستمی سەرمایەداری، پرۆسەی بەجیهانیبوونیش پەرە دەگرێ و هەر کات ئەم سیستمە لە سەرانسەری جیهان دا پەرە بستێنێ، پرۆسەی بەجیهانیبوون کامڵ دەبێ. ئەگەرچی ئەم سیستمە ئابووری — کۆمەڵایەتییە لۆژیك و بزاوتی دەروونیی خۆی هەیە، بەڵام

24- Burton
25- Bull
26- Gilpin





خێرایی و ئاراستەی گۆڕان و بەرەو پێشچوونی ئەو بە هۆی هۆکار و بگۆڕە دەرەکییەکانەوە، بە تایبەت سیستمە سیاسی و نێونەتەوەییەکانەوە دیاری دەکرێ.

دیارە گیلپین واوەتر رۆیشتووە، لۆژیك و هۆکاری سەرەکیی بەجیهانیبوون بە سیاسی — سوپایی دادەنێ. بە ڕای ئەو ئەگەرچی بەجیهانیبوون زۆرتر لە بیاڤی ئابووریدا دەردەکەوێ، هێزی ژێرەوەی ئەو لە سیاسەتی هێز پێك دێ. بە گوتەیەکی دیکە بەجیهانیبوون لە راستیدا بە لۆژیکێکی سیاسی یان بەرزی و نزمییە هێژمونییەکانی سیستمی نێودەوڵەتی شکڵ دەگرێ. لە مێژووی سیستمی جیهانیدا بەرزی و نزمییەکانی هێزە هێرمۆنیکەکان دا، شایەدی گەیشتنە لوتکە و ورووژانی پرۆسەی بەجیهانیبوون بووین. بۆ وێنە لە دەیەکانی دوایی دا، بە گورترین قۆناخی بەجیهانیبوون هاوکات بووە لەگەڵ لوتکەی دەسەڵاتی هێژمونیکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوای شەڕی جیهانیی دووهەم (McGrew, 1996: 72).

لە سەر بنەمای ئەم روانگەیە، گیلپین لە هەمان کات دا کە لێك گرێدراوی و لێك تەنراویی جیهانی لە بواری ئابووریدا قەبووڵ دەکا، بۆ سیاسەت و هێزیش جۆرێك سەربەخۆیی و تەنانەت توانایی دیاریکەرانە لە بەر چاو دەگرێ. کەواتە بەجیهانیبوونی ئابووریش پاشکۆی پێکهاتەی دەسەڵاتە لە سیستمی جیهانی دا. لە قۆناخەکانی بە توانابوونی هێزە هێژمونیەکان دا، پرۆسەی بەجیهانیبوون بەگوڕتر و گشتگیرتر دەبێ و لە کاتی نوشستی هێنانی ئەو هێزانە دا، جۆرێك ناجێگیری و کەمبوونەوەی لێك گرێدراوی دوو لایەنە جیهان دادەگرێ. کەواتە بەجیهانیبوون نەك پرۆسەیەکی هێڵی، بەڵکوو دیاردەیەکی خولەکییە. جیمز رۆزانا پرۆسەی بەجیهانیبوون بە بەستێنی شکڵ گرتنی "*سیاسەتی بان نێونەتەوەیی*" دەزانێ. بە بۆچوونی ئەو کاروباری جیهانی تەنیا "پێوەندییە نێونەتەوەییەکان" نین، بەڵکوو، "پێوەندییە بان نەتەوەییەکان"یشن کە پێوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوان حکوومەتەکان، دامەزراوە نێونەتەوەییە حکوومەتی و ناحکومەتی و رێکخراوە ناحکومەتییەکان لە خۆ دەگرن. لە شکڵ گرتنی "سیاسەتی بان نێونەتەوەیی" و "پێوەندییە بان نەتەوەییەکان" دا هۆکارەکانی وەك دەرکەوتنی پرسگەلی بانتر لە پانتایی دەوڵەتەکان، کەمبوونەوەی توانای دەوڵەتەکان بۆ چارەسەر کردنی گرفتە نەتەوەییەکان و دەرکەوتنی دامەزراوەگەلی بەهێزتر لە کۆمەڵگە نەتەوەییەکان کاریگەرییان هەیە (Waters, 1995: 30).

بەڵام پێشکەوتنەکان و بەرەو پێشچوونە تێکنیکی یا پەرەگرتنی تێکنۆلۆژیای میکرۆئێلکترۆنیک گرنگترین رۆڵیان هەیە کە دەرەتانی بزووتنی خێرای خەڵک، بیرو ڕا و وێنا و سەرچاوەکان لە ئاستی گۆی زەویدا پێك دێنێ و مەوداکان زیاتر لە پێشوو کەم دەکاتەوە:

ئەوە تێکنۆلۆژییە کە پانتایی شکڵ گرتنی کارو باری مرۆیی بە قووڵی گۆڕیوە، رێگای بە خەڵک داوە لە ماوەیەکی کورت دا شتی زیاتر و خاوەن پەیامی بەربڵاوتر لەوەی کە پێشتر وێنا دەکرا، تاقی بکەنەوە، بەکورتی، ئەمە تێکنۆلۆژییە کە کۆمەڵگە خۆجێیی، نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکان زۆر زیاتر لە رابردوو پێکەوە گرێ دەدا(Rosenau, 1990: 17) .

لە کاتێك دا ژمارەیەك لە تیۆریستەکان تەکەزی لە سەر لایەنە کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسییەکانی پرۆسەی بەجیهانیبوون دەکەن، هێندێك لە تیۆریستەکانیش لە روانگەیەکی کولتوورییەوە دەڕواننە ئەم پرۆسەیە. ئەوان بە وەبیرهێنانەوەی دەوری زۆر گرنگی رەوت و رایەڵکەکانی راگەیاندن، سەرنجدانی یەکجار زۆر بە هۆکارە ئابووریی و سیاسییەکانی بەجیهانیبوون بە بێ جێ دەزانن و خوازیاری سەرنجدانی زیاتر بە کولتوور و وشیارین. ئەو تیۆریستانە پرۆسەی لێك تەنران و یەکدەست بوونی جیهان قەبووڵ دەکەن، بەڵام بڵاوبوونەوەی کولتوورێکی رەشاییانەی هاوبەش بە هۆکار و یارمەتیدەری ئەم هاوجۆری و لێك گرێدراوییە روو لە زیادبوونە دەزانن.

مەك لۆهان لەو تیۆریستانەیە کە روانگەیەکی کولتووریی بۆ بەجیهانیبوون هەیە. ئەو لە روانگەی کۆمەڵناسیی پێوەندییەکانەوە زیاتر گرنگی بە گرێدەرە (واسط)کانی راگوازتنی توخمە کولتوورییەکان تا بە نێوەڕۆکی کولتوور و مێژووی ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ لە سەر بنەمای تێکنۆلۆژیی پێوەندی نوێژەن دەکاتەوە. کەواتە لە تیۆرییەکەی مەك لۆهان دا تێگەیشتن لە پرۆسەی بەجیهانیبوونیش بێجگە لە رێگای ناسینی پێگەی هەڵگری تێکنۆلۆژیی گەیەنەرەکانی راگوازتن و پێوەندییەکانەوە نایەتە دی.

ئەگەر تێکنۆلۆژیی پێوەندییەکان بکەینە تەوەر، دەتوانین مێژوو بە دوو قۆناغی سەرەکی دابەش بکەین: "قۆناغی خێڵەکی"[27] و "قۆناخی سنعەتی"[28]. قۆناخی یەکەم لە سەر بنەمای

27- industrial epoch
28- industrial epoch



تێکنۆلۆژیی پێوەندیی گوتارییانە و چەرخ دامەزرابوو. گرنگترین تێکنۆلۆژی و ئامرازی پێوەندی ئەم قۆناخە بریتی بوو لەو وشە ساکارانەی دەگوتران و ئامرازی ساکاری دەستی. کەواتە لەو قۆناخەدا، کولتوور زارەکی بوو و ئەزموونی مرۆیی بە ناچار ئەزموونی کاتەکی، بێ پێوەندەر، کۆیی و هەستەکی [بوو] (Waters, 1995: 34).

قۆناخی دووهەم لە سەر بنەمای تێکنۆلۆژیی نووسین و مێکانیکی کردنی کار راوەستاوە. کولتوور لەم قۆناخەدا کولتوورێکی نووسراو و خوێندەواری بنەمایە و ئەزموونی مرۆیی لەم قۆناخەدا ئەزموونێکی بەش بەش، لێك جیا و تایبەتییە، چونکە لەم قۆناخەدا، گرنگترین ئامراز و شێوازی پێوەندی یان نووسین و خوێندنەوە بە شێوەیەکی بە تەواوی تاکەکەسی دەرەتانی هەبوو و باو بوو. زێدەتر لەمانە لە "قۆناخی سنعەتی"دا، بەشی بەرچاوی پێوەندییەکان بە هۆی هەستی دیتنەوە دروست دەبوون تاکو هەستەکانی دیکە.

مەك لۆهان بڕوای وایە کە "قۆناخی سنعەتی" و پێشکەوتنە جۆراوجۆرەکان لە بیاڤی دوو تێکنۆلۆژییە سەرەکییەکەی ئەم قۆناخەدا، پێوەندییەکانی زیاتر لە پێشوو ساناتر کرد و خێرایی و بارستایی پێوەندییەکان رۆژ لەگەڵ رۆژ زیاتر بوو. بۆ وێنە کەڵك وەرگرتن لە کاغز، چەرخ و جادە(رێگەی ئاسفاڵت) رۆڵێکی گەورەیان لە پەرەپێدان بە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دا بووە. هەمووی ئەم جۆرە گۆڕانکاری و پێشکەوتنانە، بە گشتی کاریگەریی هاوچەشن کارانەیان هەبوو و بناخەکانی پرۆسەی بەجیهانیبوونیان بەرزکردۆتەوە. بە گوتەیەکی دیکە ئەم گۆڕانکارییانە، هۆکاری رێکخستنی دووبارەی فەزا لە پێناوی هێنانە دی فەزایەکی جیهانی دا بوون.

دیارە رێکخستنی دووبارەی فەزا لە رێگای کاتەوە، بە داهێنان و گەشەپێدانی دوو ئامرازی گرنگی کۆساز و گشتی تاوی (هەشتاو) هەڵ گرت: کاتژمێری میکانیکی و پارە. داهێنانی کاتژمێری میکانیکی بووتە هۆی ئەوەی کە وێناکردنی خولەکی و وەرزی لە کات وەلانرێ و چەمکی کاتی هێڵی و درێژ پەرە بگرێ. لە چوارچێوەی چەمکێکی ئەوتۆ لە کات دا، نەك تەنیا کات بە تەواوی ژماردن هەڵگربوو، بەڵکوو بە جۆرێك کاتی کۆیی و جیهانییش شکڵی گرت کە رێکخەری کردارە کۆمەڵایەتییەکان لە پانتایی جیهانی دا بوو. داهێنانی پارەش خێرایی و بارستایی پێوەندییەکانی زۆرتر کرد.

بەم پێیە کە ئەم ئامرازانە توانایی بەکارهێنانی گشتی و جیهانییان بوو، بوار خۆشکەر و یارمەتیدەری پرۆسەی بەجیهانیبوونیش بوون، بەڵام پێشکەوتووترین و بەربڵاوترین پرۆسەی بەجیهانیبوون کاتێك دەستی پێ کرد کە گەیەنەرە ئیلکترۆنیکیەکان هاتنە بواری



پێوەندییەکانەوە. بە بۆچوونی مەك لۆهان ئەم گەیەنەرانە ئەم توانایيە بە ئێمە دەدەن کە لە جیهان وەك گشتێك تێ بگەین: "بە ئیلکتریستیە، ئێمە سیستمی دەماریی ناوەندیی خۆمان لە ئاستی جیهان دا پەرە پێبدەین و بە خێرایی بە ئەزموونی هەر مرۆڤێکەوە گرێ بدرێین" (MuLuhan, 1964: 358).

لە ژێر کاریگەریی ئەم جۆرە گەیەنەرانە دا، لە راستی دا هەموو لایەنەکانی ئەزموون لە یەك جێگادا کۆ دەبێتەوە و کەس (شخص- تاك)، لە یەك کات دا، دەتوانێ هەست بە رووداوە دوورەکان بکا. مەك لۆهان بەم دیاردەیە دەڵێ "دەروون هەڵوەشاوی"[29]. بە بۆچوونی ئەو هەمووی ئەم گۆڕانکاری و تێکنۆلۆژییانە نە تەنیا رایەڵکەیەکی پێوەندیی جیهانی پێك دێنن، بەڵکوو بە هۆی پەرەپێدانی کولتووری گشتی لە کۆمەڵگەی جیهانی دا بەجیهانیبوونی کولتوور دروست دەبێ (Waters, 1995: 35).

## بەرەی سێهەم

تیۆرەکەی مەك لۆهان و بە تایبەت باسی نوێژەن کردنەوەی فەزا و رۆڵی گەیەنەرەکان لەم بوارەدا، سروش بەخشی هێندێك لە بیرمەندانی سەر بە بەرەی سێهەمی تیۆرداڕێژانی بەجیهانیبوونە کە ئێستا بۆچوونەکانیان تاوتوێ دەکەین. ئەگەرچی بیرکردنەوە لەبارەی پرۆسەی بەجیهانیبوونەوە بە دەیەکانی ئەم دواییانە نابەسترێتەوە و تا ئێستا کورتە مێژوویەکی ئەومان خستۆتە روو، بەڵام دەبێ بە پێچەوانەی تیۆریستەکانی پێشوو کە زۆرتر پێگەیەکی لاوەکیان بۆ بەجیهانیبوون لەبەرچاو دەگرت و بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ و بە چەمکی جۆراوجۆر باسیان لەم پرۆسەیە دەکرد، لە تیۆرییەکانی دوایی دا، بابەتی سەرەکیی باسەکە بۆ پرۆسەی بەجیهانیبوون و شوێنەار و دەرکەوتە جۆراوجۆرەکانی تەرخان کراوە.

ئەو تیۆرانە کە دوای هاتنە نێوەوەی وشەی بەجیهانیبوون بۆ بواری کۆمەڵناسی و زانستە سیاسییەکان و پەرەگرتنی بەرچاوی ئەو خراونەتە روو، لە ژێر باندۆری پڕ هەڵپە و بەربڵاوی بەجیهانیبوون لە دەیەکانی دواییدا، زۆرتر باس لە دەرکەوتنی قۆناخێکی نوێ لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا دەکەن. ئەم قۆناخە نوێیە هێندێك تایبەتمەندیی هەیە کە ناسینی ئەوان پێویستی بە بناخەداڕشتنی زانستی یان لانیکەم تیۆرگەلێکی نوێیە و بەرەی سێهەمی تیۆریستەکانی بەجیهانیبوون خۆیان بە وەئەستۆگرانی ئەو ئەرکە دزانن.

29- imploison





دیارە ژمارەی ئەم تیۆریستانە و جۆراوجۆریی روانگەکانیان کەم نیە. لە ساڵانی دوایی دا ئایین توێژان، کۆمەڵناسان، خەڵك ناسان، زانایانی سیاسی، توێژەرانی پێوەندییە نێونەتەوەییەکانی، ئابووریزانان و کولتوورتوێژان کەم تا زۆر باسیان لە بەجیهانیبوون و دەرکەوتەکانی کردوە. کەواتە وێژەیەکی پڕ بارستایی، بەربڵاو و جۆراوجۆر شکڵی گرتوە کە هەموو رۆژێ بە بارستایی و جۆراوجۆریی ئەوەوە زیاد دەبێ، بەڵام تاڕادەیەك بە درێژی باس لە سێ تیۆریست (دیوید هاروی، ئانتۆرنی گیدێنز و رولن رابیرتسۆن) دەکەین و لە درێژەش دا ئاماژەیەك بە بۆچوونەکانی چەند تیۆریستی دیکە دەکەین.

تەوەری باسی هاروی شیکردنەوەی هەلومەرج و تایبەتمەندییەکانی پۆست مۆدێرنیتە یا بان نوێبوونەوەیە. ئەو وەك زۆر لە بیرمەندانی بوارە جۆراوجۆرەکانی زانستە مرۆیی — کۆمەڵایەتییەکان بڕوای بە دەرکەوتنی قۆناخێکی نوێ لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا هەیە و هەوڵ دەدا هەڵکەوتووییەکانی ئەم قۆناخە نوێیە بە وردی بکێشێتەوە. کەواتە خەریکی شیکردنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی لە قۆناخی نەریتی و مۆدێڕن دا بوو تا لایەنە جیاوازەکانی ئەم دوو قۆناخە لەگەڵ یەکدی و قۆناخی نوێ دەربخات. ئەو جیاوازییەکی ئەوتۆ لە فەزا و زەمەن و پێگەی ئەوان لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا دەبینێتەوە و لە سەر ئەم بنەمایە خەریکی نوێژەن کردنەوەی مێژووی گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکانی جیهان دەبێ.

لە تیۆرەکەی هاروی دا دابڕانی قۆناخی مۆدێڕن لە قۆناخی نەریتی لە رێگای نوێژەن کردنەوەی چەمکی زەمەن و فەزاوە دێتە دی. بەستێنی ژیانی کۆمەڵایەتیی نوێ[نەریتی- و. ك]، فەزا سنووردار و دیاریکراوە خۆ جێیی و کاتە خولەکی و وەرزییە شوێنمەندەکان بوو. هەر چەشنە چالاکی و کردارێکی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی فەزا و زەمەنێکی ئاوا سنووردار و دیاریکراوەدا رێك دەخرا و کەواتە بەرینایی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان زۆر تەسك بوو. لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا هەر یەکەیەکی کۆمەڵایەتیی تارادەیەك بچووك، جیهانێکی سەربەخۆ و دابڕاو لە دەوروبەر یان "جیهان"ەکانی دەوروبەری بوو.

بەڵام لە قۆناخی رێنسانس دا ئەم چەمك و وێنا نەریتییە لە زەمەن و فەزا تێکچوو و چەمکی زەمەن درێژی و هێڵی و فەزای تاکانەی جیهانی جێگای گرتنەوە. بە دەربڕینێکی دیکە لە قۆناخی رێنسانسەوە. لە رێگای هێندێك لە گۆڕانکاری و داهێنانەکانەوە، زەمەن و فەزا گشتی بوون و پرۆسەیەك دەستی پێکرد کە ئێستاش درێژەی هەیە. هاروی ئەم پرۆسەیە

ناو دەنێ "پەستێوترانی زەمەن – فەزا"[30] کە لە رەوتی ئەودا زەمەن دەتوانێ بە شێوەیەك خۆی رێك بخات کە سنووردارێتییەکانی فەزا کەم بکاتەوە و بە پێچەوانە. لە راستی دا پەستێوتراویی زەمەن – فەزا بریتییە لە کەمبوونەوەی زەمەن و بچووك بوونەوەی فەزا (Waters, 1995: 55). بە دەست پێکردنی پرۆسەی پەستێوتراویی زەمەن – شوێن گەڕای پرۆسەی بەجیهانیبوونیش گۆڕا.

ئەم پرۆسەیە مێژوویەکی دوور و درێژ و پڕ هەوراز و نشێوی هەیە کە هارویش وەك مەك لۆهان هەوڵی ناسین و دووبارەنووسینەوەی ئەوی داوە. هەروەك پێشتر ئاماژەی پێ کرا، یەکەمین گۆڕانی بنەمایی لە قۆناخی رێنسانس دا رووی دا. هۆکاری ئەم گۆڕانە دوو داهێنانی گرنگ بوو: داهێنانی کاتژمێری میکانیکی و کێشانەوەی فەزا و گۆی زەوی لە سەر نەخشە. داهێنانی کاتژمێری میکانیکی چەمکی خولەکی و وەرزیی زەمەنی لە نێو برد و زەمەنی هێڵی یان ناخولەکی برەوی ئەستاند و بە دەربڕینێکی دیکە زەمەن گشتی و جیهانی بوو. کێشانەوەی فەزا لە سەر نەخشەش لە گۆڕانی وێنای "جیهان وەك شوێنێکی یەکگرتوو"دا زۆر کاریگەر بوو.

بەم چەشنە پرۆسەی پەستێوتراویی زەمەن و فەزا دەستی پێ کرد و تا دەهات زیاتر دەبوو. پەستوتراوتربوونی فەزا- زەمەن تا نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەیەم پلە بە پلە و ئارام بوو، بەڵام ئەو کات بە هۆی دوو گۆڕانکاریی دیکەوە هەڵپەی بەرچاوی پەیدا کرد. شکڵ گرتنی نوێبوونەوە- کە بزوتنەوەیەکی کولتووری بوو- چەمکە گشتی و مەیلە جیهانییەکانی بە هێز کرد و رێگای بۆ وێناکردنی کۆمەڵگەی جیهانی خۆش کرد. دەرکەوتنی قەیرانێکی ئابوورییش یارمەتیی بە لاوازبوونی سنوورەکان و کۆسپە فەزایی- کاتییەکان و تەنینەوەی زیاتر لە پێشووی سیستمێکی ئابووری (سەرمایەداری) لە پانتایی جیهانی دا بەدواوە بوو.

لە دەسپێکی سەدەی بیستەم دا پرۆسەی پەستێوتراویی فەزا- زەمەن دووبارە هەڵپەی زیاتری گرت. لەم قۆناخە دا ژمارەیەك لە داهێنانە گرنگەکان لە بیاڤەکانی گواستنەوە و پێوەندییەکان (وەك رادیۆ، چاپ و...) دیسان زەمەنیان کورتتر و فەزایان بچووك کردەوە. کەواتە ئامرازی زۆرتر کەوتە بەردەست سیتسمی سەرمایەداری تا چوارچێوەی چالاکیی خۆی بەرین بکاتەوە. ئەم بەرین خوازییە لە رەوتی دوو شەڕی جیهانیدا تا رادەیەك پێشی پێ گیرا، بەڵام دوای ئەو بەردەوام بوو. قەیرانی کەڵەکەکردنی سیستمی سەرمایەداری لە دەوروبەری ساڵی

30- time – space compreeion



١٩٧٠ش دا هۆکارێکی زۆر کاریگەری پرۆسەی پەستێوتراویی فەزا و زەمەن و لێك تەنراویی جیهان بوو.

دیارە لە روانگەی هارڤییەوە، پەستێوتراویی زەمەن- فەزا لە دوو دەیەی دوایی دا بە گوڕتر بووە. لەم خولە دا، پێشکەوتنە سەرسامکەرەکانی بواری تێکنۆلۆژیی پێوەندی، زەمەن و فەزای زۆر پەستاوتوە و ئامانجی "گوندی جیهانی"ی هێناوەتە دی (McGrew, 1996: 67). لە ژێر تەوژمی بەرهەم هاتوو لە گۆڕان و گۆڕانکارییە تێکنیکی و ئابوورییەکان دا، زەمەن و شوێن بە چەشنێك تێك چرژاون کە چۆنیەتیی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەست کران بە پەستێوتراویی بەگوڕی فەزایی و زەمەنی بۆتە پێویستییەکی خۆ لـێ‌نەدراوە. بە گوتەیەکی دیکە ئەزموونی مرۆڤ لە زەمەن و فەزا زۆر رەوانە و گۆڕان هەڵگرە و ئەمە واتە بەجیهانیبوون (Harvey, 1989: 240).

گیدێنزیش وەك هاروی، پرۆسەی بەجیهانیبوون بە بەرهەمی تێك چوونی تەکووزیی نەریتیی فەزا و زەمەن دەزانێ، بەڵام بە رادەی ئەو لە سەر سیستمی ئابووری تەکەزی ناکا. بە رای گیدێنز ناتوانین بە هیچ شێوەیەك بەجیهانیبوون بە دیاردەیەکی تەنیا ئابووری بزانین، هەرچەند کە شکڵ گرتنی ئابوورییەکی جیهانی بە گرنگترین توخمە تایبەتییەکانی ئەم دیاردەیە دەژمێردرێ. بەم پێیە بەجیهانیبوون دیاردەیەکی بانتر لە هاوپێوەندیی دوو لایەنەیە (Giddens, 1998: 30 -31). لە راستیدا گیدێنز لەو تیۆریستانەیە کە وەك پەرچەکردارێك لە بەرانبەر بۆچوونە دابەزینخواز و ئابووری تەوەرەکانی تیۆریستەکانی بەجیهانیبوون، بە تایبەت والرشتین، لە سەر لایەنە کولتووری و کۆمەڵایەتییەکانی بەجیهانیبوون پێدادەگرێ و ئەو بە بانتر لە شکڵ گرتنی سیستمی جیهانی دادەنێ (Kilminster, 1998: 95).

ئاڵۆزی و چەند لایەنەبوونی بەجیهانیبوون لە کۆنی، گوڕو توندی و گشتگیربوونی ئەودا شاراوەتەوە. لەم روانگەیەوە، گیدێنز دەڵێ کە بەجیهانیبوون بە قەت نوێبوونەوە کۆنە، هەرچەند کە لە ساڵانی داوایی دا بەگوڕتر بووە. ئەم پرۆسەیە هەم گرێدراوی سیستمە بەربڵاوە جیهانییەکان و هەم بەستێنە خۆجێیی و کەسێنییەکانی ئەزموونی کۆمەڵایەتییە. خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە بەجیهانیبوون نەك پرۆسەیەك، بەڵکوو پێکهاتەیەکی ئاڵۆزە لە پرۆسەکان. بە دەربڕینێکی دیکە، بەجیهانیبوون وەك ئاشکراترین و ئاڵۆزترین لایەنی پێشکەوتوترین قۆناخی نوێبوونەوە، واتە "کردار لە دوور و بەمەوداوە"[31] کە بە هۆی تێکچوونی تەکووزی و پێوەندیی

31- action at distance



نەریتیی فەزا- زەمەن یان وەك گیدێنز دەڵێ "جیهانی فەزا و زەمەن"[32] پێکهات (Giddens, 1994: 4 – 5).

کەواتە لە تیۆرەکەی گیدێنز دا، بەجیهانیبوون لایەنێك لە نوێبوونەوە یا تایبەتبەخشی پێشکەوتووترین قۆناخی پرۆسەی نوێبوونەوەیە. لەم رووەوە ناسینی بەجیهانیبوون، لایەنە جۆراوجۆرەکانی و هەروەها شوێنەوار و دەرکەوتەکانی پێویستی بە وشیاری لە پرۆسەی شکڵ گرتن، تەنینەوە و بەردەوامیی نوێبوونەوە هەیە. بە واتایەك، بۆ تێگەیشتنی دروست لە بەجیهانیبوون دەبێ لە شێوەی دابڕان لە کۆمەڵگەی نەریتی و تێپەڕین بۆ کۆمەڵگەی مۆدێرن تێ بگەین. گیدێنز بە سەرنجدان بە پێگەی فەزا و زەمەن و پرۆسەی گۆڕان بە ئامرازی وەدەستهێنانی ئەم تێگەیشتنە دەزانێ (Hoogvetl, 1997: 119).

یەکەمین هۆکاری زیانباری تەکووزیی نەریتی بریتییە لە جیایی زەمەن لە فەزا. لە روانگەی گیدێنزەوە هەمموو کولتوورەکان و کۆمەڵگەکان هێندێك شێوازیان بۆ ناسینی زەمەن و ناسینی دۆخ و پێگەی فەزایی خۆیان بووە. کۆمەڵگەیەك نیە کە لەودا تاکەکان خاوەنی وێنایەك و تێگەیشتنێك لە داهاتوو، ئێستا و رابردوو نەبن. هەروەها هەر کولتوورێك بە جۆرێك لە نیشانە فەزاییەکان تەیارە کە وریایی فەزایی لە شوێن بڕەخسێنێ. لەم رووەوە، تایبەتمەندیی کۆمەڵگەکانی بەر لە مۆدێرن ئەمە بوو کە لەو کۆمەڵگایانەدا، "زەمان و فەزا لە رێگای شوێنەوە [لێك] گرێ دەدران" (Giddens, 1991: 16).

ئەگەرچی کولتوورە بەر لە مۆدێرنەکان شێوازگەلێکیان بۆ پێوانی زەمەن و تەکووزی بەخشین بە فەزا- وەك رۆژژمێر و نەخشە سەرەتاییەکان- داهێنابوو کە پێویستی بەرایی جیابوونەوەی زەمەن و فەزا بوو، بەڵام لە لای بەشی زۆری حەشیمەتی ئەو کولتوورانە، زەمەن و فەزا لە رێگای شوێنەوە بە توندی لێك گرێدرابوون و زۆربەی چالاکییە رۆژانەکان لە چوارچێوەی زەمەن و فەزایەکی ئەوتۆدا بەڕێوە دەچوون. نیشانە کاتییەکانی هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی لەگەڵ نیشانە فەزاییەکانی ئەو هەڵسوکەوتە لێك گرێدرابوون (Giddens, 1991: 16) و وردە وردە بە هۆی گۆڕانکارییەکان و داهێنانە تێکنیکییەکانەوە زەمەن و فەزا لە یەکتری و لە شوێن جیابوونەوە.

لەم پێوەندییەدا، گیدێنزیش وەك هاروی تەکەزی لە سەر ئەو هۆکارانە دەکا کە تەوەری باسەکەی مەك لۆهان بوو. داهێنان و پەرەگرتنی کاتژمێری میکانیکی یەکەمین هێمای

32- distanciation of space and time



پرۆسەی جیایی فەزا و زەمەن بوو کە لە ئاکامی گۆڕانکارییەکی ئەوتۆدا، دنیایەك کە سیستمێکی کاتی و مێژوویی گشتیی هەبوو شکڵی گرت کە لە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە لە هەمموو دنیاکانی پێشوو جیاواز بوو. بە دەربڕینێکی دیکە ئاکامی ئەم گۆڕانکارییانە، "بە تاڵبوونی زەمەن" بوو. لەگەڵ بە تاڵبوونی زەمەن، فەزاش بە تاڵ بوو. ئامادەکرانی نەخشەی جیهان- کە لەودا هیچ خاڵێکی سەرتۆپ بوونی نەبوو- فەزای لە شوێن جیا و بەتاڵ کرد و بەم چەشنە تەکووزی و نزیکایەتیی نەریتی فەزا- زەمەن تێك چوو(Giddens, .1990: 79).

دیارە بەتاڵبوونی زەمەن و فەزا- کە بە شێوەیەکی دیالکتیکی رووی دا- بە واتای جیایی تەواوی ئەوان لە یەکتر نەبووە، چونکە ئەگەر وابایە دەرفەتی هەرچەشنە کردارێك و پێوەندییەکی کۆمەڵایەتی لە نێو دەچوو. جیایی فەزا و زەمەن لە شوێن، ئەم دەرفەتە دروست دەکا تاوەکوو ئەو دووانە لە ئاستێکی دیکەدا پێکەوە هاوئاهەنگ و ئاوێتە بن. ئەم دووبارە ئاوێتە بوونەوەیە، لە راستی دا پەرەپێدەر و زیادکەری پێوەند و کردە کۆمەڵایەتییەکان بوو، چونکە دەرفەتی بۆ هەر چەشنە چالاکییەکی کۆمەڵایەتی بە بێ گەڕانەوە و پێوەندیی ناچارییانە لەگەڵ شوێن رەخساند. بە گوتەیەکی دیکە لە ژێر کاریگەریی ئەم جۆرە گۆڕانکارییانەدا، دەرفەت بۆ هاوئاهەنگیی وردی کردارەکانی ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤەکان رەخسا، بەڵام ئەو هاوئاهەنگییەی نێوان "کەی" و "لە کوێ" بە بێ گرێدەریی شوێن رووی دا (Giddens, 1991: 17).

پرۆسەی بەتاڵبوونی زەمەن و شوێن- کە بواری بۆ وێناکردنی کاتی درێژ و فەزای جیهانی لواند- باندۆرێکی دیاریکەری لە سەر بزاوت و پەرەگرتنی نوێبوونەوە هەبوو و گیدێنز لە ژێر ناوی "بێ بەستێن بوونی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان"دا باسی لێوە دەکا. مەبەستی ئەو لە بێ بەستێن بوون بریتییە لە "دابڕانی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە بەستێنە خۆجێییەکان و دامەزراندنەوەی دووبارەی ئەوان لە پانتاییە بێ سنوورکانی زەمەن- فەزا" کە پرۆسەی جیایی فەزا و زەمەنی زۆر بە گوڕ کرد (Giddens, 1991: 18).

گیدێنز لە باسی بێ بەستێنی بوونی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان دا، دوو جۆرە میکانیزم دەست نیشان دەکا: "نیشانە رواڵەتییەکان" و "سیستمە پسپۆڕییەکان". "نیشانە رواڵەتییەکان" ئامرازەکان یا گرێدەرەکانی دانوستاندن کە بایەخی ستانداردیان هەیە و کەواتە دەتوانرێ ئەوان لە بیاڤێکی زۆر بەرین و کۆمەڵگە و بەستێنە جۆراوجۆرەکان دا بگۆڕنەوە. زەقترین و کۆنترین

نموونەی ئەم نیشانانە پارەیەکە زەمەن و فەزا لە پانتاییەکی لە بڕان نەهاتوو لێك نزیك دەکاتەوە و ئاوێتە دەکا، چونکە ئامرازی متمانەیە و بایەخی ستانداردی ئەو دەرفەتی گۆڕینەوە لە نێوان ژمارەیەکی زۆر لە تاکەکان دەرەخسێنێ کە قەت یەکتریان نەدیتوە.

میکانیسمەکەی دیکە یان "سیستمە پسپۆڕییەکان"یش بە هۆی بڕەودان بە زانستە تیکنیکییە جۆراوجۆرەکان کە خاوەنی متمانەیەکی سەربەخۆ لە بەکارهێنەران و بەهرەوەرگرەکانی ئەون، زەمەن و فەزا لێك دەبەستێ. ئەو جۆرە زانستانە هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دەخەنە ژێر کاریگەرییەوە و لە بەستێنێکی زۆر بەرین دا بەکار دەهێنرێن؛ وەك زانستی پزیشکی و تێکنیکی. "گیدێنز بەم دوو میکانیسمە دەڵێ سیستمە دەرهەستەکان کە بە هیچ شێوەیەك شوێنمەند نین (Giddens, 1991: 18).

بە کارهێنانی سیستمە دەرهەستەکان لە بنەڕەت دا پێویستی بە متمانەیە. ئەگەرچی جیایی زەمەن و فەزا و پرۆسەی بێ بەستێن بوونی کردار و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەرینایی ئەو کردار و پێوەندییانەی زۆر بەرینتر کردوە، بەڵام متمانە کردن بە سیستمە بێ شوێن و ناکەسێنییەکانیش خۆڵـێڵانەدراون. ئەم سیستمە جۆرێك هێمنایەتیی ڕێژەیی لە چالاکیی ڕۆژانەدا دروست دەکا، بەڵام ریسك و مەترسیشیان بەدواوەیە. کەواتە مرۆڤی مۆدێرن هەمیشە دەبێ بە سەرنجدان بە گۆڕانکارییە پڕ هەڵپەکانی ژینگەکەی خۆی هەڵوێستێکی لەبار بگرێ. گیدێنز بەم تایبەتمەندییەی کۆمەڵگەی مۆدێرن دەڵێ: ڕێفلێکسیویتیی دامەزراوەیی"[33] یا بەکارهێنانی بنواشەمەند(قاعدەمەند)ی زانستی پێوەندیدار بە ژینگەی کۆمەڵایەتی بۆ ڕێکخستن و گۆڕینی ئەو (Giddens, 1991: 20).

شیکردنەوەی هۆکارە کاریگەرەکانی شکڵ گرتن و بزووتنی دامەزراوەکانی نوێبوونەوە، خاڵی وەرێ کەوتنی گیدێنز بۆ وەسف و لێکدانەوەی پرۆسەی بەجیهانیبوونە. بە بۆچوونی ئەو بەجیهانیبوون دەرەنجامی بەرینخوازی و کۆخوازیی سیستمی کۆمەڵایەتیی مۆدێرنە کە ئەو لە سیستمە کۆمەڵایەتییەکانی پێشوو جیا دەکاتەوە. تەنینەوە و گشتگیربوونی نوێبوونەوەش دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارە کاریگەرەکانی؛ نوێژەن کردنەوەی زەمەن و فەزا، بێ بەستێن بوون و ڕێفلێکسیویتی، هەموویان مەیلی بەجیهانیبوونیان هەیە و یارمەتی بە پرۆسەی بەجیهانیبوون دەکەن.

33- instituional reflexivity



لەم ڕووەوە، گیدێنز بەجیهانیبوون بە جۆرێك گۆڕانی فەزا و زەمەن دەزانێ کە "کردار لە دوورەوە" دەرەخسێنێ. بە دەربڕینێکی دیکە بەجیهانیبوون ڕاشکاوترین هێمای لایەنە بنچینەییەکانی جیایی فەزا- زەمەن و شوێنی یەکتر بڕینی ئامادەیی و نائامادەییە. کەواتە دەتوانین بەجیهانیبوون بە دیاردەیەکی دیالێکتیکی بزانین کە لە چوارچێوەی ئەودا ڕووداوەکانی شوێنێکی زەوی، باندۆری تەنانەت دژوازیش لە سەر کۆمەڵگە دوورە دەستەکان دادەنێ. ئەم دیالیکتیکە هەمان دیالیکتیکی بابەتی خۆجێیی و بابەتی جیهانییە (Giddens, 1991:21 – 22).

بەجیهانیبوون نەك تەنیا پانتایی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە سەرانسەری گۆی زەوی و تەنانەت بانتر لەویش پەرەپێدەدا، بەڵکوو پانتایی باندۆر هەڵگریی کۆمەڵایەتییش هەر بەو ڕادەیە پەرە پێ دەدا. کەواتە ئێستاکە کەس ناتوانێ بڕیار بدا لە گۆڕانکارییە جیهانییەکان خۆی دوور بخاتەوە و بۆ وێنە سەبارەت بە مەترسییەکانی شەڕێکی ناوکی خەمسارد بێ و هەر ڕووداوێك یان گۆڕانکارییەکی خۆجێیی دەتوانێ ڕەنگدانەوە و شوێندانانی جیهانیی هەبێ. لەم ڕوانگەیەوە ڕادەی جیایی فەزا و زەمەن ئەوەندە زۆرە کە بۆ یەکەم جار لە مێژووی مرۆڤ دا، تاك و کۆمەڵگە لە بەستێن و دەوروبەری جیهانی دا پێکەوە دەبەسترێنەوە (Giddens, 1991: 32).

کەواتە دەتوانین تیۆرەکەی گیدێنز لەبارەی بەجیهانیبوونەوە بەم شێوەیە کورت بکەینەوە: بەجیهانیبوون بەرهەم و دەرەنجامی تێك چوونی تەکووزیی نەریتیی فەزا و زەمەنە کە بە هۆی جیایی بێ کۆتایی فەزا و زەمەن لە شوێن دەردەکەوێ. ئەم فەزا و زەمەنەی لە شوێن جیابۆتەوە، لە پانتاییەکی بێ کۆتایی دا پێکەوە تێکەڵ و هاوئاهەنگ دەبن و دەرەتان بۆ کردار و پێوەندیی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەیەکی زۆر گەورەدا دەرەخسێنن. کەواتە پانتایی باندۆردانان و باندۆر هەڵگرتنی کۆمەڵایەتیش زۆر بەرینتر دەبێ، کۆمەڵگەیەکی جیهانی شکڵ دەگرێ و بەجیهانیبوون بەستراوەتەوە بە هەموو جۆرەکانی پێوەندیی تاك لەگەڵ ئەم کۆمەڵگە جیهانییە.

ئەگەر گیدێنز وەك پەرچەکردارێك لە بەرانبەر تیۆرەکانی سیستمی جیهانی، پێ لە سەر ئاڵۆزیی پرۆسەی بەجیهانیبوون و ڕووکارە کۆمەڵایەتییەکان دادەگرێ، ڕۆبێرتسۆن بە خەریك بوون بە ڕووکارە کولتووری- کۆمەڵایەتییەکانی بەجیهانیبوون پەرچەکردارێکی ئەوتۆ نیشان دەدا. ئەو پرۆسەی بەجیهانیبوون زۆر ئاڵۆزتر لەوە دەزانێ کە تیۆرە ئابوورییەکان بتوانن

توانای وەسف و روونکردنەوەی ئەویان هەبێ. کەواتە لە تیۆرەکەی ئەودا سیستمی جیهانی پێگەیەکی تاڕادەیەك لاوەکیی هەیە و لەودا زیاتر قامك لە سەر توخمی وشیاری دانراوە (Friedman, 1994: 196).

لە سەر ئەم بنەمایە رۆبێرتسۆن واتایەکی دوو لایەنە لە بەجیهانیبوون دەخاتە بەرچاو کە هەم لایەنی بینراوی بەجیهانیبوون لە خۆدەگرێ و هەم لایەنی زەینیی ئەو. بە پێی واتای ئەو بەجیهانیبوون چەمکێکە بەستراوەتەوە بە پەستێوتراویی جیهان و زۆربوونی وشیاری سەبارەت بەو وەك گشتێك (Robertson, 1992: 8). واتاکردنەکەی رۆبێرتسۆن نیشاندەری ئەوەیە کە ئەویش وەك زۆربەی تیۆریستەکانی بەجیهانیبوون پەستێوتراوی، هاوجۆری، تێك تەنراوی و لێك بەستراوەیی دوو لایەنە لە ئاستی جیهانی دا بە توخمە تایبەتمەندی بەخشەکانی بەجیهانیبوون دادەنێ، بەڵام لە هەمان کات دا لەم قۆناخەش واوەتر چووە و پێ لە سەر توخمی وشیاری دادەگرێ. لە راستی دا بەرچاوبوون و لایەنی جیاکەرەوەی واتا و تیۆرەکەی ئەو لەم پێداگرتن و تەکەزی کردنە دایە.

لە لایەنی بینراوەوە، رۆبێرتسۆنیش وەك تیۆریستەکانی دیکە، مێژوویەکی چەند سەد ساڵە و تەنانەت زیاتریش بۆ بەجیهانیبوون لە بەرچاو دەگرێ. بەڕای ئەو سەدان ساڵە کە تەگەرە و مەوداکانی نێوان بەشە جۆراوجۆرەکانی "گوندی جیهانی" وردە وردە کەم دەبنەوە و جیهان پەستێوتراوتر دەبێ. بەستراوەیی دوو لایەنەی روو لە زیادبوونی نێوان سیستەمە سیاسییەکانی جیهان بە هۆی بازرگانی، هاوپەیمانیی سوپایی و هێژمونیی سیاسی- کولتووری لە گرینگترین هۆکارە بەستێن ساز و ساناکەرەوەکانی ئەم پەستێوتراوەییەن کە هەروا درێژەی هەیە. لە راستیدا ئەم بەشە لە تیۆرەکەی رۆبێرتسۆن وەك تیۆرەکانی بەستراوەیی و سیستەمی جیهانی وایە.

میکانیسمی پەستێوتراویی بینراو (هەست پێکراو)ی جیهان لە پلەی یەکەم دا دەگەڕێتەوە بۆ تێکنۆلۆژیی پێوەندی کە راگوازتنی مرۆڤ، وێنە و هەر شێوەیەکی دیکە لە زانیاری دەلوێنێ. ئەم تێکنیك و ئامرازانە هەرچەند کارلێهاتووتر و پێشکەوتووتر بن، پەستێوتراویی جیهان تاوێکی (هەڵپەیەکی) زۆرتر هەڵ دەگرێ. دیارە پەستێوتراویی جیهان تەنیا دەرەنجامی گۆڕانکارییە زانستییەکان یا شۆڕشە تێکنیکی یەکان لە بواری پێوەندی و راگەیەنەکان دا نیە و نێوەڕۆکی سیستەمی سەرمایەداری و لۆژیکی کەڵەکەکردنیش لەم بوارەدا رۆڵێکی گرنگی بووە، چونکە سەرمایەداری لە ناخی دا پەرەخوازە و خولیای جیانگیربوونی لەسەردایە (Friedman, 1994: 196).



بەڵام تایبەتمەندیی سەرەکیی و تاقانەی بەجیهانیبوون توخمی وشیارییە. بە رای رۆبێرتسۆن تەنیا بەستراوەیی بەرانبەر و لێك تەنراویی جیهانی بۆ هاتنە دی بەجیهانیبوون بەس نیە، بەڵکوو مرۆڤەکانیش دەبێ لە سەر بابەتی جیهانی و پاشکۆیەتیی جیهانی یەکگرتوو وشیارییان هەبێ. دیارە ئەم رووکارەی بەجیهانیبوونیش تەمەنێکی زۆری هەیە و وێناکردنی جیهان وەك کۆمەڵگەیەکی یەکگرتوو دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی پازدەیەمی زایینی. ئەم کۆمەڵگە یەکگرتووە ئەو مرۆڤانەی لە خۆگرتبوو کە تێگەیشتنێکی وەك یەکیان لە مافەکان و شوناس هەبوو؛ ئایدیالێك کە ئێستاش نەهاتۆتە دی (Holton, 1998: 33 – 34).

لە دەیەکانی دواییدا ئەم وشیارییە زۆر زیادی کردوە و نیشانە ناسییە تاکەکەسییەکان زێدەتر لە پێشوو پێوەندییان بە تەواوی جیهانەوە هەیە تا وەکوو بەشە خۆجێیی یان نەتەوەییەکان. کەواتە ئێستا ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە مرۆڤەکانی سەرزەوی زۆربەی بابەت و پرۆسەکانیان لە سەر بنەمای جیهانی واتا دەکەنەوە. دووبارە واتاکردنەوەی پرسەکانی سیستەمی سیاسی بە پێوانەی "تەکووزی جیهانی"، پرۆسە ئابوورییەکان بە پێوانەی "دابەزینی نێونەتەوەیی"، پرسەکانی بازاڕ بە پێوانەی بەرهەمە "جیهانی"یەکان یا پرسەکانی پیس بوون و پاڵاوتن بە پێوانەی "رزگارکردنی گۆی زەوی"نموونە زەقەکانی ئەم جۆرە وشیارییەن (Waters, 1995: 42).

تایبەتمەندییەکی دیکەی تیۆرەکەی رۆبێرتسۆن ئەمەیە کە پرۆسەی بەجیهانیبوون بە پێڕەوی لۆژیکێکی سەربەخۆ و رەها دەزانێ. بە پێچەوانەی تیۆریستەکانی دیکە کە بەجیهانیبوون بە پێڕەوی لۆژیکی کەڵەکەبوونی سەرمایە یان لۆژیکی بزۆکیی نوێبوونەوە و یا لۆژیکی گۆڕانی هێزە هێژمونیکەکان دەزانن، رۆبێرتسۆن پێ لە سەر سەربەخۆ بوونی پرۆسەی بەجیهانیبوون دادەگرێ. بە بۆچوونی ئەو ئەم پرۆسەیە لە سەر بنەمای دژوازی و رووبەڕووبوونەوە بەرەو پێش دەڕوات و بەم هۆیە باس لە لێك بەستراویی دوو لایەنەی روو لە زیادبوون دەکا، نەك لە هاوچەشن و یەکپارچەبوونی جیهان.

رۆبێرتسۆن لە سەر بنەمای ئەم تیۆرییە، پرۆسەی بەجیهانیبوون بە پێنج قوناخ دابەش دەکا: "قۆناخی سەرەتایی" کە بە گورانی تۆوی پرۆسەی بەجیهانیبوون لە کۆمەڵگە ئەورووپییەکان لە ساڵی ١٤٠٠ ەوە دەستی پێ کردوە و ساڵی ١٧٥٠ کۆتایی پێ هاتوە؛ قۆناخی دووهەم یا "قۆناخی دەستپێك" کە دیسان تایبەت بە ئەورووپایە و ساڵەکانی نێوان ١٧٥٠ و ١٨٧٥ دەگرێتەوە؛ سێهەمین قۆناخی پرۆسەی بەجیهانیبوون ناوی "قۆناخی رابوون"ە

و پەنجا ساڵ درێژەی کێشا (١٨٧٥ – ١٩٢٥). قۆناخی چوارەم ( ١٩٢٥ – ١٩٦٥) "قۆناخی خەبات بۆ وەدەست هێنانی هێژمونی"یە و قۆناخی پێنجەمیش کە "قۆناخی نالێبڕاوی"ی ناوە لە ١٩٦٩ەوە دەستی پێکردوە (Robertson, 1992:  58 – 60).

جگە لەم سێ تیۆریستە، ژمارەیەکی دیکەش لە تیۆریستەکان کەم تا زۆر باسیان لە پرۆسەی بەجیهانیبوون کردوە. لەش و ئووری پرۆسەی بەجیهانبوونیان لەگەڵ گۆڕانی سیستمی سەرمایەداری لێك گرێ دەدەن. بە رای ئەوان لە سەرمایەداریی رێکخراوی سەدەی بیستەم دا، کۆمپانییە گەورەکان و دەوڵەتەکان خودانە سەرەکییەکانی رێکخستنی رەوتی پارە، کاڵا، ئامرازی بەرهەمهێنان و سەرمایە بوون. بەڵام بە تەنینەوە و زۆربوونی خێرایی ئەو رەوتانە، قۆناخێکی نوێ لە سەرمایەداریی هەوسارپچڕاو شکڵ دەگرێ کە تایبەتمەندییەکانی بریتییە لە دەوڵەت، رەوان بوون و رمانی سنوورە دەروونییەکانی جیهانە.

لەم هەلومەرجە نوێیە دا هەمموو شتێك، تەنانەت کەسەکانیش لە رێگای کۆچ و گەشتیارییەوە، رەوان و بزۆکن و لەو کاتەدا کە رەوانتر دەبن، بە شێوەیەکی روو لە زیادبوون لە ماددەبوون دەسڕێنەوە، شێوەی هێما (نیشانە) بە خۆیانە دەگرن. کەواتە جیهان بە شێوەی رایەڵکەگەلێکی رەوان لە هێماکانی ناسین و هێما جوانیناسانەکان دەردێ. هێماکانی ناسین گرێدراوی زانیارین و هێما *جوانیناسانەکانی* گرێدراوی بە کارهێنانیش جۆرێك هاوجۆری "رێفلکسیۆیتی" دەخولقێنێ کە بریتییە لە گومان، دوودڵی و پێداچوونەوەی بەردەوام لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا لە بەر رۆشنایی دۆزراوە نوێیەکان دا (Lash & Vrry, 1994: .280)

دۆخێکی ئەوتۆ رێ خۆشکەر و هەڵپەدەری پرۆسەی بەجیهانیبوونە. بە گوتەیەکی دیکە تا ئەو جێگایەی کە ئەم جۆرە رەوتانە و وەرینی هێماکان، کۆمەڵگە نەتەوەییەکان و هەر سنوور و چوارچێوەیەکی دەروون جیهانی دزە هەڵگر(نفوذ پـــذیر) بکەن، پرۆسەی بەجیهانیبوونیش بەهێز دەبێ. هێماکانی ئەم پرۆسەیە بریتییە لە بەرینبوونەوەی کردار و پێوەندییە بان نەتەوەییەکان، پەرەگرتنی بنکە ناوچەیی یان شارە جیهانییەکان، دابەزینی شوێندانەریی ئامرازە دەوڵەتییەکان، زۆربوونی رادەی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان، پەرەگرتنی بۆرۆکراسییە جیهانییەکان، رووخانی هێژمونیی دەوڵەت و هی لەم بابەتە (Lash & Urry, 1994: 281)

ئولۆیخ بەك-[34]یش سەبارەت بە پرۆسەی بەجیهانیبوون رای دەربڕیوە. لە روانگەی ئەوەوە ئێستا کۆمەڵە خەسارێکی لاوەکیی سەرچاوەگرتوو لە سنعەتیبوون، زێدە بەرهەم،

34- U. Beck





بەکارهێنانخوازی و چوونە سەری[لە ئاستی] خۆش بژیی ماددی مەترسیگەلێك لە کۆمەڵگەدا دروست دەکەن کە کۆنترۆڵ، کەمکردنەوە و یان سنووردارکردنیان بۆتە گرفتی سەرەکیی کۆمەڵگەی جیهانی (Lyon, 1999: 49). لایەنی جیاکەرەوەی مەترسییەکانی ئێستا ئەوەیە کە بەپێچەوانەی مەترسییەکانی کۆمەڵگە نەریتییەکان، بەرهەمی کارکردی مرۆڤەکان و تاکەکانیش بە شێوەیەکی ئاسایی سەبارەت بەوان وشیارییان هەیە. بە دەربڕینێکی دیکە لە جیهانی هاوچەرخ دا مرۆڤەکان سەبارەت بەو مەترسییانەی لە پرۆسەی بەرهەمهێنان و بەکارهێنانەوە سەرچاوە دەگرن، وەك پرسەکانی ژینگە زیاتر لە پێشوو وشیارییان هەیە (Toal, 1999: 23).

ریسکی جێگای مەترسی جێگای مەبەست لە دوو لایەنەوە باندۆرێکی گشتی و جیهانیکەری هەیە: یەکەم ئەوە کە مەترسییەکان و نائارامییەکان سەرچاوەگرتوو لە نوێکردنەوە، دەرکەوتەی بەراوردنەکراو و پێش بینی نەکراویان هەیە و هەر بەم هۆیە لە چوارچێوەی هیچ سنوورێك دا قەتیس ناکرێن (Beck, 1992a: 101) و ئەم ریسکە بەرهەم هاتووە رەنگە لە خاڵێك دا دەکرێ دەرکەوتەگەلی جیهانیی هەبێ. خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە وشیاربوون سەبارەت بە ریسك یان بەك گوتەنی تایبەتمەندیی رێفلکسیوی ریسك، وشیاریی پێوەندیدار بە پرۆسەی بەجیهانیبوون بەهێز دەکا، چونکە وشیاری لە ترس و مەترسییە جیهانییەکانەوە سەرچاوە دەگرێ نەك لە [ترس و مەترسییە] نەتەوەیی یان ناوچەییەکانەوە. کەواتە لەوە ڕا کە ریسك لە نێوەڕۆك دا هێزێکی جیهانیکەرە، دەرکەوتنی کۆمەڵگەی ریسکیش تەوژم دەداتە بەجیهانیبوون.

ماڵکۆم واتێرز تیۆریستێکی دیکەیە کە بە سوود وەرگرتن لە تیۆرەکانی پێشوو و ئاوێتەکردنی ئەوان، خەریکی واتاکردن و چەمکبەندیی پرۆسەی بەجیهانیبوون دەبێ. ئەو بۆ خستنەڕووی وێنەیەکی پەسند و شیاو لە پرۆسەی بەجیهانیبوون، سەرەتا دنیای بە تەواوی بەجیهانیبوون بەم جۆرە واتا دەکا: "پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی کە لەودا سنووردارێتییە جوغرافیاییەکانی بواری دامەزراوەکان و ریزبەندییە کۆمەڵایەتی و کلتورییەکان کەم دەبنەوە و خەڵك سەبارەت بەم کەمبوونەوەیە تادێ وشیاریی زیاتر وەدەست دێنن" (Waters, .1995: 3) کەواتە واتێرزیش وەك رۆبێرتسۆن، هەم لایەنی بینراو و ماددیی بەجیهانیبوون و هەم لایەنی زەینی ئەو یان تۆخمی وشیاری لەبەرچاوە.

دیارە توخمی وشیاری لە تیۆرەکەی واتێرز دا گرینگیی پلە دووی هەیە و بەجیهانیبوون لە پلەی یەکەم دا بریتییە لە کەمبوونەوەی سنووردارێتییە جوگرافیایی، ریزبەندییەکان و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان. بەم پێیە تەوەری تیۆرەکەی ئەو پێوەندیی ریزبەندییەکان و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ فەزایە. لە دنیایەکی جیهانیبوودا، رووبەری سنوودار بەڵام بێ سنووری زەوی دەبێتە گۆڕەپانی ئەو جۆرە دامەزراوە و پێوەندییانە(Waters, 1995: 163 – 4) بەڵام بەجیهانیبوونی پێوەندی و دامەزراوەکان هاوچەشن نیە و لە بیاڤێکەوە بۆ بیاڤێکی دیکە جیاوازیی هەیە. واتێرز چەند لاپەڕە لە کتێبەکەی خۆی بۆ شیکردنەوە و روونکردنەوەی ئەم ناهاوچەشنییە تەرخان کردوە.

واتێرز بڕوای وایە کە لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دا سێ جۆرە دانوستاندن هەیە: ١- دانوستاندنی ماددی کە بازرگانی، کرێ، کاری کرێ و کەڵەکەبوونی سەرمایە لە خۆ دەگرێ ٢- دانوستاندنی سیاسی، پشتیوانی، هێمنایەتی، زۆر، هێژمونی، ناچاری، مانەوە، رەوایی و پێڕەوی دەگرێتەوە ٣- دانوستاندنی رواڵەتی کە پێوەندییە زارەکییەکان، بڵاوکردنەوە، فێرکردن، پەرستن، کات بەسەربردن، خۆپیشاندان و... دەگرێتەوە. بێ ئەوەی بگوترێ دیارە کە هەر کام لەم دانوستاندنانە بە ریز و لە بیاڤە ئابووری، سیاسی و کولتوورییەکان دا لایەنێکی بەرچاویان هەیە (Waters, 1995: 8).

ئەم دانوستاندنانە پێوەندییەکی تایبەتیان لەگەڵ فەزا دا هەیە. دانوستاندنە ماددییەکان زۆرتر شوێنمەندن و دەیانهەوێ پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بە شوێنێکی دیاریکراوەوە گرێ بدەن. بازرگانیی بان نەتەوەییش لە ئەستۆی ئەو گرێدەرانەیە کە لە دەرەوەی پێوەندییە سەرەکییە ئابوورییەکان دا هەڵکەوتوون، بەڵام ئەم شوێنە سەرزەوییەکی بەرین (وڵاتەکان)ە و ئامانج لەو پێوەندییانە کۆنترۆڵ کردنی حەشیمەتی سەرزەوییەکی دیاریکراو (نەتەوەیی) و پاراستنی یەکپارچەیی یان بەرین کردنەوەی ئەوە.

بە پێچەوانەی ئەو دوو جۆرە تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتییەی ناویان هێنرا، دانوستاندنە هێماییەکان زیاتر پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە سەرچاوە و ژێدەرە فەزاییەکان دەرباز دەکەن، چونکە "دەتوانرێ هێماکان لە هەر جێگایەک و هەر کاتێك دا بەرهەم بهێنرێ و دووبارە بەرهەمهێنانەوەی ئەوان، لە لایەنی سەرچاوەوە، سنووردارێتییەکی تارادەیەك کەمی هەیە. زێدەتر لەمانە، هێماکان بە سانایی شایانی راگوێزرانن. گرنگتر ئەوەیە کە چونکە ئەوان زۆرتر هەوڵ دەدەن دەستەوداوێنی تایبەتمەندییە بنەمایی و چیەتییەکانی مرۆڤ بن، زۆر جار دەتوانن



بڵێن متمانە و گرنگیی گشتی و جیهانییان هەیە (Waters, 1995: 9). کەواتە دانوستاندنە ماددییەکان بەرەو خۆجێی بوون، دانوستاندنە سیاسییەکان بەرەو نێونەتەوەیی بوون، دانوستاندنە هێماییەکان بەرەو بەجیهانیبوون مەیلیان هەیە.

لە کۆتایی دا واتێرز لە سەر بنەمای پێوەندیی نێوان فەزا و جۆرەکانی دانوستاندنی کۆمەڵایەتی بەم ئاکامە دەگا کە:

بەجیهانیبوونی کۆمەڵگەی مرۆیی لە پێوەندیی بە کاریگەربوونی ریزبەندییە کولتوورییەکان بە بەراورد لەگەڵ ریزبەندییەکان و دامەزراوە سیاسی و ئابوورییەکانەوە هەیە، دەتوانین چاوەڕوانیمان هەبێ ئابووری و سیاسەت بەو رادەیەی کە کولتووری دەبن، بەجیهانی بن؛ واتە هەر بەو رادەیە کە دانوستاندنە ئەنجام دراوەکان لەو بیاڤانەدا بە شێوەی هێمایی کامڵ بن. هەروەها دەتوانین چاوەڕوانیمان هەبێ کە رادەی بەجیهانیبوون لە بیاڤی کولتووریدا، دوو بیاڤەکەی دیکە زیاتر بێ (Watres, 1995: 9 – 10).

سکلێریش وەك واتێرز لە پێوەندی لەگەڵ بەجیهانیبوون دا لە سێ بیاڤی ئابووری، سیاسی و کولتووری دا دەدوێ. بە بۆچوونی ئەو تایبەتمەندی و گرنگیی زیاتری تیۆرەکانی بەجیهانیبوون لە ئاستی شیکاریدا شاراوەتەوە. لەلایەنی شێوازناسییەوە، گریمانەی سەرەکیی ئەو باسە ئەمەیە کە ناتوانرێ زۆر لە پرسە هاوچەرخەکانی جیهان لە ئاستی دەوڵەت دا، یا بە واتایەك، بە پێی پێوەندییە نێونەتەوەییەکان بە باشی هەڵ سەنگێندرێ. ناسین و روونکردنەوەی ورد و شیاوی ئەو پرسانە پێویستی بە تیۆرداڕێژی بە پێی پرۆسەی بەجیهانیبوون (باننەتەوەیی) و تێپەڕین لە ئاستی نەریتیی دەوڵەت- نەتەوە هەیە. بە دەربڕینێکی روونتر، دەبێ ئابووریی کۆمەڵگەی جیهانی بە شێوەی جیهانی و نەتەوەیی هەڵسەنگێنین و شی بکەینەوە. (Sklari, 1998: 296).

ئەو بڕوای وایە کە تیۆریستەکانی وەك گیدێنز، هاروی و والرشتین لە چوارچێوەی روانگەی سیستمی جیهانی، کولتووری جیهانی، فەزا- زەمەن و کۆمەڵگەی جیهانی ئەم کارە گرنگەیان ئەنجام داوە، بەڵام هەر کام لەو روانگانە کەموکوڕی و لاوازی گەلێکیان هەیە کە وەسف و روونکردنەوەی ورد و هەمە لایەنەی بەجیهانیبوون زۆر دژوار دەکەن. کەواتە دەبێ بە سەرنجدان بەو وێژەیەی ئێستا سەبارەت بەجیهانیبوون هەیە بۆ دروست کردنی تیۆرێکی وردتر و شیاوتر هەوڵ بدرێ و سکلێر تیۆرەکەی خۆی بە بەرهەمی هەوڵێکی ئەوتۆ دەزانێ (Sklair, 1998: 308).

"تیۆری سیستمی جیهانی"[35] چوارچێوەیەکی نوێ مارکسیستیی هەیە و هەروەك لە ناوەکەی را دەردەکەوێ، کاریگەریی تیۆری "سیستمی جیهانی"ی والرشتینی پێوە دیارە، بەڵام بە پێچەوانەی تیۆرە مارکسیستیە کلاسیکەکان و تیۆری والرشتین کە رۆڵ و شوێنێکی لاوەکی و "رووکارانە" بە سیاسەت و کولتوور دەدا، لەم تیۆرەدا سەرنجێکی زیاتر دراوە بە بیاڤی سیاسەت و کولتوور، هەرچەند [ئەو گرنگی پێدانە] زیاتر لە بیاڤی ئابووری نیە.

تیۆری سیستمی جیهانی لە سەر چەمکی کردارە بان نەتەوەییەکان راوەستاوە: ئەو کردارانە کە هەرچەندە نێونەتەوەیین، بەڵام وەك پێویستییەك لە لایەن کارکەر یان بکەرە دەوڵەتییەکانەوە ئەنجام نادرێن. لە لایەنی شیکاری و تیۆرییەوە ئەم کردارانە لە سێ بیاڤی ئابووری، سیاسی و کولتووری دا هەڵ دەکەون، هەرچەندە کە لە دنیای راستەقینەدا یەکتر داپۆشین یان بەریەککەوتن لە نێوان ئەوان لە هەیە و دەس نیشان کردنی وردی سنوورەکانی سێ بیاڤەکە هێندە ساکار نیە. لە تێکەڵاو کردنی ئەو سێ بیاڤە، سیستمێکی زۆر بەربڵاو و ئاڵۆز پێك دێ کە لەم تیۆرەدا پێی دەگوترێ "سیستمی جیهانی" (Sklair, 1996: .296)

سکلێر لە ژێرەوە یان بە راشکاوی هەوڵ دەدا، لایەنی جیاوازی تیۆرەکەی لەگەڵ تیۆرە نوێ مارکسیستییەکانی پێشوو و بە تایبەت تیۆرەکەی والرشتین نیشان بدا. کەواتە لە زۆر جێگای باسەکەدا پێ لە سەر ئەم خاڵە دادەگرێ کە نابێ "سیستمی جیهانی" لەگەڵ سیستمی جیهانیی سەرمایەداری بە هاوتا دانرێ، چونکە بانتر لەوە. تیۆری سیستمی جیهانی لە لایەنی مێژوویییەوە، دەگەرێتەوە بۆ ساڵەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم و لە کۆتایی سەدەی بیستەم دا ئەگەرچی هێشتاش هێزە باڵادەستەکانی سەرمایەداریی جیهانی لە کار دان، بەڵام سیستمی جیهانی هەمان سیستمی سەرمایەداری نیە.

هەر کام لەم سێ بیاڤە پێکهێنەرەی "سیستمی جیهانی" هەڵگری توخمێکی سازێنەر و تایبەتمەندکەرە. توخمی سازێنەری بیاڤی ئابووری کۆمپانیا بان نەتەوەییەکانن کە بە گرنگترین شکڵی هێمایی کردارە ئابوورییە بان نەتەوەییەکان دەژمێردرێن. ئەم پێگەیە لە بیاڤی سیاسیدا، بۆ چینی سەرمایەداری بان نەتەوەیی تەرخان کراوە کە هێشتا نەگەیشتۆتە قۆناخی کامڵ بوونی خۆی و ناوك و بنەمای بیاڤی کولتووریش کولتووری ئایدیۆلۆژیی بەکارهێنانخوازی (بەرخۆری) پێکی دێنێ. ئەم سێ توخمە لە خزمەتی بەردەوامبوون و گەشەی سیستمی جیهانیی سەرمایەداری دان (Sklair, 1998: 297).

35- global system theory



لە بیاڤی ئابووریدا، سیستمی سەرمایەداریی جیهانی پانتایی و شوێنێکی بەرتەسك و سنووردار بۆ زۆرینەی کرێ گرتە و زۆربەی وڵاتەکان تەرخان کردوە. کرێکاران کە بەرهەمهێنەرانی راستەوخۆی کاڵا و خزمەتگوزارییەکانن، تەنیا لە چوارچێوەی گرووپێکی سنووردادا کە پێکهاتەی چینایەتیی ئێستای سەرمایەدارییە نەتەوەییەکان رێگای پێ دەدەن، ئازادی و دەرەتانی هەڵبژاردنی کار و پیشەیان هەیە. لە بیاڤی سیاسییش دا ئاوێتەکردنی چینە لێك نزیکەکان زۆر کەمە. بە دەربڕینێکی روونتر، سیستمی سەرمایەداریی جیهانی لە پێشکەوتووترین قۆناخی خۆی دا پێویستییەکی زۆر کەمی بە چینە پاشکۆکانی بیاڤی سیاسی هەیە. لە دیمۆکراسییە پارلمانییەکان دا زۆرتر حیزبەکان خەڵك بۆ دەنگ دان هان دەدەن و ئامادە دەکەن و لە سیستمە سەرمایەدارییە نادیمۆکراتیکەکان دا، تەنانەت ئەم دۆخە لانیکەمەش بوونی نیە (Sklair, 1998: 297).

بە پێچەوانەی بیاڤی ئابووری و سیاسی کە زۆربەی چینە پاشکۆکان لەوان دا گرینگیەکیان نیە، لە بیاڤی کولتوور و ئایدیۆلۆژی دا، مەبەستی سەرمایەداریی جیهانی بریتییە لە ئاوێتەکردنی تەواوی هەموو چینەکان و بە تایبەت چینە پاشکۆکان. سەرماریەداریی جیهانی لەم بیاڤەدا هەوڵ دەدا بە بەرێوەبردنی پرۆژەیەکی کولتووری- ئایدیۆلۆژیك خەڵك هان بدا تاوەکوو زیاتر لە پێویستییەکانی ژیانیان بەکار بهێنن. بە بەرێوەچوونی پرۆژەیەکی ئەوتۆ، خاوەنانی بەرژوەندییە کەسێنییەکان دەتوانن درێژە بە کەڵەکە کردنی سەرمایە بدەن و سیستمی سەرمایەداری درێژە بە ژیانی خۆی بدا (Sklair, .1998: 297)

کەواتە لە روانگەی سکلێرەوە بەجیهانیبوون بریتییە لە زێدەبوون و پەرەگرتنی پێوەندی و کردارە بان نەتەوەییەکان لە پانتایی جیهانی دا. ئەم پرۆسەیە لە رێگای شکڵ گرتنی رایەڵکە ئابووری، سیاسی و کولتوورییە جیهان داگرکانەوە- کە بریتییە لە کۆمپانیا بان نەتەوەییەکان، چینێکی سەرمایەداری بان نەتەوەیی و کولتوور- ئایدیۆلۆژییەکی بەکارهێنانخوازانەیە- بەردەوام دەبێ و بە تاوتر دەبێ. بە دەربڕینێکی دیکە لە تیۆری سکلێردا بەجیهانیبوون بەستراوەتەوە بە شکڵ گرتنی کۆمەڵگەیەکی جیهانیی ئاوێتەخواز کە لە سەر لۆژیکی کەڵەکەکردن و ئامرازە سیاسی- کولتوورییە کارلێهاتووەکانی سەرمایەداری راوەستاوە.

## کۆبەندی

تا ئێستا را و هزری سێ بەرە لە تیۆریستەکانمان لەبارەی پرۆسەی بەجیهانیبوونەوە بە کورتی خستەروو- هەر کام لە بیرمەندانی سەر بەم سێ بەرەیە بە شێوەگەلێکی جۆراوجۆر



سەبارەت بەم پرۆسەیە باسیان کردوە. کۆمەڵناسانی کلاسیك لە چوارچێوەی تیۆرگەلی گرێدراوی میکانیسمەکان و گۆڕانکارییە کۆییە کۆمەڵایەتییەکان دا خەریکی بابەتی بەجیهانیبوون بوون. تیۆریستەکانی بەرەی دووهەمیش لە هەوڵیان دا بۆ تێگەیشتن لە کۆمەڵگەیەك کە خەریکە شکڵ دەگرێ یان سیستمی جیهانی، بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ قسەیان لە بەجیهانیبوون کردوە. بە بەراورد لەگەڵ ئەوان دا، تیۆریستەکانی دوایی کە لە دەیەکانی رابردوودا لە نزیکەوە پرۆسەی بەجیهانیبوونیان ئەزموون کردوە، تیۆری هەمە لایەنەتر و وردتریان سەبارەت بەم بابەتە داڕشتوە. کەواتە بە بیرخستنەوەی تەوەرەکانی ئەو تیۆرانە، کۆتایی بە هەڵسەنگاندنی تیۆرەکانی بەجیهانیبوون دێنین.

١) بەجیهانیبوون کە مێژوویەکی درێژی هەیە و لانیکەم هاوکات لەگەڵ پرۆسەی نوێکردنەوە دەستی پێکردوە، پرۆسەیەکی ئاڵۆز و چەند لایەنەیە. ئەم پرۆسەیە هەم بەجیهانیبوونی ئابووری، هەم لێك گرێدراویی بەرانبەر لە نێوان یەکە نەتەوەییەکان دا و هەم شکڵ گرتنی وشیاری سەربارەت بە گرێدراوی بە جیهانێکی یەکگرتوو لە خۆدەگرێ. هەموو پێوەندییە تاکەکەسی/ کۆمەڵایەتییەکانی سەرزەویش بەجیهانیبوون دەیان گرێتەوە و لەم رووەوە ئەم پرۆسەیە دەبێتە هۆی یەکیەتی کۆمەڵگەی مرۆیی. بە واتایەکی دیکە پانتایی دەوروبەری کۆمەڵایەتیی تاك جیهانی دەبێ.

٢) شکڵ گرتنی گوندی جیهانی و بچووك بوونەوەی جیهانیش بابەتی باسی ئەم تیۆریستانەیە. دیارە ئەم بابەتە لە جۆرێك دیاردەناسی و وێکهاتوویی(انقباضی) نزیکە. ئەگەرچی خاوەنڕایە جۆراوجۆرەکان قسەیان لە بچووکبوونەوەی زەوی و لە نێوچوونی فەزا کردوە، بەڵام ئەمە حەقیقەتێکی دیاردەناسانەیە نەك راستیەیەك. واتە وادێتە بەرچاو کە جیهان بچووك بۆتەوە، لە کاتێك دا کە لە لایەنی رادە و بارستاییەوە بچووك نابێتەوە. لەوەڕا کە دەمانهەوێ فەزا بە زەمەن بپێوین، بەو رادەیەی مەودای دوو خاڵی جوغرافیایی کورتتر دەبێتەوە. فەزاش بچووکتر و سنووورداتر دەێتە بەرچاو. ئەگەر پێکەوەبەستنەوەی دوو خاڵ- کە لە لایەنی ماددی و فیزیکییەوە دوورن- لە چریەك دا ئەنجام بدرێ، فەزا ون دەبێ. کەواتە بەجیهانیبوون لە نێوبردنی دیاردەناسانەی فەزا و گشتی بوونی زەمەن دەستەبەر دەکا.

٣) دیاردەناسیی بەجیهانیبوون جۆرێك دیاردەناسیی رەنگدەرەوانە و وشیارانەیە. لە هەمان کات دا کە لێك گرێدراویی بەرانبەر پەستێوتراویی جیهانی رۆژ بە رۆژ زیاد دەکا، دانیشتووانی جیهانیش سەبارەت بەم پەستێوتراوییە وشیاریی زێدەتر وەدەست دێنن و بە شێوەیەکی





وشیارانە خۆیان لەگەڵ جیهان، وەك گشتێك، رێك دەخەن. بۆ وێنە کۆمپانییەکان بە شوێن بازارە جیهانییەکانەوەن و حکوومەتەکانیش بۆ پاراستنی تەکووزیی جیهانی هەوڵ دەدەن.

٤) بەجیهانیبوون لە خۆگری تێکەوڵاێکە لە ریسك و متمانە. مرۆڤەکان لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا بە بابەتی *بێ گرێدەر (واسطة)*، ناسراو، ئامادە و ماددی متمانەیان دەکرد و لەگەڵی لە پێوەندی دابوون، چونکە بەرەوژوورتر چوون لە وەها بیاڤێك وەمەترسی کەوتنی بەدواوە بوو، بەڵام تاکەکان لە رەوتی پرۆسەی بەجیهانیبوون دا، خواستراو یان نەخواستراو، متمانە بە کەسانی نەناسراو، هێزەناکەسێنییەکان، رێساکان (بازاڕ، مافی مرۆڤ) و نموونەیەکی دانوستانی هێماییانە دەکەن کە وادێتە بەرچاو بانتر لە کۆنترۆڵی هەر تاکێك یان گرووپێکی دیاریکراو دایە.

## هێماکانی بەجیهانیبوون

تیۆرەکانی بەجیهانیبوون زۆرتر لە هەوڵی واتاکردن، چەمکبەندی، وەسف و روونکردنەوەی ئەم پرۆسەیە لە چوارچێوەی چەمکە دەرهەست و گریمانە گشتییەکان دان. کەواتە بۆ دەست خستنی وێنەیەکی روونتر و بینراوتر لە پرۆسەی بەجیهانیبوون دەبێ هەوڵ بدرێ هێما و نیشانەکانی بناسرێ. لەم بەشە لە باسەکە دا دەمانهەوێ هێماکانی بەجیهانیبوون لە بوارە سەرەکییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی (ئابووری، سیاسەت و کولتوور) دا دەس نیشان بکەین و لەبارەیانەوە بدوێین. بۆ ئەم مەبەستە، سەرەتا باس لە بەجیهانیبوونی ئابووری، دواتر بەجیهانیبوونی سیاسی و سەرەنجام بەجیهانیبوونی کولتووری دەکەین.

## بەجیهانیبوونی ئابووری

ئەگەرچی واتایەکی ورد و گشتگیر لە بەجیهانیبوونی ئابووری- کە لە کۆمەڵگەی زانستی دا بە شێوەیەکی رێژەیی پەسند کرابێ- بوونی نیە بەڵام بەو پێیە کە واتای جۆراوجۆر سەبارەت بە پرۆسەی بەجیهانیبوون هەیە، واتای جۆراوجۆر لە بەجیهانیبوونی ئابووری خراونەتە بەرچاو. ئەم جۆراوجۆرییە لە پلەی یەکەم دا لە پێداگرتن و چڕبوونەوە لە سەر لایەنە مێژووییەکانی بەجیهانیبوونی ئابووری، لۆژیك و میکانیسمی ئەم دیاردەیە، لایەنە جۆراوجۆرەکانی و تەنانەت شوێنەوار و دەرکەوتەکانی ئەوەوە سەرچاوە دەگرێ. ئۆگرییەکان و بڕواکانی تیۆریستەکانیش کاریگەریی لە سەر جۆراوجۆریی واتا و چەمکبەندییەکانی بەجیهانیبوونی ئابووری هەیە. .

لەگەڵ ئەمەش دا، زۆربەی ئەو واتایانەی خراونەتە بەرچاو لە سەر چەند تەوەری سەرەکی راوەستاون. هەر بۆیە سەرەڕای ئەم جۆراوجۆرییە دەتوانین لایەنە هاوبەشەکان دەس نیشان

بکەین و لەم بەشەدا تایبەتمەندییەکانی بەجیهانیبوون بە لە بەرچاوگرتنی لایەن و تەوەرە هاوبەشەکان دەخەینە بەرباس. کەواتە دوای باسێکی کورت سەبارەت بە پێشینە، بەستێن و دنەدەرەکان و قۆناخە مێژوویییەکانی بەجیهانیبوونی ئابووری، لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەم پرۆسەیە لە بوارەکانی بازرگانی،ماڵی، هێزی کار و دامەزراوە نێونەتەوەییەکان دا تاوتوێ دەکەین تاوەکو روون ببێتەوە کە چالاکییە ئابوورییەکان چۆن بەجیهانی دەبن.

لە زۆربەی تیۆر و واتاکانی بەجیهانیبوون دا، قامك لە سەر توخمی ئابووریی ئەم پرۆسەیە دانراوە و ژمارەیەکی زۆر لە تیۆریستەکانی ئابووری بە رووکاری باڵادەستی بەجیهانیبوون دادەنێن. لە روانگەی ئەوانەوە ئەگەرچی پرۆسەی بەجیهانیبوون زۆر گشتگیرە و شوێن لە سەر هەموو بیاڤەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دادەنێ، بەڵام راشکاوترین و زەقترین نیشانە و هێماکانی ئەم پرۆسەیە تایبەتن بە بیاڤی ئابووری. بەرینترین بواری چالاکیی کۆمەڵایەتی، بواری ئابوورییە کە ئێستاکە سەرانسەری گۆی زەویی داگرتوە و سنووداریێتییەکی خۆجێیی، نەتەوەیی و ناوچەیی ئەوتۆی نیە، کەواتە دەتوانین باس لە کۆتایی سەردەمی ئابووریی نەتەوەیی بکەین (Baker, 1998: 1).

لە لایەنی مێژوویيشەوە باڵادەستی و لە پێش بوون لە دەست بەجیهانیبوونی ئابووری دایە. لەگەڵ ئەوەی کە دەتوانین رابردووی تاڕادەی چەندین دەیەیی و چەند سەدەیی بۆ ئەو گۆڕانکارییانە دەس نیشان بکەن کە کاریگەرییان لە شکڵ گرتنی کۆمەڵگەیەك و سیستمێکی جیهانی یان کولتووری جیهانیدا هەبووە. بەڵام ئەم رابردووی پرۆسەی بەجیهانیبوونی ئابووری زۆرترە. دیارە لە سەر ئەم رابردوویە و یەکەمین قۆناخەکانی شکڵ گرتنی ئابوورییەکی جیهانی کۆدەنگییەکی ئەوتۆ نیە، بەڵام ژمارەیەك لە مێژوونووسانی گۆڕانکارییە ئابوورییەکانی جیهانی بڕوایان وایە کە رابردووی ئابوورییەکی ئەوتۆ بۆ چەند سەدە لەوە پێش و تەنانەت بۆ سەدەی شازدەهەم دەگەڕێتەوە (Sassen, 1993: 61).

ئاوێتەبوون و بەرەویەکشانی ئابووری لە پانتایی جیهانیدا هێدی هێدی زۆر بوو و لە سەدەی نۆزدەیەم دا کە سەرمایەداری وەك شێوەی باڵادەستی سیستمی کۆمەڵایەتی- ئابووری دەرکەوت، تاوی گرت و وێڕای پەرەگرتنی سەرمایەداری، پرۆسەی بەجیهانیبوونی ئابووریش بە تاو و خێراییەکی روو لە زیادبوون بەردەوام بوو. پێشکەوتنە بەرچاوەکان لە بیاڤەکانی تێکنۆلۆژی و ئامرازەکانی پێوەندییش دا هەم ئاوێتە کردنی ژمارەیەکی زۆر لە ئابوورییە



نەتەوەیی و خۆجێییەکانی لە ئابووری جیهانی دا سانا کرد و [هەم] بارستاییەکی یەکجار زۆر لە چالاکییە ئابوورییە روو لە زیادبوونەکانی بە رایەڵکەی ئابووری جیهانییەوە بەستەوە.

دیارە پرۆسەی بەجیهانیبوونی ئابووری راژان و هەوراز و نشێوی هەبووە. هەروەك پێشتر ئاماژەی پێ کرا، دەیەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم وساڵەکانی دەسپێکی سەدەی بیستەم، سەردەمی گەشەکردنی یەکێك لە لایەنە سەرەکییەکانی بەجیهانیبوونی ئابووری بوو. لەم سەردەمەدا بارستایی بازرگانیی نێونەتەوەیی بە شێوەیەکی بێ وێنە زیادی کرد و سەرمایەداریی لاو هەنگاوگەلێکی درێژی لە پێناو گۆڕینی جیهان بە بازاڕێکی یەکگرتوو بۆ فرۆشتنی بەرهەمەکانی هەڵێنایەوە. بەڵام هێشتا چەند ساڵ لە تەمەنی ئەم سیستمە لە سەدەی بیستەم دا تێنەپەڕیبوو کە تووشی قەیران بوو و قووڵبوونەوەی ئەم قەیرانە دوو شەڕی جیهانیی لێ کەوتەوە.

کەواتە لە ساڵی ١٩١٤ تا ١٩٤٥، لە ژێر کاریگەریی شەڕ و نەتەوەخوازیی ئابووری دا کە تا کۆتایی دەیەی هەشتا لە وڵاتەکانی وەك چین، هیند، رووسیە، ئارژانتین، برزیل و مکزیك درێژەی هەبوو، هەڵدانی ئاوێتە بوونی ئابوورییە نەتەوەییەکان رەوتێکی ژێرەروو (نزولی)ی بەخۆوەگرت. دوای کۆتایی شەڕیش ئەگەرچی رادەی بازرگانیی نێونەتەوەیی زۆرتر لە بەرهەمهێنانی جیهانی بوو، بەڵام رادەی بازرگانی بە بەراورد لەگەڵ بەرهەمهێنانی پوختەنەکراوی نێوخۆیی لە زۆربەی وڵاتەکان دا تا نێوەڕاستی دەیەی حەفتا نزمتر لەو رادەیە بە بەراورد لەگەڵ ساڵی ١٩١٣دا بوو. تەنانەت هێندێك دەڵێن کە ئابووری دەیەی حەفتا کەمتر لە ئابووریی دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەم شایانی پاشگری "نێونەتەوەیی"یە (Hirst, 1996: 2).

بەڵام لە کۆتایی دەیەی حەفتادا شەپۆلێکی نوێی بەجیهانیبوونی ئابووری شکڵی گرت کە لە پلەی یەکەم دا لە ژێر کاریگەریی گۆڕانکاری و پێشکەوتنە سەرسامکەرەکانی بواری پێوەندییەکان دا بوو. ئەم پێشکەوتنانە تێچووەکانی پێوەندی و راگوازتنی تارادەیەکی زۆر کەم کردەوە و بووتە بەستێنی ئاوێتەکردنی جیهانیی ئابوورییەکان. لە ساڵی ١٩٤٥ەوە تا ئێستا تێچووی هەڵگرتنی کاڵا لە رێگا دەریاوە بە شێوەیەکی نێونجی لە سەدا پەنجا، تێچووەکانی گوازتنەوەی ئاسمانی لە سەدا هەشتا و تێچووی پێوەندییە تەلەفوونییە نێونەتەوەییەکان ٩٩ لە سەد کەم بوونەتەوە و هەر بەم هۆیە رایەڵکەی پێوەندیی زۆر کارلێهاتوو و کەم تێچوو لە پانتایی جیهانیدا دروست بوون (Webster, 1994: 144.)

پێشکەوتنە سەیرەکان لە کامپیوتێری بوونی کاروباری گەیاندن و گواستنەوە دا وەك سیستمە دیجیتالییەکان و تێکنۆلۆژیی مانگیلەییش لە بەرەوپێش بردنی پرۆسەی

بەجیهانیبوونی ئابووری لە ساڵەکانی دواییدا رۆڵێکی گرنگی هەبووە. لە ئاکامی ئەم گۆڕانکارییانەدا، ئێستا زۆر لە کاڵا و خزمەتگوزارییەکان کە تا ئێستا "شیاوی بازرگانی"نەبوون، کەوتوونەتە خولگەی بازرگانیی جیهانییەوە. سیستمەکانی پێوەندیی جیهانی، ئەو توانایەی بە کۆمپانیاکان داوە تا بەرنامەکانی بەرهەمهێنان و کارو باری ماڵیی خۆیان بە شێوەیەکی هاوکات لە چەندین وڵات دا رێك بخەن و لە راستی دا چالاکیی ئابووریی جیهانی ئەنجام بدەن.

زانیارییش لە رێگای رایەڵکەکانی پێوەندییەوە، شیاوی بازرگانی و دانوستاندنە: زانیارییەکانی وەك راوێژکاریی بەڕێوەبەری، سیستمە نەرم ئامێرییەکان، فیلم، کاسێت، دیسکی پەستێوتراو و هەواڵی تەلەفزیۆنی و هی لەم جۆرە. لەم چوارچێوەیەدا، بزۆکی و رەوانیی سەرمایەش بەرادەیەکی یەکجار زۆر و لە شکڵی پارەدا زۆر بووە. بە واتایەك، پارە، بۆتە بەرهەمێك کە جەوهەرەکەی ئەو زانیارییەیە کە لەو دایە چ وەك هەڵگری بەها یان وەك گرێدەری دانوستاندن(گۆڕینەوە) (O’Brien, 1992: 7). بەرهەحاڵ لە ژێر کاریگەریی ئەم جۆرە گۆڕانکاری و پێشکەوتنانەی بواری پێوەندییەکان- کە هاوکات بوو لەگەڵ گرتنەبەری سیاسەتە لیبڕاڵەکان لە هێندێك لە وڵاتان دا- پرۆسەی ئاوێتەبوونی ئابووریی جیهانی لە دەیەی ١٩٧٠ و لە دەیەی ١٩٨٠دا تاوێکی زۆرتری هەڵ گرت و رۆژ لەگەڵ رۆژیش بەگوڕتر بوو.کەواتە مەیدان بۆ سیاسەتە پارەیی و ماڵییە نەتەوەییەکان بەرتەسك بوو و بزاوتی پارە و کاڵا و هێزی کار لە رایەڵکە جیهانییەکان دا زۆر بوو. لەو هەڵسەنگاندنە دا، لە باسی بەجیهانیبوونی ئابووری دا زیاتر گرنگی بەم ماوەیە دراوە کە بە پێشکەوتووترین قۆناخی بەجیهانیبوونی ئابووری دەژمێردرێ.

وەك باوە بەجیهانیبوون وەك بەجیهانیبوونی بەرهەمهێنان، دابەش کردن و متمانە یا بوونی جیهان بە بازاڕێك بۆ بازرگانی، بەرهەمهێنان، فرۆشتن و سەرمایەدانان واتا دەکەن. ئێستا بازاڕێکی ئەوتۆ دروست بووە: ژمارەیەکی زۆر لە بەڕێوەبەران و دامەزراوە ئابوورییەکان خەریکی چالاکی و کاری بان نەتەوەیین، دزە هەڵگریی(ناسك بوونەوە) سنووری سیاسییە لە بەرانبەر رەوتە ئابوورییەکان دا زۆر زیاد بووە، لێك تەنراوی و لێك گرێدراویی بەرانبەر لە پانتایی جیهانی دا گەیشتۆتە ئاستێك کە دەرەتانێکی ئەوتۆ بۆ گرتنەبەری سیاسەتی گۆشەگیری و خۆبژیی ئابووری نیە و بڕیاردان بۆ پەراوێزبوون لە رایەڵکە ئابوورییە جیهانداگرەکان دا زۆر دژوار و پڕ تێچوو و تەنانەت نەلواویشە. ئەم چەشنە بەجیهانیبوونە بە پێشکەوتووترین و راشکاوانەترین شێوە لە



بواری تیجارەت دا دەرکەوتووە و ئێستا وڵاتە سنعەتییەکان لە هەر پێنج دۆلارێك کە بەرهەمی دێنن دۆلارێکی هەنارده دەکەن (Bhaduri, 1998: 149).

دانینگ بەجیهانیبوونی بازرگانی- وەك بیاڤە ئابوورییەکانی دیکە- بە پێڕەوی لۆژیکێکی ئابووریی دیاریکراو دەزانێ و بگۆڕەکانی دیکە بۆ وێنە بگۆڕی سیاسی بە پلە دوو و لاوەکی لە قەڵەم داوە. بە بۆچوونی ئەو چالاکیی بازرگانی لە هەوڵێدا بۆ دیتنەوەی بازاڕی بەربڵاوتر، سەرچاوەی دەوڵەمەندتر، کارلێهاتوویی زیاتر و پێگەی ستراتیژیك و لەبارتر هەردەم بەرینخواز بووە (Dunnig, 1993: 109). کەواتە پەرەگرتنی بازرگانی لە پانتایی جیهانی دا رابردوویەکی چەندین سەد ساڵەی هەیە، بەڵام لە دەیەکانی دواییدا بە هۆی پێشکەوتنە سەرسووڕهێنەرەکان لە بواری پێوەندییەکان و لە رێگای ئەویشەوە کەمبوونەوەی توندی تێچووەکانی راگوازتن، زۆر گشتگیر بووە و تاوی هەڵ گرتووە.

ئامارەکان دەری دەخەن کە لە درێژایی زیاتر لە ١٨٠ ساڵ (١٨٢٠- ١٩٩٢)دا بەردەوام رێژەیەکی زیاتر لە بەرهەمی پوختەنەکراوی نێوخۆیی هەنارده کراوە. بە پێی خشتەی ژمارە یەك، رێژەیی هەنارده لە چاو بەرهەمی پوختە نەکراوی نێوخۆیی لە تەواوی جیهان دا نزیکەی سێزدە هێندە زیادی کردوە. دیارە ئەم رێژەیە لە پێوەندی لەگەڵ وڵاتان و ناوچە جۆراوجۆرکان دا بەرز و نزمیی زۆر بەرچاوی هەبووە؛ لە حاڵێك دا رادەی هەناردەی وڵاتانی ئەورووپای رۆژئاوا و وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لەگەڵ ئەوەی بەزری و نزمیی زۆر کەمی بووە زیادی کردوە، وڵاتانی وەك میسر و غینا کەمبوونەوەی بەرچاوی رادەی هەناردەی بە خۆیانەوە بینیوە.

**خشتەی ژمارە ١. هەناردەی کالاّ ڕێژەیەك لە بەرهەمی پوختەنەکراوی نێوخۆیی**

| | ١٨٢٠ | ١٨٧٠ | ١٩١٣ | ١٩٢٩ | ١٩٥٠ | ١٩٧٣ | ١٩٩٢ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەموو جیهان | ١ | ٥ | ٨/٧ | ٩ | ٧ | ١١/٢ | ١٣/٥ |
| ئەورووپای ڕۆژئاوایی | – | ١٠ | ١٦/٣ | ١٣/٣ | ٩/٤ | ٢٠/٩ | ٢٩/٧ |
| ئەورووپای ڕۆژهەڵات | – | ٢/١ | ٣/٥ | ٤/٩ | ٣/٦ | ٧/١ | ٠/٥ |
| وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا | ٢ | ٢/٥ | ٣/٧ | ٣/٦ | ٣ | ٥ | ٨/٢ |
| ئاسیا | – | ١/٣ | ٢/٦ | ٢/٨ | ٢/٣ | ٤/٤ | ٧/٢ |
| ئەمریکای لاتین | – | ٩ | ٩/٥ | ٩/٧ | ٦/٢ | ٤/٦ | ٦/٢ |
| میسر | – | ١٤ | ٣٢ | – | ٣٩ | ١٠ | ٣ |
| غینا | – | ٢/٦ | ٢٥/٢٠ | – | ٢٥/٥ | ١٦/٥ | ٦ |
| ئەفریقای باشوور | – | – | ٤٩/٢ | – | ٢٢/٧ | ٢٠/٤ | ١٨/٧ |

**سەرچاوە** ١٩٩٥ A. Maddison, Monitoring the world Economy, 1820 –
1992,OECD 1995

دیارە ئەگەر هەناردەی کالاّ سنعەتییەکان لە سێ دەیەی ڕابردوودا لە بەرچاوبگرین، بەجیهانیبوونی بازرگانی هێمایەکی ڕاشکاوانەتری بەخۆوە دەگرێ. لەم ڕووەوە ئامارەکان دەری دەخەن کە لە ساڵی ١٩٧٠وە تا ساڵی ١٩٩٤ ڕادەی هەناردەی کالاّی سنعەتی بە بەراورد بە کۆی هەناردە لە جیهان دا لە ٦٠/٩ لە سەدەوە گەیشتۆتە ٧٤/٧ لە سەد، بەڵام پشکی وڵاتان و ناوچە جۆراوجۆرەکانی جیهان لەم زێدەبوونە یەکسان نیە. لە ساڵی ١٩٩٤دا، ٧٩/٢ لە سەد لە کۆی هەناردەی وڵاتانی سنعەتی لە کالاّ سنعەتییەکان پێك دەهات، لە حاڵێك دا لە کۆی هەناردەی وڵاتانی ئەفریقایی لە هەمان ساڵ دا، تەنیا ١٧/٨ سەد بۆ کالاّ سنعەتییەکان تەرخان کرابوو (خشتەی ژمارە ٢).



**خشتەی ژمارە٢. ڕادەی هەناردەی کالاّ سنعەتییەکان بە بەراورد لەگەڵ کۆی هەناردەکان**

| | ١٩٧٠ | ١٩٨٠ | ١٩٩٠ | ١٩٩٤ |
|---|---|---|---|---|
| جیهان | ٦٠/٩ | ٦٤/٢ | ٧١/١ | ٧٤/٤ |
| وڵاتانی سنعەتی | ٧٢ | ٧٠/٢ | ٧٨ | ٧٩/٢ |
| ئەورووپای ڕۆژهەڵات | ٥٩/١ | ٥٠/٢ | ٤٣ | ٥٣ |
| وڵاتانی ڕووەو گەشە | ١٨/٥ | ١٧/٧ | ٥٤/٣ | ٦٦/١ |
| ئاسیا | ٢٢/٤ | ٢٣/٥ | ٦٥/٥ | ٧٣/٤ |
| ئەمریکای لاتین | ١٠/٦ | ١٤/٧ | ٣٠/٨ | ٤٨/٨ |
| ئەفریقا | ٧ | ٤ | ١٥/١ | ١٧/٨ |

**سەرچاوە:** U.N. Hand book of International Trade and
Development Statics 1995. Tables A.1 and A.13

زێدەتر لەمانە، لە ساڵانی دوایی دا بە هۆی پێکهاتنی شۆڕش لە تێکنۆلۆژییەکانی زانیاری و پێوەندییەکان دا، هەنگاوێکی گەورەی دیکە لە پێناوی پەرەپێدان و بەهێزکردنی ڕایەڵکەی جیهانی بازرگانی دانراوە، ئەمڕۆکە بازرگانیی ئیلکترونیك وادەکا تاکەکان بتوانن بە بێ کێشانی ڕەنجی سەفەرە بازرگانییەکان، کالاّی مەبەستیان لە هەر جێگایەك بێ هەڵبژێرن و بی کڕن. لە ڕاستی دا تێپەڕین لە تێکنۆلۆژیی سەخت ئامێریەوە بۆ ئەرم ئامێری، خاڵی وەرچەرخانە لە شکڵ گرتنی بازاڕگەلی بونیادنراو لە سەر سیستەم و ڕایەڵکەکانی زانیاریی کامپیۆتێری و، هەر بەم پێیەش بازاڕێکی جیهانی. دامەزرانی ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانی نیشانەی پڕ هەڵپەبوون و گشتگیربوونی شکڵ گرتنی بازاڕێکی ئەوتۆیە.

بازرگانیی ڕاوەستاو لە سەر تێکنۆلۆژیی زانیاری و پێوەندی، ڕووکارێکی دیکەی بازرگانیی جیهانی و لە ڕێگای ئەویشەوە بەجیهانیبوونی ئابووریی دەردەخا کە ئەویش بازرگانیی جیهانیی خزمەتگوزارییەکانە. ئێستاکە خزمەتگوزارییەکان زۆر زیاتر و ساناتر لە کالاّ ماددییەکان، بان نەتەوەیی و بەجیهانی دەبن. داهات و تێچووی سەفەر و ڕاگوازتنی هەوایی و دەریایی، بیمە نێونەتەوەییەکان و بانکداریی جیهانی ڕوو لە زیادبوونە و تەنانەت ئەو بیاڤ و

خزمەتگوزارییانەش کە تا ئێستا نابازرگانی بوون لەم رایەڵکەیە دا ئاوێتە دەبن؛ بیاڤەکانی وەك ئەندازیاری، حقووقی، ژمێریاری، پەرستاری و هی وەك ئەوان.

لەم روانگەیەوە دەتوانین بڵێین کە بواری خزمەتگوزارییەکانی گوازتنەوە و گەیاندن و چەند راگەیەنەییش لەبەر دەم پێشبڕکێی جیهانی دا کراونەتەوە. بەهەڵکەوت نیە لە قۆناخە کۆتاییەکانی کۆتایی خولی ئوراگۆئەدا، جەك والێنتی[36] نوێنەری هالیوود یەکێك لە کاریگەرترین لۆبیستە ئەمریکاییەکان بوو. ئێستاکە هالیوود و هەواڵەکانی رایەڵکەی کێبڵی لە بیاڤی بازرگانی دا، گرنگتر لە جنرال موتۆرز یان پۆلای ولاتەیەکگرتووە[37]کانە یان سنعەتی موسیقیی ئینگلستان زیاتر لە سنعەتی هەوا- فەزای ئەم ولاتە "هەناردە"ی هەیە. لە راستی دا وادێتە بەرچاو ئێستاکە پێشکەوتووترین بەشەکانی بازرگانیی جیهانی ئەو بەشانەیە کە زۆرتر خەریکی دانوستاندنی (ئاڵوگۆڕکردنی) کالا هێمایی و نامادییەکانن (Goble, .1995)

کەواتە بە گشتی لەبارەی بەجیهانیبوونی ئابووری لە بواری بازرگانیی جیهانییەوە دەتوانین بڵێین کە ئابووریی جیهانی لە درێژایی نزیکەی دوو سەد ساڵی رابردوودا رەوتێکی بەرەوژووری بووە. بەپێچەوانەی وتەی ئەو کەسانەی بڕوایان وایە بازرگانیی جیهانی بە بەراورد لەگەڵ ساڵەکانی بەر لە یەکەمین شەڕی جیهانی زۆر کەم بووە، بە کەڵك وەرگرتن لە ئامار دەتوانین دەری خەین کە بازرگانیی جیهانی وەك بەشێك لە بەرهەمی پوختەنەکراوی نێوخۆیی جیهان بەردەوام زیادی کردوە و لە ساڵانی دواییش دا بە هۆی باش بوونی بێوێنەی ئامرازەکانی پێوەندی و راگوازتن، ئەم زیادبوونە پڕ هەڵپەتر بووە.

دیارە ئەوەی ئێستا لە رایەڵکەکانی ئابووریی جیهانی دا لە بزووتن دایە، لە کالا ماددییەکان و خزمەتگوزارییە جۆراوجۆرەکان دا کورت نابێتەوە، زۆر جار بەرێوەبەرانی ئابووری نەك بەرهەمەکانیان، بەڵکوو سەرمایەکانیان بۆ ولاتانی دیکە رادەگوێزن و سەرمایەدانانی جۆراوجۆر دەکەن. ئابووریزانان بەم کارە دەڵێن سەرمایەدانانی راستەوخۆی دەرەکی و ئەو بە یەکێك لەلایەنە گرنگەکانی بەجیهانیبوونی ئابووری دەژمێرن. سەرمایەدانانی راستەوخۆی دەرەکیی سەرچاوەگرتوو لە چییەتی و لۆژیکی سیستەمی سەرمایەداری، رابردوویەکی چەندین دە ساڵەی هەیە، بەڵام وەك بازرگانیی جیهانی لەم ساڵانەی دوایی دا زۆر زیادی کردوە.

36- Jack Valenti
37- United States Steel



لە ساڵی ١٩٧٥ەوە تا ١٩٩٥ رادەی سەرمایەدانانی راستەوخۆی دەرەکی بە بەراورد لەگەڵ بەرهەمهێنانی جیهانی زیاتر لە دوو هێندە بەرەوژوو چووە و لە ٤/٥ لە سەدەوە گەیشتۆتە ١٠/١ لە سەد. لە سەرەتاکانی دەیەی هەشتاوە تا ئێستا سەرمایەدانانی راستەوخۆ چوار هێندە زیاتر لە بازرگانیی جیهانی هەڵی داوە. هەروەها رادەی سەرمایەدانانی دەرەکی لە ولاتانی روو لە گەشە زیادی کردوە، هەرچەندە سەرمایەدانەران زۆرتر روویان لە بەرهەمهێنانی سنعەتی و خزمەتگوزارییەکان کردوە تاوەکوو سنعەتی دەرهێنان(استخراج) (Baker, 1998: 21).

ئەگەرچی سەرمایەدانانی راستەوخۆی دەرەکی لە ئاستی جیهان دا زیادی کردوە، بەڵام ولاتانی جیهان لە رووی بەشداری و سەرمایەدانان و بەهرەمەندبوون لەو پێگەی جیاواز و نایەکسانیان هەیە. وێڕای زیادبوونی سەرمایەدانانی راستەوخۆی دەرەکی لە ولاتانی روو لە گەشەی خاوەنی هێزی کاری هەرزان، ئێستاش بەشی بەرچاوی ئەم جۆرە سەرمایەدانانە لە ولاتانی پێشکەوتووی سنعەتیدا ئەنجام دەدرێن. بۆ وێنە لە ساڵی ١٩٨٩دا لە ١٩٦میلیارد دۆلار سەرمایەدانانی راستەوخۆی دەرەکی نزیکەی ١٦٣ میلیارد دۆلار تەنیا لە ولاتانی پەرەئەستاندوودا وەگەڕ خرابوو (Sassen, 1993: 61 – 62). تەنانەت ئەو رادە کەمە سەرمایەدانانە راستەوخۆ دەرەکییەش لە بۆ ولاتانی روو لە پەرەگرتن تەرخان کراوە بە شێوەیەکی بە تەواوی نایەکسانانە دابەش کراوە و زیاتر لە سەدا حەفتای ئەو جۆرە سەرمایەدانانە لە ولاتانی روو لە گەشە دا بەرێوە دەچێ (Baker, 1998: 22).

بەرهەحاڵ سەرەڕای بوونی نایەکسانی و ناهاوچەشنی لە بواری سەرمایەدانانی راستەوخۆی دەرەکیدا، زیادبوونی ئەو جۆرە سەرمایەدانانە راستییەکی حاشاهەڵنەگرە. دامەزراوە جۆراوجۆرە ئابوورییەکان بەردەوام بە دوای بازاڕی لەبار بۆ سەرمایەدانانەوەن و رۆژ بە رۆژ رادەی سەرمایەدانانی راستەوخۆیی دەرەکی لە زیادبوون دایە. لە لایەکی دیکەوە دەوڵەتەکانیش هەوڵ دەدەن بەستێنی لەبار بۆ سەرمایەدانانی دەرەکی خۆش بکەن.

بێجگە لە بازرگانیی جیهانی و سەرمایەدانانی راستەوخۆی دەرەکی، دیاردەیەکی دیکە کە بە توخمێکی سەرەکیی بەجیهانیبوونی ئابووری دەژمێردرێ، رەوت و گەڕانی جیهانیی سەرمایەیە. ئێستاکە شێوەگەلێکی جۆراوجۆری سەرمایە لە کورتترین ماوەدا لە نێوان بەرێوەبەرە جۆراوجۆرە ئابوورییەکان کە لە مەودای زۆر دوور لە یەکەی خەریکی چالاکیین دەگۆردرێتەوە و رادەی ئەم جۆرە دانوستاندنانە لە ساڵانی دوایی دا بە شێوەیەکی سەرسامکەر زیادی کردوە. دانوستاندنە پارەییە رۆژانەکان گەیشتۆتە نزیکەی یەك تریلیۆن

دۆلار و گواستنه‌وه و راگوازتنی رۆژانه‌ی به‌رگه‌ی قه‌رز و به‌رگه‌ی خاوه‌ن بایی (اوراق قرضة و اوراق بهادار) و داراییه متمانه‌داره‌كانیش به‌ره‌وژوو چوونێكی سه‌رسام كه‌ریان هه‌بووه(Held, .1998: 15)

هێندێك له تیۆریسته‌كانی به‌جیهانیبوون بڕوایان وایه كه به‌ره‌وپێش چوونی زۆر به هه‌ڵپه‌ی ئه‌م لایه‌نه‌ی به‌جیهانیبوونی ئابووری زۆرتر له چیه‌تی هێمایی ئه‌وه‌وه سه‌رچاوه ده‌گرێ. له‌وه ڕا كه دانوستاندنه‌كان له بیاڤه ماڵی و پاره‌ییه‌كان دا به یارمه‌تیی گرێده‌ره هێماییه‌كان ئه‌نجام ده‌درێن، هۆكاره سروشتی، سیاسی و كولتوورییه‌كان كه‌مترین كاریگه‌ریی به‌رگرانه‌یان هه‌یه و پانتایی بزاوتی سه‌رمایه به خێرایی جیهانی ده‌بێ. "شكڵ گرتنی بازاڕێكی وشكی جیهانی، بازاڕی جیهانیی كالاٌ، ده‌ره‌تانی دانوستاندنی وشكه (نقدینگی) له ئاستی جیهانی‌دا و بزاوتی پڕ هه‌ڵپه‌ی وڵاته و وڵاتی وشكه، بۆ یه‌كه‌م جار به واتای شكڵ گرتنی بازاڕێكی جیهانیی یه‌كگرتووه بۆ پاره و خسته‌رووی متمانه (اعتبار) (Harvey, .1989: 161)

له ماوه‌ی سێ ده‌یه‌ی دوایی دا راده‌ی وامه نێونه‌ته‌وه‌ییه‌كان زۆر زیادی كردوه و ته‌قینه‌وه‌یه‌ك له بواری دانوستاندنی ماڵیی پشكه‌كان، به‌ڵگه‌ی قه‌رز و دانوستاندنه پاره‌ییه‌كان دا رووی داوه. هه‌روه‌ك خشته‌ی ژماره ٢ نیشانی ده‌دا، له ساڵی ١٩٥٠دا راده‌ی گشتیی داراییه گۆڕدراوه‌كان له بازاڕه ماڵییه نێونه‌ته‌وه‌ییه‌كان دا به به‌راورد له‌گه‌ڵ كۆی هه‌نارده جیهانییه‌كان ٠/٥ له سه‌د بووه كه بیست ساڵ دواتر (١٩٧٠) به ١/٣ به‌ره‌وژوور چوون گه‌یشتۆته ١/٨ له سه‌د كه شه‌ش هێنده له ساڵی ١٩٧٠ زیاتر بووه. ئه‌م به‌ره‌وژوور چوونه به شێوه‌یه‌كی سه‌رنجڕاكێش درێژه‌ی كێشا و له ساڵی ١٩٩٦دا گه‌یشته بیست له سه‌د.

به‌ره‌وژوورچوونی كه‌م وێنه و به‌رچاوی دانوستاندنه ماڵییه ده‌ره‌كییه‌كان كاتێك باشتر ده‌رده‌كه‌وێ كه سه‌رنج بده‌ینه كاركردی وڵاته پێشكه‌وتووه سنعه‌تییه‌كان له‌م بیاڤه‌دا. له ماوه‌ی پازده ساڵ دا (١٩٩٥- ١٩٨٠) بارستایی دانوستاندنه ئه‌وپه‌ڕسنوورییه‌كانی وڵاته‌یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكا به شێوه‌ی پشك و به‌ڵگه‌ی قه‌رز به به‌راورد له‌گه‌ڵ به‌رهه‌می پوخته نه‌كراوی نێوخۆیی.



**خشته‌ی ژماره ٣. راده‌ی ئه‌و داراییانه‌ی له بازاڕه ماڵییه نێونه‌ته‌وه‌ییه‌كان دا گۆڕدراونه‌ته‌وه به به‌راورد له‌گه‌ڵ هه‌نارده‌ی جیهانی**

| ١٩٩٦ | ١٩٩٠ | ١٩٨٥ | ١٩٨٠ | ١٩٧٥ | ١٩٧٠ | ١٩٦٠ | ١٩٥٠ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠ | ١٠/٥ | ١٣/٥ | ٥/٨ | ٤/٦ | ١/٨ | ١ | ٠/٥ |

**سه‌رچاوه:** IMF World Economic Outlook, October 1996, World Trade Organization Annual Report 1997, Table A. 3.

له نۆ له سه‌ده‌وه بۆ ١٣٥/٥ له سه‌د زیادی كردوه. ئه‌م زیادبوونه بۆ ئیتالیا نزیكه‌ی ٢٥٠ له سه‌د بووه (خشته‌ی ژماره ٤).

**خشته‌ی ژماره ٤. راده‌ی دانوستاندنه ئه‌وپه‌ڕ سنووری و پشكه‌كان و به‌ڵگه‌كانی قه‌رز به به‌راورد له‌گه‌ڵ به‌رهه‌می پوخته نه‌كراوی نێوخۆیی**

| | ١٩٨٠ | ١٩٨٥ | ١٩٩٠ | ١٩٩٥ |
|---|---|---|---|---|
| وڵاته‌یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكا | ٩ | ٣٥/١ | ٨٩ | ١٣٥ |
| ژاپۆن | ٧/٧ | ٦٣ | ١٢٠ | ٦٥/٧ |
| ئاڵمان | ٧/٥ | ٣٣/٤ | ٥٧/٣ | ١٦٨/٣ |
| فه‌رانسه | - | ٢١/٤ | ٥٣/٦ | ١٧٨/٢ |
| ئیتالیا | ١/١ | ٤ | ٢٦/٦ | ٢٥٠/٩ |
| كانادا | ٩/٦ | ٢٦/٧ | ٦٤/٤ | ١٩٢ |

**سه‌رچاوه:** BIS, 66 th Annual Report, P. 98, and 67th Report, P. 119

له ماوه‌ی سێ ده‌یه‌ی دواییدا وامه نێونه‌ته‌وه‌ییه‌كانیش نزیكه‌ی دوو هێنده‌ی بازرگانیی جیهانی هه‌ڵی داوه. هاوكات له‌گه‌ڵ ده‌ركه‌وتنی قه‌یرانی قه‌رزه‌كان بازاڕه‌كانی بورسیش گه‌شه‌یه‌كی به‌رچاویان كردو له ماوه‌ی پێنج ساڵ (٨٧ – ١٩٨٣)دا كۆی به‌ڵگه‌ی بایداری مامه‌ڵه‌كراو له بواری بان نه‌ته‌وه‌یی دا له دوو سه‌د میلیۆن دۆلاره‌وه گه‌یشته بیست میلیارد

دۆلار (Dicken, 1992: chap. 3). لە ساڵەکانی دوایی دا ڕادەی سەرمایەدانان لە بازاڕە ماڵییە نوێیەکانیش دا گەشەیەکی سەرنجڕاکێشی هەبووە.

کەواتە دەتوانین بڵێین ئێستا بازاڕێکی جیهانی بۆ گۆڕینەوە پارە و هەرجۆرە بەڵگەی بایبداری شیاوی مامڵە هەیە، کە لەودا ڕکەبەرایەتیی توندە و سەرمایەش زۆر بزۆك و ڕەوانە. بەستێنی شکڵ گرتنی بازاڕێکی ئەوتۆ بێجگە لە هێمایی بوون و گرێدەرەکانی دانوستاندن و ئامرازی پێوەندیی زۆر پێشکەوتوو، هێندێك کاری بنەڕەتی بۆ چاکسازی و کەم کردنەوەی ڕێوشوێنە داراییەکان لە ئاستی جیهان دا بووە: لابردنی ڕێوشوێنە تەگەر خولقێنەکانی لەبەردەم بزاوتی سەرمایە لە سەرەتای دەیەی حەفتادا، لابردنی چاوەدێری و کۆنترۆڵی بایی بەهرە و وەلاتانی کۆسپە نەریتییەکانی بەهرەمەندی لە خزمەتگوزارییە بانکییەکان و خزمەتگوزارییە داراییەکانی دیکە.

ئەمڕۆکە ڕایەڵکەکانی جیهانیی پارە و دارایی بە چەشنێك لێك تەنراون و ئاوێتە بوون کە هەموو پارە نەتەوەییەکان پێکەوە پێوەندییان هەیە و هەستیاریی ئەوان لە بەرانبەر گۆڕانکارییە نێونەتەوەییەکان دا چەند قات بووە. کەواتە خۆدزینەوە لە هاوئاهەنگیی نێوان پارەکان، بە تایبەت پارە خاوەن متمانە جیهانییەکان کارێکی نەکراوە: "لێك گرێدراویی بەرانبەری بازاڕەکانی دارایی و پارە لە جیهان دا پارە نەتەوەییەکان پێکەوە دەبەستێتەوە. دانوستاندنی بەردەوامی نێوان دۆلار و یەن هاوئاهەنگییەکی شێوازمەندی لە نێوان ئەو پارانەدا پێك هێناوە کە بە تەنیا شێوازی جێگیری لە بازاڕی پارەیدا و لە ئاکام دا سەرمایەدانانی جیهانی و بازرگانیی جیهانی دەژمێردرێ" (Gastells, 1997: 245).

ئەگەرچی پرۆسەی بەجیهانیبوونی ئابووری لە بیاڤە هێماییەکان دا، وەك سەرمایەدانی ڕاستەوخۆی دەرەکی و بەتایبەت بازاڕەکانی دارایی و پارە دا، زۆر توند و پڕ هەڵپەیە، بەڵام لە بیاڤە مادییەکانیش دا دەتوانین پرۆسەیەکی ئەوتۆ دەس نیشان بکەین. ئێستا بێجگە لە بزاوت و ڕاگوازتن و گواستنەوەی بان نەتەوەیی کاڵا مادییەکان کە لە بازرگانیی جیهانی دا بە شێوەیەکی ڕوو لە زیادبوون دەردەکەوێ، بۆ هێزی کاریش بازاڕێکی جیهانی پێکهاتوە. هەر ڕۆژە بە ژمارەی ئەو مرۆڤانەی کە بۆ دۆزینەوەی کاری (لەبار— شیاو) وڵاتی خۆیان بە جێ دهێڵێن زیاد دەبێ و دیاردەی کۆچ لایەنی بەربڵاوتر و ئاڵۆزتری پەیدا دەکا. لەم ڕووەوە هێندێك بڕوایان وایە کە دەبێ سەردەمی ئێستا بە "سەردەمی کۆچ" دانێین (Sutcliffe, .1998: 325)



ئەنجامە گشتییەکان دەری دەخەن کە ئێستا نزیکەی سەد میلیۆن مرۆڤ لە دەرەوەی وڵاتانی خۆیان دەژین (Martin, 1999: 180 ). بەڵام هەموو ئەو کەسانە کە نزیکەی ١/٦ لە سەدی حەشیمەتی جیهانن، ناتوانن لە ریزی کۆچەرانی ئابووریدا دابنێین. زۆربەی ئەوان کەسانێکن کە بە هۆی پاڵنەرە نائابوورییەکان و زۆرتر بە شێوەی نادڵخوازانە نیشتمانی خۆیان بە جێهێشتووە کەواتە لە پلەی یەکەم دا بە پەنابەر دەژمێردرێن تا کۆچەر. ئەگەر ئەم ژمارە لە ژمارەی باس کراو کەم بکەینەوە، دەتوانین بڵێین ئێستا نزیکەی پەنجا میلیۆن کۆچەر لە جیهان دا هەن کە ٨/٠ لە سەدی حەشیمەتی جیهان پێك دێنن (Sutcliffe, 1998: .326)

ئەم جۆرە کۆچە دیاردەیەکی نوێ نیە و ڕابردوویەکی لانیکەم چەندین دە ساڵەی هەیە، بەڵام هەڵسەنگاندنەکان دەری دەخەن کە ڕادەی جۆرەکانی کۆچ بۆ کار لە وڵاتانی دیکە لە دەیەکانی دواییدا بەردەوام لە زیادبوون دابووە. بە وتەیەکی دیکە سەرەڕای ئەوەی کە ئێستا کە ژمارەی کۆچەرە نێونەتەوەییەکان بە بەراورد لەگەڵ حەشیمەتی جیهان لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، سەدەی نۆزدەیەم و تەنانەت سەدەی هەژدەهەم و حەڤدەهەم دا کەمترە، لە نێوەڕاستی دەیەی شەستەوە ژمارەی کۆچەران بۆ وڵاتانی سنعەتی و هێندێك وڵاتی ڕوو لە گەشە زیادی کردوە.

خشتەی ژمارە ٥ دەری دەخا کە لە ١٩٦٥ تا ١٩٩٠ ژمارەی بیانییەکانی دانیشتووی وڵاتانی سنعەتی بە بەراورد لەگەڵ کۆی حەشیمەتی ئەو وڵاتانە لە سێ لە سەدەوە گەیشتۆتە ٤/٥ لە سەد. لە هێندێك لە وڵاتانی ڕوو لە گەشەش دا ئەم ڕێژەیە زیادبوونێکی بەرچاوی هەبووە، بە تایبەت لە وڵاتانی لێواری کەنداوی فارس. ئەستوونی دووهەمی خشتەکەش باس لەوە دەکا کە لە ماوەی ئەو ٢٥ ساڵە دا، ڕادەی حەشیمەتی کۆچەر بە بەراورد لەگەڵ کۆی حەشیمەتی وڵاتانی ناوبراو ـ بە دەرهاویشتنی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا — زیادی کردوە، بەڵام ئەم زیادبوونە لە پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی سنعەتی دا زۆر بەرچاو بووە.

بە سەرنجدان بەم ژمارانە وادێتە بەرچاو دوو گۆڕانکاریی گەورە لە نموونەکانی کۆچ دا ڕووی داوە. یەکەم ئەمە کە وڵاتانی سنعەتی لە ساڵانی دواییدا وەرگری ژمارەیەکی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتری کۆچەر لە وڵاتە جۆراوجۆرەکانەوە بوون. دووهەم ئەمە کە وڵاتانی دەوڵەمەندی خاوەن نەوتیش لە تەنیشت وڵاتانی سنعەتیدا بوونەتە دووهەمین جەمسەری ڕاکێشانی کۆچەرانی جیهان، لە حاڵێك دا کە ژمارەی کۆچەرانی وڵاتانی ڕوو لە گەشەی دیکە لە مادەی ئەم ساڵانەدا بە بەراورد لەگەڵ کۆی حەشیمەت هێندە زیادی نەکردوە.

**خشتەی ژمارە ٥. دابەشبوونی جیهانیی کۆچەران**

| | ڕێژەی لە دایکبووان لە دەرەوە بە بەراورد لەگەڵ حەشیمەت | | هەڵدانی لە دایکبووان لە دەرەوەی وڵات بە بەراورد لەگەڵ کۆی حەشیمەت |
|---|---|---|---|
| | ١٩٦٥ | ١٩٦٠ | ٩٠ - ١٩٦٥ |
| وڵاتانی سنعەتی | ٣ | ٤/٥ | +١١/٤ |
| وڵاتەیەکگرتووەکان و کەنادا | ٦ | ٨/٦ | +١٧/٥ |
| ئەورووپا | ٣/٣ | ٥ | +١٨/٣ |
| ئۆقیانووسیە | ١٤/٤ | ١٧/٨ | +٢٤/٣ |
| وڵاتانی روو لە گەشە | ١/٩ | ١/٦ | +١/٢ |
| وڵاتانی لێواری کەنداوی فارس | ١٢/٤ | ٣٦/٥ | - |
| باکووری ئەفریقا و ڕۆژئاوای ئاسیا | ٤/١ | ٦ | +٠/٧٩ |
| ئەمریکای لاتین | ٢/٤ | ١/٦ | +٠/٦ |
| ئەفریقای ناوەندی | ٢/٨ | ٢/٨ | +٢/٨ |
| باشووری ئاسیا | ٢/٨ | ٢/٨ | +٠/٤ |
| ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا | ١/٩ | ١/٨ | +٠/٢ |

**سەرچاوە:** “Trends in Total Migration Stock, Rervision 3”, United Nations, Population, 1995.

بە هەرحاڵ ئەگەر بەجیهانیبوونی ئابووری بریتی بێ لە بزاوتی جیهانیی کاڵا، پارە، خزمەتگوزارییەکان، زانیاری و هێزی کار، زۆربوونی ژمارەی کۆچەران لە پانتایی جیهانیدا دەبێ بە لایەنێکی ئەم پرۆسەیە دابنێین. ژمارەی زێدەڕووی حەشیمەتی کۆچەر لە جیهان دا نیشاندەری دزە هەڵگرتربوونی سنوورە سیاسی و ئابوورییە نەتەوەییەکانە کە توانا و مەیلی ئەوان بۆ سەرسەختی و بەرگری لە بەرانبەر تەوژم و هێزە جیهانسازەکان دا زیاتر لە پێشوو کەم دەبێتەوە، بەڵام ئەم بێتوانایی و بێ مەیلییە بە باشتر و ڕاشکاوترین شێوە لە بیاڤی دانوستاندنە هێماییەکان دا دەردەکەوێ کە کۆمپانیا فرە نەتەوەییەکان بە چالاک ترین دامەزراوەکانی ئەم بیاڤە دەژمێردرێن.





دیارە ڕابردووی کۆمپانیا فرە نەتەوەییەکان دەگەڕێتەوە بۆ بەر لە سەدەی بیستەم. کۆمپانی هیندی ڕۆژهەڵات، کۆمپانیی ماسکۆڤی[38] کۆمپانیی ڕۆیاڵی ئەفریقا و کۆمپانی هودسۆن بێی[39] لە سەدەی هەژدەیەمەوە چالاکیی بان نەتەوەییان هەبووە (Dunning, 1993: 97 –8) هەرووەها یەکەمین بەرەی کۆمپانییە سنعەتییەکانی ئەمریکایی و ئینگلیس کە بەشێکی بەرچاو لە داراییەکانی خۆیان لە دەرەوەی سنوورە نەتەوەییەکان وەرگەڕ دەخست، لە یەکەم ساڵەکانی سەدەی بیستەم دا هاتنە گۆڕەپانی ئابووریی جیهانییەوە. ئەم پرۆسەیە لە ساڵەکانی نێوان دوو شەڕی جیهانییش دا بە هێندێك ڕاوەستان و دابەزینەوە بەردەوام بوو، بەڵام لەم ساڵانەی دواییی دا بە هۆی گۆڕانکاری و پێشکەوتنە بەرچاوەکانی بواری پێوەندییەکان و پێکهاتنی شەپۆلێکی نوێی نزیکبوونەوە لە سیاسەتە ئابوورییە لیبراڵەکان، پانتایی چالاکیی کۆمپانییە فرە نەتەوەییەکان بەرین بۆوە.

بەراوردکراوە لە نێوەڕاستی دەیەی نەوەددا، ٤٥,٠٠٠ کۆمپانیی فرەنەتەوەیی دایك نزیکەی ٢٨٠ هەزار ڕێکخراوی بەستراوەیان کۆنترۆڵ دەکرد. لەم ژمارە کۆمپانییە دایکە، ٣٧ هەزار کۆمپانی (نزیك ٨٢ لە سەد) سەر بە یەکێك لە چوار وڵاتی پێشکەوتووی جیهان بوون و نووسینگەی ناوەندیی نەوەد لە سەدی ئەوان لە جیهانی پەرەگرتوودا هەڵکەوتبوو. ئەو کۆمپانییانە لە ساڵی ١٩٩٦دا نزیکەی حەوت تریلیۆن دۆلار فرۆشیان هەبوو کە زیاتر لە بایی تەواوی بازرگانیی جیهانی (٥/٢ تریلیۆن دۆلار) بوو (Hirst, 1999: 68).

بەڕێوەبەریی کارلێهاتوو و دانانی ستراتیژیی گونجاو، کۆمپانییە فرە نەتەوەییەکانی کردە دامەزراوەگەلی زۆر بە هێز لە گۆڕەپانی ئابووریی جیهانی دا. ئەوان بە توانای دارایی زۆر و زەوەند و لە دەست دابوونی تێکنۆلۆژیی نوێ، ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ بەهێزتر دەبن و گۆڕەپانی ڕکەبەریی جیهانی لە زۆر لە دامەزراوە بەرهەمهێنەر و بازرگانییەکان بەرتەسك دەکەن. بۆ وێنە تەنیا بارستایی دارایی نزیکەی ٢٤ وڵاتی جیهان لەبارستایی دارایی کۆمپانیاکانی وەك "جنراڵ مۆتۆرز"، "ئای بی ئێم"، "شێل" و "جنراڵ ئیلکتریك" زۆرترە (Webster, 1995: 141).

لێکۆڵینەوەکان و ئامارەکان دەری دەخەن کۆمپانییە فرە نەتەوەییەکان ڕۆڵێکی سەرەکییان لە بەجیهانیبوونی بەرهەمهێنان و دانوستاندنە پارەیی و داراییەکان دا هەیە. ئێستا ئەوان نزیکەی ١ لە ٣ تا ١ لە ٤ی بەرهەمی جیهانیان لە ئەستۆیە و بارستاییەکی مەزنی بەرهەمە

38- Muscovy
39- Hudson Bay

پێویستەکانی بازاڕی بەکارهێنانی جیهانی دابین دەکەن. نزیکەی حەفتا لە سەدی بازرگانیی جیهانیش لە ڕێگای ئەم کۆمپانیانەوە بەڕێوە دەچێ. هەروەها ئەم کۆمپانیانە بە سەرمایەدانەرە سەرەکییەکانی بواری سەرمایەدانی ڕاستەوخۆی دەرەکی دەژمێردرێن و نزیکەی هەشت لە سەدی ئەم جۆرە سەرمایەدانانە ئەنجام دەدەن. ڕۆڵی کۆمپانییە فرە نەتەوەییەکان لە بازاڕە داراییەکانیش دا گرنگ و شایانی سەرنجە (Held, 1998: 17).

توانایی ئابووری و بەربڵاوی چالاکیی ئەم جۆرە کۆمپانییانە بۆتە هۆی ئەوەیکە ڕۆڵێکی زۆر گرنگیان لە سیاسەتە ئابوورییە گشتییەکانی وڵاتان دا هەبێ. هەرچەشنە گۆڕانێك لە بەرنامە گشتییەکانی ئەم کۆمپانییانەدا، وەك کەڵك وەرگرتن لە هێزی کار هەرزانی وڵاتێك یان سەرمایەدانان لە وڵاتێکی دیکەدا، لەوانەیە کاریگەرییەکی بەرچاو لە سەر ئابووری و سیاسەتی وڵاتێك دانێ. بۆ وێنە تەنانەت تەرخان کردنی ڕێژەیەکی زۆر کەم لە چالاکییە ئابوورییەکانی کۆمپانییەکی فرە نەتەوەیی لە وڵاتێکی وەك زیمبابوە، چارەنووسی زۆر لە دانیشتووانی ئەو وڵاتە دەگۆڕێ (Held, 1998: 17) .

کۆمپانییە فرە نەتەوەییەکان نەك تەنیا چالاکیی بان نەتەوەییان هەیە، بەڵکوو لە بواری خاوەندارێتیش دا بان نەتەوەیی یان "بێ دەوڵەت"ن. ئێستاکە کۆمپانییەکانی وەك "بریتیش گاز"، "بریتیش تێلەکام" و "بریتیش ئێرویز" کۆمپانیگەلی جیهانین کە پێوەندیی لاوازیان لەگەڵ بریتانیا هەیە. کارگەی لەیلاند کە سەردەمێك بەرهەمهێنەری ئۆتۆمبیلی نەتەوەیی ئینگلستان بوو، ئێستا لەگەڵ کۆمپانیی "هۆندا" و "بی. ئێم. وی". تێکەڵ بووە. کەواتە ئێستا لە وڵاتانی وەك ئینگلستان، کانادا، ئوسترالیا، هولەند، سینگاپوور و ئارژانتین، لایەنی نەتەوەیی خاوەنەکان و پشکدارە سەرەکییەکانی کۆمپانییە گەورەکانی وەك "فیلیپس" و "نەستەلە" گرنگییەکی ئەوتۆی نیە.

ئەگەرچی سەبارەت بە پێگەی دیار و بەرچاوی کۆمپانییە فرە نەتەوەییەکان لە لایەنی توانایی ئابووری، چالاکیی جیهانی و خاوەندارێتیی بان نەتەوەیی هاوڕایی بەرچاو هەیە، بەڵام هەڵوێستی دژبەریش بەرچاو دەکەوێ. تەوەری سەرەکی زۆربەی ئەم هەڵوێست گرتنانە ئەمەیە کە کۆمپانیا بە ناو فرەنەتەوەییەکان بەشی زۆری داهاتەکانیان لە بازاڕە نێوخۆییەکان دا دابین دەکەن (Held, 1998: 17). کەواتە بە پێچەوانەی ئەوەی کە دەگوترێ و وێنا دەکرێ، بیاڤی کردەوەی ئەم کۆمپانییانە جیهانی نیە لانیکەم بۆ ناوچەیەکی دیاریکراو (بە تایبەت ئەورووپا و ئەمریکا) تەرخان کراوە.





هێندێك لە توێژەران تەنانەت واوەتر دەچن، بەجیهانیبوونی ئابووری و بەم پێیە تەواوی پرۆسەی بەجیهانیبوون دەخەنە بەر پرسیار. ئەوان وەك پەرچەکردار بەرانبەر بەو وتەیە کە مرۆڤ چۆتە سەردەمێکی نوێوە کە لە چوارچێوەی ئەو دا بەشی زۆری ژیانی کۆمەڵایەتی لە ژێر کاریگەریی پرۆسەکان و ڕەوتە جیهانی و بان نەتەوەییەکان دایە، بە گومانەوە دەڕواننە پرۆسەی بەجیهانیبوون و ئەو قسانەی لەبارەی ئەوەوە دەگوترێن و بەجیهانیبوون بە حیکایەتێك زیاتر نازانن.

بە پێی ڕوانگەیەکی ئەوتۆ، ئابووریی نەتەوەیی و جیهانی بە هیچ شێوەیەك دیاردەیەکی نوێ نیە و ڕابردووی ئەو لانیکەم بۆ ساڵەکانی نێوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم دەگەڕێتەوە. تەنانەت دەتوانرێ بگوترێ کە ئابووریی ئێستا بە بەراورد لەگەڵ ئابووریی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم، کەمتر نێونەتەوەیی یان جیهانییە، چونکە ئاوێتەبوون و لێك تەنراویی ئابوورییە نەتەوەییەکان لە قۆناخی ئێستادا کەمتر لە ڕابردوویە. بارستایی بازرگانیی جیهانی لەو دوو قۆناخەدا بەڵگەیەکی ڕوونە بۆ ئەم گوتەیە.

کۆمپانییە بان نەتەوەییەکان بوونی دەرەکیان نیە و خاوەنەکان و پشکدارە سەرەکییەکانی ئەم کۆمپانییانە هاووڵاتیی وڵاتێکی دیاریکراون. ڕەوت و بزاوتی جیهانیی سەرمایە قسەیەکی بێ بنەمایە و سەرمایەدانانی ڕاستەوخۆی دەرەکی زۆرتر لە چەند وڵاتێکی دیاریکراوی سنعەتیدا کورت دەکرێتەوە. لەم ڕووەوە جیهانی سێهەم هەروا لە پەراوێز دایە و ڕادەیەکی زۆر کەم لە سەرمایەی دەرەکی ڕادەکێشێ. کەواتە دەبێ بگوترێ کە ئابووریی جیهانی بە حەقیقەت "جیهانی" نیە، بەڵکوو ئابوورییەکە لە سەر تەوەری ئامریکایی باکوور، ئەورووپا، ژاپۆن ڕاوەستاوە، ئەگەر ئەم سێ جەمسەرە ڕێك کەون و یەکگرتوو بن، تەوژمێکی زۆر دەکەوێتە سەر باقی جیهان (Hirst, 1996: 2- 3) .

هەروەك لە باسی لایەنە جۆراوجۆرەکانی بەجیهانیبوون دا گوتراوە و دژبەرانیش پشت ڕاستیان کردوە، دیاردەکانی وەك بازرگانیی جیهانی، سەرمایەدانانی ڕاستەوخۆی دەرەکی، کۆچ و کۆمپانییە فرە نەتەوەییەکان لانیکەم چەندین دەیە پێشینەیان هەیە. لانیکەم لەو کاتەوە کە سەرمایەداری وەك سیستمێکی کۆمەڵایەتی ئابووریی بە توانا و بەرینخواز جێگیر بوو، ئابووریی جیهانی یا نەتەوەییش شکڵی گرت. کەواتە ناتوانین تەنیا شکڵ گرتن و بەردەوام بوونی ئابوورییەکی ئەوتۆ بە نیشانەیەکی بڕواپێکراو و پشت پێ بەستراوی دەرکەوتنی قۆناخێکی نوێ بزانین و دیارە تیۆریستەکانی بەجیهانیبوونیش لە شتێکی ئەوتۆ خۆ دەپارێزن.

ئەگەرچی بە هیچ شێوەیەك ناتوانین لە کۆن بوونی پرۆسەی شکڵ گرتنی ئابوورییەکی جیهانی دا گومانمان هەبێ، بەڵام زۆر لە هەڵسەنگاندن و ئامارەکان دەری دەخەن کە هۆکارە هەڵپەبەخش و یارمەتیدەرەکانی ئەم پرۆسەیە لە ساڵانی دوایی دا زۆرترو کاریگەرتر و بەتواناتربوون. لەگەڵ ئەوەی کە بارستایی دانوستاندنەکان و رەوتە جیهانییەکان تا سەرەتاکانی دەیەی حەفتا نەگەیشتبوە ئاستی ساڵەکانی بەر لە یەکەمین شەڕی جیهانی، لەوە بە دوا بە خێرایی زیادی کرد. ئەم زیادبوونە زۆرتر ئاکامی پێشکەوتنە بەرچاوەکانی بواری پێوەندییەکان و بەرەورووبوونی رێژەیی لیبرالیسمی ئابووری لەگەڵ پێشوازیی گشتییە.

لە ژێر کاریگەریی ئەم جۆرە گۆڕانکارییە سەرنجڕاکێشانە لە پێوەندییە جیهانییەکان دا و زێدەبوونی دانوستاندنی جیهانی دا، هێندێك لە تیۆریستەکان بڕوایان وایە کە جیهان ئێستا لە حاڵی تێپەڕین بۆ قۆناخی ئابووریی بان نەتەوەییە دایە. لە ئابووریی نێونەتەوەیی دا ئەگەرچی دانوستاندنە جیهانییەکان مەزن و پڕ بارستایین، بەڵام بەشی بەرچاوی ئەم دانوستاندنانە لە نێوان ئابوورییە نەتەوەییەکان دا ئەنجام دەدرێ. تەنانەت بەڕێوەبەرە ئابوورییە چالاکەکانی گۆڕەپانی نێونەتەوەییش کۆمەڵە گرێدەرێکی پاشکۆن کە لە خزمەت ئابوورییە نەتەوەییەکان دان، بەڵام ئابووریی بان نەتەوەیی لە هەمان کات دا کە دانوستاندنە نێونەتەوەییەکان لە خۆ دەگرێ، خاوەنی تایبەتمەندیگەلێکی زۆرترە. لەم قۆناخە لە ئابووری دا، پرۆسەکان و دامەزراوە بان نەتەوەییەکان پێگەیەکی زەقیان هەیە و تەنانەت دەوڵەتەکانیش بەستراوەییەکی روو لە زیادبوویان بەم جۆرە پرۆسە و دامەزراوانە دەبێ (Holton, 1998: 52 – 53).

لایەنێکی دیکەی زۆر جیاوازی ئابووریی بان نەتەوەیی یا پێشکەوتووترین قۆناخی پرۆسەی بەجیهانیبوونی ئابووری ئەمەیە کە نێوەڕۆك و چییەتی بزاوت و دانوستاندنە جیهانییەکان دەگۆڕێ. ئێستاکە بە هۆی شۆڕشی پێوەندییەکان، بیاڤی هێمایی لە پانتایی جیهانی دا دەرکەوتووە کە کاری رایەڵکە جیهانییەکانی سامان، دەسەڵات و زانیارییان زیاتر لە پێشوو سانا کردوە. کەواتە ئابوورییەکانیش مەیلێکی رۆژ لە رۆژ زیاتریان بۆ چالاکی نواندن لەم بیاڤە هێماییەدا تێدا دەرکەوتوە و روو دەکەنە دانوستاندنی ئەو کاڵا و بایەخانەی لە رێگای گرێدەرە هێماییەکانەوە ئەنجام دەدرێن. بە دەربڕینێکی دیکە ئابووریی کولتووری دەبێ:

ئێستا وا دێتە بەرچاو کە دانیشتووانی گۆی زەوی چوونەتە قۆناخی "ئابووریی کولتووری"یەوە. لەم قۆناخەدا بازارە هێماییەکان وایان لـێ دێ دەوڵەتەکان توانای بەڕێوەبردنی ئەوانیان نەبێ و یەکەکانی بەرهەمهێنانی ئابووری تاکانەتر و مرۆیی تر دەبن. ئابووریی



ئەوەندە بەستراوەی سەلیقە و هەڵبژاردنی تاك دەبێ کە بە شێوەیەکی رەنگدەرەوانە بازاڕی دەبێ و، لەوەڕا کە سیستمە هێماییەکان لە فیزیك دا ناگونجێن، بە شێوەیەکی رەنگدەرەوانە جیهانی دەبن... بەم شێوەیە ئابووری دەگۆڕدرێ و دەچێتە نێو ئەو کۆسپە جوغرافیایی و سیاسییانەی ماونەتەوە(Waters, 1995: 95) .

ئەو گۆڕانکاری و تایبەتمەندییانەی لە پێوەندی لەگەڵ ئابووریی جیهانی دا هێنرانە گۆڕێ دەتوانین بە نیشانەی هەرە دیارەکانی بەجیهانیبوونی ئابووری و بەم پێیە پرۆسەی بەجیهانیبوون دابنێین، چونکە هەم بە پەستێوتراویی زەمەن و فەزا (کەمبوونەوەی زۆری تێچووەکانی پێوەندییەکان و گواستنەوە) بەستراونەتەوە، هەم بە لای ئاوێتە بوون لە کۆمەڵگەی جیهانی (دزەکردنی زیاتر لە پێشووی ئابووری بۆ نێو کۆسپ و سنوورە بە جێماوە جوغرافیایی—سیاسییەکان)دا شکاونەتەوە و هەم بە لای وشیاریی رێژەیی سەبارەت بە پرۆسەی پەستێوتراویی و ئاوێتەبوونی جیهانی (بازاڕی بوونی رەنگدەرەوانەی ئابووری و گرنگی پەیداکردنی سەلیقە و هەڵبژاردنی تاکەکەسی) دایە. بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون بە هیچ شێوەیەك تەنیا لە ئابووریدا کورت نابێتەوە.

## بەجیهانیبوونی سیاسی

دانیەل بێل نزیکەی پازدە ساڵ لەمەوبەر گوتی کە دامەزراوەی دەوڵەت نەتەوە "بۆ پرسە گەورەکانی ژیان زۆر بچووکە و بۆ پرسە بچووکەکانی ژیان زۆر گەورەیە" (Bell, 1987: 14). ئەگەرچی گومان کردن لە کارایی و لێوەشاوەیی گرنگترین دامەزراوە و رێکخراوی سیاسی مۆدێرن بە قەت تەمەنی ئەو رابردووی هەیە، بەڵام پرۆسەی پڕهەڵپە و گشتگیری بەجیهانیبوون لە دەیەکانی دوایی دا ناتوانایی و ناکارلێهاتوویی دامەزراوەی دەوڵەتی بە راشکاوانەترین شێوە دەرخستووە؛ بەجیهانیبوونی سیاسی رووی لەم لایەنەی پرۆسەی بەجیهانیبوونە.

هەروەك لە واتای بەجیهانیبوون دا گوترا، پرۆسەی جێگای باس بریتییە لە ئاوێتە بوونی خاکی دنیا لە کۆمەڵگەیەکی یەککگرتوودا یان لێك گرێدرانی تاك و کۆمەڵگە لە پانتایی جیهانیدا. بە دەربڕینێکی دیکە بێ بەستێن بوونی پێوەندی و کردارە کۆمەڵایەتییەکان لە ئاکامی پەستێوتراویی فەزا و زەمەن دا، دەرەتانی بۆ دامەزراندنی پێوەندیی نێوان مرۆڤە زۆر لێك دوورەکان و وەك گیدێنز دەڵێ، "دیترانی نائامادە"رەخساندوە و بەستێن و فەزایەکی زۆر بەرین بۆ پێوەندیی کۆمەڵایەتی پێك دێنێ. ئەم بەستێنە هەمان کۆمەڵگەی

جیهانییە کە دیارە تا گەیشتن بە قۆناخی چلەپۆپە و پێشکەوتووی ڕێگایەکی درێژو پڕ هەوراز و نشێوی لە بەردایە.

کۆمەڵگەی جیهانی لەگەڵ کۆمەڵگەی نەتەوەیی پێوەندییەکی پێچەوانەی هەیە. هەر رووکارێکی ژیانی کۆمەڵایەتی کە نەچێتە چوارچێوەی کۆمەڵگەی نەتەوەیی پێناسەکراو سنووردارکراو لە لایەن دامەزراوەی دەوڵەتەوە، دەچێتە چوارچێوەی بەرینی کۆمەڵگەی جیهانییەوە. ئەم رووکارە رەنگە جۆرێك دڵبەستنی رووت بە دەوروبەری بان نەتەوەیی، کاریگەری وەرگرتن لە گۆڕانکاری و رووداوە بان نەتەوەییەکان و بە پێچەوانە و گرنگتر لە هەمووان، پێوەندی و دانوستاندنە ماددی و نامادییەکان بێت. ئەگەرچی دەوڵەت – نەتەوەکان هەوڵەکانی خۆیان بۆ سنووردارکردنی کاروباری کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی سنوورە نەتەوەییەکان دا تەرخان کردوە، بەڵام قەت بە تەواوی سەرکەوتوو نەبوون و ئەم ناکامییە لە دەیەکانی دوایی دا زۆرتر بووە.

لەم روانگەیەوە، دەبێ بەجیهانیبوون بە پرۆسەیەك دابنێین کە بە هۆی ئەوەوە بابەتی کۆمەڵایەتی زیاتر لە پێشوو لە چوارچێوەی تەسك و سنوورداری دەوڵەت- نەتەوەکان دەرباز دەبێ و مرۆڤەکان لە چوارچێوەی کۆمەڵگەیەکی بەرینتر دا درێژە بە ژیانی کۆمەڵایەتیی خۆیان دەدەن. ئەگەرچی ئەم جۆرە ژیانە کۆمەڵایەتییە هێشتا کەمرەنگە، بەڵام هەر چۆنێك بێ بوونی هەیە و رۆژ بە رۆژ بەرینتر و پڕ رەنگتر دەبێ. ئێستاکە ژیانی کۆمەڵایەتیی دانیشتووانی دوورکەوتووترین و دابڕاوترین گوندەکانیش لە ئۆگری و کەڵکەڵەی بان نەتەوەیی و تەنانەت پێوەندییە جیهانییەکان بە دوور نیە.

لە لاپەڕەکانی پێشوودا پێوەندی و کرداره کۆمەڵایەتییە بان نەتەوەییەکانمان لە لایەنی ئابوورییەوە و لە ژێر ناوی بەجیهانیبوونی ئابووریدا تاوتوێ کرد. ئەم پرۆسەیە بریتییە لە هەر جۆرە رەوت، بزاوت و پێوەندییەکی بان نەتەوەیی کە لە رێگای بەڕێوەبەرە جۆراوجۆرە ئابوورییەکانەوە پێك دێ. "بەجیهانیبوونی سیاسی"یش گرێدراوی ئەم جۆرە بزاوت و پێوەندییە بان نەتەوەییانەیە لە بوارە سیاسییەکان دا. بەم پێیە لە سەرەتادا باس لەم جۆرە توخمە پێکهێنەرانەی کۆمەڵگەی بان نەتەوەیی جیهانی دەکەین و دواتر پێگەی دەوڵەت لەم فەزا جیهانییەدا تاوتوێ دەکەین.

هەروەك پێشتر باس کرا، بەجیهانیبوون لە لایەنی سیاسییەوە، دەبێ بە دەربازبوونی بابەتی کۆمەڵایەتی لە کۆنترۆڵی دەوڵەت دابنرێ. لە قۆناخەکانی سەردەمی مۆدێرن دا، سنوورەکانی



کۆمەڵگە لە لایەن دەوڵەتەوە واتا و دیاری دەکرا و سنوورە سیاسییەکان کەم تا زۆر لەگەڵ سنوورە کۆمەڵایەتییەکان دا یەکیان دەگرتەوە. سنوورە کولتووری- شووناسییەکانیش بە هۆی هەوڵە بەردەوام و تەنانەت کەم تا زۆر توندوتیژانەکانی دەوڵەت، لە سنوورە نەتەوەییەکان نەدەترازا و هەر چەشنە کولتوورێکی بان نەتەوەیی و ژێرنەتەوەیی بە جۆرێك ناسروشیبوون یان قەیران لە قەڵەم دەدرا. بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون بە داخوران و دزەهەڵگرکردنی سنوورە نەتەوەییەکان، بەستێنی جیایی کۆمەڵگە، پێوەندییە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی لە دامەزراوەی دەوڵەت ئامادە کرد. کەواتە بابەتی کۆمەڵایەتی جارێکی دیکە دەکەوێتە ناوەندی ئۆگریی سیاسەڤانان و توێژەرە کۆمەڵایەتییەکانەوە.

جیایی کۆمەڵگە لە دەوڵەت و ئازادیی بابەتی کۆمەڵایەتی نیشاندەری ناتەباییە دەروونی و بەردەوامەکانی نوێبوونەوەیە کە لە ژێر کاریگەریی بەجیهانیبوون دا زیاتر لە پێشوو دەردەکەوێ. کۆمەڵگەی نەتەوەیی وەك گرنگترین بەرهەمی پرۆسەی نوێبوونەوە، بەردەوام مەیلی لە سەرکوتکردنی بابەتی کۆمەڵایەتی بووە. لە کۆمەڵگەیەکی ئەوتۆدا پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان واتایەکی کارکردی دەگرێتە خۆی و ناوەند و چییەتی پێوەندییەکان لە واتا بنەمایی و حوقووقیەکان پێك دێ. بەم پێیە بۆ وێنە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی پێوەندیدار بە بازرگانی، رێککەوتنە جۆراوجۆرەکان، دەسەڵاتی سیاسی، هاوسەرێتی و هی لەم جۆرە، رووکاری باڵادەستی بابەتی کۆمەڵایەتی پێك دێنن و باقی پێوەندییەکانی دیکەش، وەك توخمگەلێکی کەسێنی، بەهەڵکەوت و هەستەکی، پێگەیەکی لاوەکیان دەبێ (Albrow, 1996: 164).

لە روانگەی کۆمەڵناسییەوە روانگەی کارکردخوازی دەتوانین بە نموونەی بەرزی ئەم دیاردەیە دانێین. بە پێی ئەم روانگەیە، کۆمەڵگە لە زنجیرەیەك رۆڵی سەرەکی پێك دێ و لە سەر پێوەندیی نێوان ئەم رۆڵانە جێگیر بووە. سیستمی کۆمەڵایەتی لە دۆخێك دا کار دەکا کە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە سەر بنەمای رۆڵ بونیادنرابێن و هەر تاکێك بە پێی رۆڵێك کە هەیەکی لەگەڵ کەسانی دیکەی خاوەن رۆڵی هاوشێوە یان جیاواز پێوەندی بگرێ. کەواتە هەر جۆرە چالاکی و پێوەندییەکی دەرەوی ئەم چوارچێوەیە، جۆرێك لادانە. ئەوەمان لە بیر نەچێ کە سیستمی کۆمەڵایەتیی جێگای مەبەستی کارکردخوازەکان لە چوارچێوەی سنوورە سیاسییەکان دا دەگونجێ (Albrow, 1996: 164).

لە گوتاری نوێبوونەوە دا، بابەتی کۆمەڵایەتی وەك دیاردەیەك کە پشت ئەستوور بە خۆی بێ، جێگایەکی نیە و پێوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لە چوارچێوەی پێکهاتەی سیاسیی بەستێن دار و سەرزەوی تەوەردا واتای دەبێ. بە دەربڕینێکی دیکە، نوێبوونەوە لە ڕێگای دامەزراوەی دەوڵەت — نەتەوەوە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بە سەرزەوییەکی سنووردار و دیاریکراوەوە دەبەستێتەوە و لە بەرانبەر ئەو هێزانەی ئەم پێوەندییانە لاواز دەکەن سەر سەختی نیشان دەدا. بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون بە زێدەکردنی پێوەندییە بان نەتەوەییەکان و جۆراوجۆرکردنی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، ململانێ لەگەڵ دەوڵەت — نەتەوەکان دەکا. بە گوتنێکی دیکە پرۆسەی بەجیهانیبوون نەك تەنیا کاتمەند بوونی دامەزراوەی دەوڵەت — نەتەوە دەردەخا، بەڵکوو جەوهەری سەرەڕۆیانە و خۆتەوەرانەی بابەتی کۆمەڵایەتیش دەردەخا کە دەتوانێ لە پانتایی جیهانی دا دەرکەوێ.

ئەو کۆمەڵگەی بان نەتەوەیی یان جیهانییەی خەریکە پێك دێ، زیاتر لە هەر شتێك بەرهەمی پرۆسەی پەستێوتراویی زەمەن و فەزا و بێ بەستێن بوونی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە. ئێستاکە ژیانی کۆمەڵایەتی بە چەشنێك لە سەرزەوی سڕدراوەتەوە کە لە زۆربەی بەشەکانی جیهان دا، هەوڵەکانی بیرمەندانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بۆ بەستنەوەی یەکگرتوویی و لێك گرێدراویی کۆمەڵایەتی بە بیاڤی ناوچەیی ڕووداوی چالاکی و کردارە کۆمەڵایەتییەکانەوە بێ ئاکام ماوەتەوە. بە دەربڕینێکی دیکە لە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە "ناوچە"[40] تاڕادەیەکی زۆر گرنگیی خۆی لەدەست داوە و بۆتە پێگەیەك بۆ جیهانە پێکەوە ژیاوەکان و ژیانە جیهانییەکان.

لە پێشکەوتووترین قۆناخی پرۆسەی بەجیهانیبوون دا، گرووپەکان خاوەنی ناوەندێکی ناوچەیی نین و تەنیا بە شێوەیەکی دەرهەست و ئایدیالی سەر بە ناوچە و شوێنێکی تایبەتن. لە کۆمەڵگەی جیهانیدا، ناوچەکان و شوێنە تایبەتییەکان بە هیچ شێوەیەك ناتوانن ببنە بەستێنی چالاکیی ڕۆژانە و سنووری ئەم بەستێنانە تەنانەت بۆ هاوسێ دیوار بە دیوارەکانیش نادیارو ناروونە. ناوچەکان و تەنانەت سەرزەوییە نەوتەوەییەکان تەنیا پێگەیەکن بۆ ئەو مرۆڤانەی کە لە پێوەندی و کارتێکەرییە دوو لایەنە پڕژمار و جۆراوجۆرەکان دا دەوریان هەیە و تەنیا ژمارەیەك لەو پێوەندی و کارتێکەرییە دوو لایەنانە لە بیاڤی ناوچەییدا چڕ دەبنەوە.

40- Locality



تایبەتمەندیی ژیان و پێوەندیی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەی بان نەتەوەیی بەرهەمهاتوو لە سوانی سنووری نەتەوەییەکان، کاتێك بە باشترین شێوە دەردەکەوێ کە پێی بڵێین هاوسێیەتیی بێ پێوەندی. دیارە ئەم دۆخە بە پێچەوانەی ئەو شتەی تیۆرە، مۆدێرنەکان باسی دەکەن، نیشانەی ناتەکووزی و ناسروشتیبوونی کۆمەڵایەتی نیە. لە وەها کۆمەڵگەیەك دا خەڵك لە چوارچێوەی پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتیی زۆر چڕدا دەژین و چالاکییەکانی سەر بەم پێکهاتەیە زۆرن و پانتایی جیهانییان هەیە.

توخمە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگەیەکی بان نەتەوەیی، بیاڤە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکانن کە خەڵك لەوان دا نیشتەجێن. ئەم بیاڤانە تەنیا کاتێك یەکتری دەبڕن کە شوێنێکی دیاریکراو بە شێوەیەکی کاتی و بێ دەستێوەردان لە یەکتری دا داگیر دەکەن.

لە ڕاستی دا بیاڤە کۆمەڵایەتییەکان ژمارەیەك خولگەیان هەیە کە لە فەزادا لە قەراخ یەکەوە تێدەپەڕن، بە بێ ئەوەی لێك بکەون. تەنیا یەکەی کۆمەڵایەتیی لە خۆگری هەموو ئەو بیاڤانە خودی کۆمەڵگەی جیهانییە و سنووردارکردنی ئەم بیاڤانە لە چوارچێوەی ناوچە یان سەرەزوییەکی دیاریکراودا ڕەنگە لە ڕاستی دا نەگونجێ (Albrow, 1996: 157).

بە گوتنێکی دیکە پەستێوتراویی فەزا — زەمەن و سەرزەوی سڕینەوەی سەرچاوەگرتوو لەو، سنووری نەتەوەیی و ناوچەییەکان بەرادەیەك لاواز دەکا کە پانتایی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان زیاتر لە پێشوو بان نەتەوەیی و بەستراوەیی کۆمەڵە جۆراوجۆرەکان بە ناوچە و شوێنێکی دیاریکراو بە شێوەیەکی بەرچاو لاواز دەبێ. لە ژێر کاریگەریی ئەو گۆڕانکارییانەی شوێنیان لە سەر جیابوونەوەی کۆمەڵ و کۆمەڵگە لە شوێن و سەرزەوی هەیە، تیۆریگەلێکی نوێ شکڵ دەگرن کە باس لە ڕۆڵی وێنا و خەیاڵ لە ڕاستیی کۆمەڵایەتیدا و جۆرێك دیاردەناسیی ڕادیکاڵ دەکەن. لەم تیۆرانەدا ئەو بزاوتە ئەوپەڕ سنووری و بان نەتەوەییانەی "بیاڤە گشتییە لێك بڵاوەکان" یان لێبەرهەم دێ و دۆخێکی بان نەتەوەیی، بە درێژی تاوتوێ کراوە (Appadurai, 1996: 147).

دەربازبوونی بابەتی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی دەوڵەت — نەتەوە و شکڵ گرتنی کۆمەڵگەیەکەی بان نەتەوەیی، پێویستیی دووبارە پێناسەکردنەوەی پرسە کۆمەڵایەتییەکان دێنێتە پێشێ. لە کاتی دروست بوونی دەوڵەتەوە وەك گرنگترین و بەهێزترین دامەزراوەی سیاسی، بەشی بەرچاوی پرسە کۆمەڵایەتییەکان، وەك پرسی نەتەوەیی لە قەڵەم دراون و لەم ئاستەدا تاوتوێ و شرۆڤە کراون. بەڵام پرۆسەی بەربڵاو و پڕ هەڵپەی بەجیهانیبوون بە خۆش

کردنی بەستێنەکانی سوان و داروخانی روو لە زیادبوونی سنووره نەتەوەییەکان، دووباره پێناسە کردنەوەی پرسە کۆمەڵایەتی — نەتەوەییەکانی وەك پرسگەلی جیهانی کردۆتە پێویستییەك کە خۆی لێ نادرێ. پرۆسەیەکی ئەوتۆ لە رێگای جۆراجۆرەوە خەوشداربوونی دەسەڵاتی نەتەوەیی و کەمبوونەوەی سەربەخۆیی دەوڵەتی لێ دەکەوێتەوە کە بە باشترین شێوە لە توانەوەی ئابوورییە نەتەوەییەکان دا دەردەکەوێ.

ژمارەیەکی زۆر لە تیۆریستەکانی بەجیهانیبوون لەم بڕوایە دان کە سەردەمی دەوڵەت — نەتەوە کۆتایی پێ هاتووە و دەسەڵاتداریی نەتەوەیی لە بەرانبەر پرۆسە ئابووری و کۆمەڵایەتییە جیهانییەکان دا تواناییەکی ئەوتۆی نیە. هێزەکانی بازاڕی جیهانی کە تەنانەت لە بەهێزترین دەوڵەتەکانیش بەهێزترن و وردە وردە سیاسەتی نەتەوەیی و هەڵبژاردنە سیاسییەکان ناکاریگەر و بێ متمانە دەکەن. سەرمایەی گەڕۆك و دابڕاو لە هەر چەشنە بەستراوەییەکی نەتەوەیی، بە تەواوی پێڕەوی یاسا ئابوورییەکانە و رووەدکاتە ئەو کۆمەڵگایانەی زۆرترین سوودی بۆ دابین بکەن و هەر وڵاتێك کە سوودێکی کەمتر بداتە سەرمایە، لەگەڵ چوونە دەرەوەی سەرمایە و لە رێگای ئەویشەوە دابەزینی بایەخی پارەی نەتەوەیی بەرەوروو دەبێ.

ئێستاکە دابەزینی بایی پارەی نەتەوەیی )تەنانەت دۆلاری ئەمریکا) نەك دەرەنجامی هەنگاوە شێتانە پرمەترسییەکان، بەڵکوو دەرەنجامی لێکدانەوە لۆژیکی و راستی بینانەکانی ئەو دامەزراوە داراییانەیە کە خاوەنی پاشەکەوتێکی مەزنی سەرمایەی نەغد و *متمانەپێن*. هەر حکوومەتێك بیهەوێ ستراتیژییەکی جێگیرەوەی دژە دابەزین و *بێ رەمێنی* دانێ و پرنسیپە بنەماییەکانی بازاڕی دارایی جیهانی پشت گوێ بخا، مەترسیی قەیرانی دارایی بۆ خۆی دەکڕێ. رەوتی جیهانیی ئەو سەرمایانەی بە شوێن قازانجی زیاتردا دەگەڕێن ئەوەندە بەربڵاوە کە هیچ حکوومەتێك و تەنانەت ئەو حکوومەتانەش کە هاوئاهەنگیی بەرچاویان هەیە، ناتوانن لە بەرانبەر ئەودا راوەستن و بەر بەو رەوتانە بگرن. بۆ وێنە لە ساڵی ١٩٩٥دا دانوستاندنە پارەییەکانی ناوەندەکانی دارایی جیهانی زیاتر لە یەك تریلیۆن دۆلار لە رۆژدا[واتە] پەنجا جار زیاتر لەبارستایی رۆژانەی بازرگانیی جیهانی بوو (Cable, 1995).

ئەو رەوتە جیهانییە بەرگری هەڵنەگرانە، لە راستی دا بەریان بە گەڕانەوەی سیاسەتی نەریتیی کۆنتڕۆڵی پارە گرتوە. ئەو ئابوورییانەی کە بازاڕە داراییەکانیان لە رایەڵکەی ئیلێکترۆنیك دا ئاوێتە بووە، توانای کۆنتڕۆڵی هاتنەژوورەوە و چوونە دەرەوەی پارەیان نیە و



هەر بەم هۆیە دەتوانین بڵێین کە راکردنی سەرمایە و پارە زۆر بەربڵاو، خێر و سزا هەڵنەگر بووە. تەنانەت هێندێك لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین، هیند یان رووسیە کە ئەوەندە لە ئابووریی جیهانیدا ئاوێتە نەبوون، چارەیەکیان بێجگە لە دابەزاندنی بایی پارە لە پێناوی نەتەوەیی و ئازاد کردنی بایی پارە بۆ کەم کردنەوەی رادەی چوونە دەرەوەی پارە دا نەبووە. ئەم جۆرە راستییانە نیشانەی سەربەخۆتر بوونی ئابووری لە رێکخراوی سیاسیی ژیانی کۆمەڵایەتی و کەمبوونەوەی توانای دەوڵەتن (Parker, 1999: 17).

روویەکی دیکەی پرۆسەی بەجیهانیبوونی سیاسی بریتییە لە لاوازبوونی دەوڵەت و بێ متمانەبوونی ئابوورییە نەتەوەییەکان، خەوشداربوونی سنووری نێوان هەنارده و هاوردە. ئەگەرچی گەلێك ساڵە کە بارستایی و پێکهاتەی هاوردە و هەناردە بە یەکێك لە گرنگترین نیشانەکانی هەڵسەنگاندنی کارکردی ئابووریی حکوومەتەکان دەژمێردرێ، بەڵام پێگەی باڵادەستی کۆمپانیە بان نەتەوەییەکان لە رەوتەکانی بازرگانیی جیهانیدا، مانا و چەمکی هەناردە و هاوردەی گۆڕیوە و ناروونی و داروخانی سنوورەکانی ئابووریی نەتەوەیی زیاتر کردوە. کەواتە کاروبارێکی ئابووریی زۆرتر لە رووبەری دەسەڵاتی دەوڵەت چۆتە دەرەوە.

لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم و مانگەکانی سەرەتای سەدەی بیست و یەکەم دا، دەس نیشان کردن و بەراورد کردنی رادەی هەناردە و هاوردەی وڵاتان زۆر دژوار و تەنانەت نەکراو بوو. چۆن دەتوانرێ بگوترێ هەناردەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تەنیا ئەو کالاّ و خزمەتگوزارییانەن کە لە سنوورەکانی ئەو وڵاتەوە دەچنە دەرەوە یان بریتییە لە بەرهەمی کۆمپانیاکانی سەر بە ئەمریکا لە کانادا، میکزیك و ئەورووپا یان ئەو کالاّ و خزمەتگوزارییانەی کە بەو کۆمپانیا ژاپۆنییانەی لە ئەمریکان فرۆشراون. کەواتە لە دنیایەکی بە تەواوی ئاوێتەبوودا، ئەم جۆرە پرسانە گرنگییەکی ئەوتۆیان نیە و کەڵکەڵەیەك سەبارەت بە رادەی هەناردەی کۆمپانییەکی فرە نەتەوەیی گەورەی وەك مینسۆتا یان هاوسەنگیی بازرگانی نێوان ئینگلستان و سکاتلەند لە گۆڕێ دا نیە.

بارستایی مەزنی بزاوت و جووڵەی جیهانیی سەرمایە و گرنگیی سەرمایەدانانی راستەوخۆی دەرەکی، چییەتی سیاسەتی ئابووریی نەتەوەیی گۆڕیوە. حکوومەتەکان بەردەوام پەرۆشی رکەبەرخوازیی نەتەوەیی یان رکەبەرخوازی لە بواری هەناردە و هاوردە دا بوون و لەو وڵاتانە دا کە ئۆگری نەریتێکی میرکانتیلیستین، ئەم پەرۆشییە لە پرنسیپی پێویستیی بەهێزکردنی هەناردە و کەم کردنەوەی هاوردە دا رەنگی داوەتەوە. بەڵام ئێستاکە رکەبەرخوازی



بە هیچ شێوەیەك لە بنەڕەت دا بابەتێکی بازرگانی نیە و پێوەندیی بە سیاسەتێکەوە هەیە کە ڕەوانی و ڕەوەك بوونی بابەتی ئابووری زیاتر لە پێشوو دەردەخا.

سیاسەتی جێگای باس بەستراوەتەوە بە پێکهێنانی هەلومەرجی لەبار بۆ چالاکییە ئابوورییەکان بە مەبەستی ڕاکێشان و پاراستنی سەرمایەی ڕەوان و بزۆك: هەلومەرجێکی وەك ژێربیناگەلی شیاو، لابردن و چاك کردنی یاسا دەستوپێ‌گرەکان، خستنەرووی هێزی کاری شارەزا و پەروەردەکراو پێکهێنانی جێگیریی دارایی. سیاسەتێکی ئەوتۆ نیشانەی ئەوەیە کە دەوڵەت وەك گرنگترین دامەزراوەی سنوورخولقێن و سنووردارکەر ئیتر ناتوانێ ویستی خۆی بە سەر ئابووریی جیهانی‌خواز و توخمە ڕەوان و ڕەوەکەکانی ئەودا بسەپێنێ.

بەجیهانیبوونی بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوە بە هۆی کۆمپانیە بان نەتەوەییەکانەوە، کاروباری ئابووریی بە چەشنێك ئاڵۆز و ڕەوان کردوە کە دەوڵەتەکان تەنانەت لە بیاڤی نەریتیی هەڵسەنگاندن و وەرگرتنی باجیش دا توانای کۆنترۆڵ کردنی ئابوورییان نیە. زۆر لە سەرمایەداران و کۆمپانییە چەند نەتەوەییەکان بەروو کردنە حەشارگە داراییەکان لە گۆشە و کەناری جیهان، بەراوردی زیادەباییان لە سیستمی بەرهەمهێنانی نێونەتەوەیی‌دا بۆ دەوڵەتەکان زۆر دژوار دەکەن و بیانهەوێ یان نەیانەوێ قەیرانێکی دارایی جیددییان بە سەردا دەسەپێنن. ئەم داماوی و دەستەوەستاوییە نیشاندەری سەرکەوتنی ئابووریی جیهانی بە سەر سیاسەتی نەتەوەیی دایە (Castells, 1997: 246).

دیارە دابەزینی بەرچاوی دەرەتان و توانای دەوڵەت بۆ کۆنترۆڵی ڕەوتە ئابوورییە جیهانییەکان تەنیا لە بوارەکانی دارایی و پارەیی‌دا کورت نابێتەوە. ئێستا ئەوەی کە لە پانتایی بازرگانیی جیهانی‌دا دەدرێ و دەستێندرێ تەنیا کاڵا مادییەکان — کە کۆنترۆڵی ئەوان بۆ دەوڵەت تا ڕادەیەك ساناترە — نین و هەروەك پێشتر باس کرا، ئەو بیاڤانە کە تا ئێستا نابازرگانی بوون و دان و ستاندنیان تێدا نەدەکرا، وردە وردە بە کاروانی بازرگانیی جیهانییەوە پەیوەست دەبن.

ئەوەی کە لە جیهانی هاوچەرخ دا پێی دەگوترێ "ئابووریی کولتووری"، بەشە هێماییەکانی ئابوورییە کە کاڵای نامادی بەرهەم دێنێ و دەی خاتە ڕوو(ڕای دەنێ). ئەم کاڵایانە لە چوارچێوەی سنوورە نەتەوەییەکان دا قەتیس ناکرێن و کۆنترۆڵی ئەوان بۆ دەوڵەت زۆر دژوارە و لەم ڕووەوە بە زەقترین نیشانەی بێ توانایی دەوڵەت لە کۆنترۆڵی فەزا و زەمەن دا دەژمێردرێ. خزمەتگوزارییە ئەندازیاری، حقووقی و ژمێرییارییەکان لەو کاڵا نامادییانەن کە





داهاتی پارەیی بەرچاویان هەیە و لە کۆسپە بازرگانییە نەریتییەکان بە سانایی تێپەڕ دەبن. ئەم چەشنە گۆڕانکارییانە نیشانەی کەمڕەنگتر بوونی ڕۆڵی دەسەڵاتی سیاسی لە پانتایی ئابووری دا و زۆربوونی کەرتی تایبەت و هێزەکانی بازاڕە. بە دەربڕینێکی دیکە بەجیهانیبوون هێزێکی تایبەتیکەرە و کەرتی بان نەتەوەیی و تایبەتی بە زیانی دەوڵەت — نەتەوە و حکوومەتە نەتەوەییەکان بە هێز دەکا. لە ڕاستیدا کەم و نەرم کردنەوەی ڕێوشوێنەکانی کەرتی دارایی و پارەیی، کەم بوونەوەی کۆنترۆڵە پارەییەکان و ئازادیی بازرگانی، جۆرێك ئازادسازیی ئابووریی پێك دێنێ کە بەهێزبوونی کەرتی تایبەتی لــێ‌دەکەوێتەوە (Baker, 1998: 2).

دەربازبوونی زێدەرووی(فزایندە) چالاکی و پرۆسە ئابوورییەکان لە هێژموونی سیاسی، لە لایەنی دیکەشەوە دەسەڵات و دەسەڵاتداریێتیی دەوڵەت دەخاتە ململانێوە. لێك تەنراوییە ئابوورییەکان لە گۆڕەپانی جیهانی‌دا و زێدەبوون و بەربڵاوبوونی ڕەوتە جیهانییەکان، هێندێك کاڵای گشتیی دەوێ کە نە بازاڕەکان ئەوان دەخەنە ڕوو، نە دەوڵەتەکان. ئەم کاڵایانە بریتین لە: جێگیریی دارایی بنەمامەند؛ ستانداردە هاوبەشەکان لە بیاڤەکانی ئۆزۆن و ئەندازەکان، بەڕێوەبەریی ڕایەڵکەکانی پێوەندیی جیهانی وەك گوازتنەوە و گەیاندن (مخابرات) و بەڕێوەبەریی پرسە ژینگەییەکانی وەك ئەتۆمسفێر و ئۆقیانووسەکان. وڵامی شیاو بەم جۆرە پێداویستییانە بەستراوەتەوە بە جۆرێك گۆڕانی دامەزراوەیی سەرووتر لە توانا و دەسەڵاتی دەوڵەتەکان (Sutcliffe, 1995: 325).

بە گشتی ئەم گۆڕانکارییانەی ناویان برا ئەوە دەردەخەن کە دەوڵەت — نەتەوە ناتوانێ بەڕێوەبەرێکی ئابووریی کارلێهاتوو بێ، چونکە چالاکییە ئابوورییەکان زۆر ژوورتر لە بیاڤی دەسەڵاتی دامەزراوەکانی ئەو پەرەیان ئەستاندوە و دامەزراوەگەلێکی نوێ بۆ بەڕێوەبەریی ئەم رووکارەی ژیانی کۆمەڵایەتی سەریان هەڵ داوە. لە چوارچێوەی ئابووریی جیهانی‌دا دەوڵەت — نەتەوەکان دەبنە بەرپرسە ناوچەییەکانی سیستمەکە و ناتوانن بە شێوەی ڕاستەوخۆ کاریگەرییان لە سەر چالاکییە ئابوورییەکانی سەرزەویی ژێر دەسەڵاتیان هەبێ (Tabb, 1997: 20). ئەوان تەنیا دامەزراوە گەلێکن کە لە خزمەتی سەرمایەی جیهانی دان و بنچینە و کاڵا گشتییە پێویستەکانی ئەو سەرمایەیە و ئابووریی جیهانی بە کەمترین تێچوو دابین دەکەن.

لە ڕوانگەی لیبرالیستییەوە، ئابووریی نوێی جیهانی ڕێگا بە کۆمپانی و هێزەکانی بازار دەدا تاوەکوو هۆکارەکانی بەرهەمهێنان بە پێی یاسا ئابوورییەکان و بە بێ دەستێوەردانی دەوڵەت دابەش بکەن. بازرگانیی ئازاد، کۆمپانییە بان نەتەوەییەکان و بازاڕە جیهانییەکانی

سەرمایە، هەڵسوڕێنەرانی کاروباری بەرهەمهێنان و بازرگانیی لە سنوورداربوونە سیاسییەکان دەرباز کردوە و ئەوان دەتوانن هەرزانترین و باشترین بەرهەمەکان بخەنە بەردەست بەکارهێنەرانی جیهان. لە راستیدا پرۆسەی بەجیهانیبوون ئەو بەشە لە ئایدیالە لیبرالییەکان کە بریتییە لە ئابوورییەکی بەدوور لە دەسەڵاتی سیاسیی دەستێوەردەرانە دێنێتە دی (Hirst and Thompson, 1992: 262).

دیارە ژمارەیەك تیۆریستیش هەن کە ئەو قسانەی لە پێوەندییان بەجیهانیبوونی ئابووری و کەمبوونەوەی بەرچاوی توانایییەکانی دەوڵەت لە بواری ئابوورییەوە هەیە ئەوەندە بە راستی بینانە نازانن و تەنانەت بە بێ بنەمایان دادەنێن. لە روانگەی ئەوانەوە ئەگەرچی کارایی و توانایییەکانی دەوڵەت گۆڕاوە و لە زۆربەی بیاڤەکان دا، بە تایبەت لە بیاڤی بەڕێوەبەرێتیی گشتی ئابووری دا زۆر کەم بۆتەوە، بەڵام هێشتاش بە دامەزراوەیەکی گرنگ دەژمێردرێ و لە ئامادەکردنی هەلومەرجی پێویست بۆ دەسەڵاتدارێتیی کاریگەری نێونەتەوەیی‌دا رۆڵێکی سەرەکییان هەیە. ئەم قسەیە دەتوانێ پشت بەم بەڵگانە ببەستێ.

یەکەم، ئەگەرچی لێك تەنراوییە ئابوورییەکان رۆژ بە رۆژ زۆرتر دەبن و رایەڵکە ئابوورییەکان لە سەرانسەری جیهان دا پەرە دەگرن، بەڵام هێشتاش جیهان خاوەنی ئابوورییەکی نێونەتەوەییە نەك سیستمێکی ئابووریی بەجیهانیبوو، بە گوتەیەکی دیکە، ناتوانین زێدەبوونی بێ وێنەی بارستایی بازرگانیی دەرەکی و رەوتە نێونەتەوەیییەکانی سەرمایە بە تەنیایی بە بەڵگەی شکڵ گرتنی دیاردەیەکی نوێ و بێ وێنە بە ناوی بەجیهانیبوون بزانین، کەواتە دەوڵەت – نەتەوەکان هەروا رۆڵی بەرچاویان لە حکوومەت کردن بە سەر کاروباری ئابووری لە ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی دا هەیە.

دووهەم، لە شێوازە نوێ و نوێ باوەکانی دەسەڵاتداری بە سەر بازاڕە نێونەتەوەیییەکان و پرۆسە ئابوورییەکانی دیکەدا، دیسان حکوومەتە بەهێزە نەتەوەیییەکان بەشدارن، بەڵام بە رۆڵی جیاوازەوە. لە جیهانی هاوچەرخ دا، دەوڵەتەکان کارە تایبەتەکانی خۆیان وەك بەشەکانی یەك "شێوە کۆمەڵگەی سیاسی"[41]ی نێونەتەوەیی بەڕێوە دەبەن تاوەکوو دامەزراوە گەلێکی خاوەن دەسەڵاتدارێتی. بەم پێیە کارە تایبەتە سەرەکییەکانی دەوڵەت بریتی دەبێ لە دابین کردنی رەوایی بۆ میکانیسمەکانی حکوومەتی بان نەتەوەیی و ژێرنەتەوەیی و دەستەبەرکردنی ئەرك وەخۆگری لەم جۆرە میکانیسمانە دا.

41- quasi - polity





سێهەم، ئەگەرچی کۆنترۆڵی پاوانکارانەی دەوڵەت بە سەر خاکی ژێردەسەڵاتی خۆی دا، بە هۆی بازاڕە نێونەتەوەیییەکان و راگەیەنە نوێیەکانی پێوەندییەوە کەم بۆتەوە، بەڵام هێشتاش ئەم دامەزراوەیە لە رێگای تەکووزی بەخشین بە حەشیمەتی ژێر حاکمیەتی خۆی دەسەڵاتێکی بەرچاوی هەیە. بەم پێیە دەوڵەتەکان هێشتاش دەتوانن تاقانە دەسەڵاتدار و وتەبێژی رێگەپێدراوی ئەو مرۆڤانە بن کە لە سەرزەویی ژێر دەسەڵاتی ئەوان دا نیشتەجێن (Hirst and Thompson, 1999: 256 – 57).

ئەم جۆرە بەڵگاندنانە تاڕادەیەکی زۆر جێ متمانەن، بەڵام بە هیچ شێوەیەك ناتوانن پرۆسەی بەجیهانیبوونی رامیاری بخەنە بەر پرسیار. ئەگەرچی کۆمەڵگەی مرۆیی لەگەڵ جۆرە ئایدیالییە ئابووریی بەجیهانیبوو دا مەودای زۆری هەیە، بەڵام لە نموونەی ئایدیالیی ئابووریی نێونەتەوەییش تێپەڕیوە. ئابوورییەك کە ئێستا لە جیهان دا دروست بووە، نە ئابوورییەکی بە تەواوی جیهانی بووە و نە ئابوورییەکی بە تەواوی نێونەتەوەییە، بەڵکوو ئابوورییەکی بان نەتەوەییە. بێ گومان لایەنی بان نەتەوەیی ئەم جۆرە ئابوورییە لە پلەی یەکەم دا نیشانەی ئەوەیە کە دەوڵەت پێگەی باڵادەست و پاوانکارانەی خۆی لانیکەم لەبواری ئابووریی ژیانی کۆمەڵایەتیی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی جیهان دا لە دەست داوە و بە گۆڕینی کارە تایبەتەکانی خۆی ناتوانێ رابردووی خۆی قەرەبوو بکاتەوە.

ئەگەر پرۆسەی بەجیهانیبوونی سیاسی لەگەڵ دەرچوونی روو لە زیادبوونی کاروباری کۆمەڵایەتی لە کۆنترۆڵی دەوڵەت و دروست بوون و گەشەی کۆمەڵگەی بان نەتەوەیی بەهاو واتا دابنێین، گومان کردن لە پرۆسەیەکی ئەوتۆدا بە هیچ شێوەیە پەسەند نیە. ئێستاکە رەوتە بان نەتەوەیییەکانی کاڵا، سەرمایە و هێزی کار بە پێوەرێکی بێ پێشینە زیادی کردوەو بەکولتووریبوونی ئابووریی یان زێدەبوونی بەرچاوی دانوستاندنی (گۆڕینەوە)کاڵا هێمایییە خزمەتگوزاری و زانیارییەکان بەگوڕتر دەبێ. بەم پێیە سنوورە نەتەوەیییەکان زیاتر لە پێشوو تەنك دەبنەوە و دەسەڵاتی سیاسی لە بەرانبەر لۆژیکی ئابووریدا کاڵ دەبێتەوە. هەروەها ئابووریی جیهانی بۆ زامن کردن و بەردەوامیی کاری خۆی، خوازیاری هێندێك گۆڕانکاریی دامەزراوەییە کە وڵامدانەوە بەوان لە توانای دامەزراوەی دەوڵەت دا نیە. بەم شێوەیە بە زێدەبوون و بەربڵاوبوونی پێوەندی و چالاکییە ئابوورییە بان نەتەوەیییەکان، کۆمەڵگەی بان نەتەوەیی دروست دەبێ کە بەڕێوەبردن و رێکخستنی ئەو پێویستی بە بەڕێوەبەرایەتی و رێکخراوێکی بان نەتەوەییە.

بێجگە لە ڕەوتە جیهانییەکانی کاڵا، خزمەتگوزاری و سەرمایە، بێ توانایی دەوڵەت لە کۆنترۆڵ کردنی ڕەوتە نائابوورییەکانی دیکەش دا زۆرتر دەبێ. شۆڕشی پێوەندی و دروست بوونی سیستمێکی نوێی دیجیتاڵی، نە تەنیا بۆتە هۆی "مردنی جوگرافیا"، بەڵکوو سنوورە سیاسییەکانیشی لە نێوبردوە. ئەو پێوەندییانەی پشت ئەستوورن بە تەکنەلۆژیای ئەلیکترۆنی وەك مانگیلە، ئینتێرنێت، ڕایەڵکە کامپیوتێرییەکان، تەلەفوون، فاکس و...، هەرچەشنە تەگەرە و سنووردارێتییەکی سروشتی و سیاسی لە نێو دەبەن و هزر و زانیارییەکان بە بێ هیچ کۆنترۆڵێکی سیاسی لە سنوورە نەتەوەییەکان تێ دەپەڕێنن (Holton, 1998: 1).

بێ توانایی دەوڵەت لە کۆنترۆڵ کردنی ڕەوتی جیهانیی زانیاری بە واتای لاوازیی دەسەڵاتی دەوڵەت بە سەر فەزا و زەمەن دایە کە ئەم دامەزراوە مۆدێڕنە ئەوانی لە چوارچێوەی سەرزەویی نەتەوەییدا گەمارۆ دابوو. لە جیهانی هاوچەرخ دا بە هۆی کەمبوونەوەی ئەو تێچووانەی زەمەن و فەزا دەیان سەپاند، فەزا و زەمەنێك بە ڕووی مرۆڤەکان دا کراوەتەوە کە تا ئێستا شیاوی وێناکردن نەبوو. ئەم پانتاییە ئەوەندە بەربڵاوە کە گرینگترین ڕێکخراوی سیاسیی مۆدێڕن بە هیچ شێوەیەك ناتوانێ ڕەوتەکانی نێو ئەو [(جیهانی هاوچەرخ)] سنووردار یان کۆنترۆڵ بکا (Binsbergen, 1999: 298).

ئەگەرچی دەوڵەت هێشتا دەتوانێ ڕەوتە مادییەکان لە سنووری نەتەوەیی و سەرزەویی ژێر دەسەڵاتی دا کەم تا زۆر کۆنترۆڵ بکا، بەڵام کۆنترۆڵی ڕەوتەکانی زانیاریی نێو ڕایەڵکە زۆر ئاڵۆز و جۆراوجۆرەکانی پێوەندییە جیهانییەکان دژوار و لە ڕاستیدا نەلواوە. بە هەر ڕادەیەك کە کۆمەڵگەکان زانیاریتەوەر بن، ڕەوانی و بزۆکیی بابەتی کۆمەڵایەتی زێدەتر دەبێ، پێوەندییە کۆمەڵایەتییە بان نەتەوەییەکان زۆر دەبن و جیایی کۆمەڵگە لە دەوڵەت — نەتەوە زۆرتر دەبێ. بە واتایەکی دیکە، فەزایەکی زۆر بەرین لە بەرانبەر بابەتی کۆمەڵایەتیدا دەکرێتەوە کە تایبەتمەندیی ئەو بزووتن، هەڵوەرین و ڕەوانییە و هیچ سنووردارێتییەك وەخۆ ناگرێ (Castells, 1997: 1).

جگە لە جۆراوجۆری و پڕ ئەژماریی شێوەکان و ئامرازەکانی پێوەندی، تایبەتمەندی و مەیلەکانی ئەوانیش، توانا و دەرەتانی دەوڵەت بۆ چاوەدێری کردنی ڕەوتە ئەوپەڕسنوورییەکان زیاتر لە پێشوو دێننە خوارەوە. یەکێك لە مەیلەکان ناوچەیی بوونی بەرزەرووی ڕاگەیەنەکانە. لە ڕاستی دا هاوڕێك(هاوتەریب) لەگەڵ بەجیهانیبوونی ڕاگەیەنەکان و شکڵ گرتنی ڕایەڵکە زانیاری گەیایەنە جیهانییەکان، ڕاگەیەنە ناوچەییەکانیش بە شێوەیەکی بەرچاو پەرە دەگرن.





گرنگترین نیشانەی ئەم پەرەگرتنە، دامەزرانی ڕایەڵکە ڕادیۆیی و تلویزیۆنییە کابلییەکانە کە خەریکی بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی بەرنامەگەلێك بە زمانە ناوچەییە گونجاو لەگەڵ داب و نەریتی ناوچەیین. ئەم جۆرە ناوچەییبوونانەی ڕاگەیەنەکان و پێوەندییە ئێلکترۆنیەکانیش هەروەك بەجیهانیبوونی ڕاگەیەنەکان، وەك نانەتەوەیی کردن و نادەوڵەتی کردنی زانیاری و بەهێزکردنی ڕەوتە بان نەتەوەیی و ژێرنەتەوەییەکان وایە (Castells, 1997: 259).

تایبەتمەندی و مەیلێکی دیکەی تێکنۆلۆژیی ڕاگەیەنەکان، بچووك و کەسێنی بوونی ئەوانە. ئێستاکە کۆمپانییەکانی بەرهەمهێنەری کەرەستە و ئامرازەکانی پێوەندی و ڕاگەیاندن، بە تایبەت کۆمپانییە ژاپۆنییەکان، سەرکەوتنێکی بەرچاویان لە بچووکتر کردنی بەرهەمەکانی خۆیان دا وەدەست هێناوە. تێکنۆلۆژیی دروست کردنی پارچەگەلی زۆر ورد ئەو دەرەتانەی داوە بە بەرهەمهێنەرەکان تاوەکوو کەرەستە و ئامرازی بچووکتر و سووکتر بخەنە بازاڕەوە. ڕکەبەری بۆ خستنە ڕووی بەرهەمی بچووکتر و هەروەها هەرزانتر، بۆتە هۆی ئەوەی کە ئامرازەکانی وەك مۆبایل، کامپیوتێری تایبەت و ئامێری فاکس بچنە ژمارەیەك ماڵی زۆرترەوە و پرۆسەی کەسێنی بوونی ڕاگەیەنەکان زێدەتر و بەربڵاوتر بێ.

ئەم ئامراز و تێکنۆلۆژییانە مەیلیان لە ئاوێتەبوونیش هەیە. دەیان ساڵ دوای داهێنرانی تەلەفوون، ئەم ئامێرە تەنیا ئامێرێك بۆ ڕاگواستنی دەنگ بوو و بۆ جۆرەکانی دیکەی پێوەندی، ئامێر و ئامرازی تایبەتی وەك ڕادیۆ و تلویزیۆن بە کار دەهێنرا، بەڵام ئێستاکە هەبوونی ئامێرێکی کامپیوتێری کەسێنی "نۆت بووك" کە بە قەت کتێبێکی گەورە قوورسایی و بارستایی هەیە، بۆ دامەزراندنی هەر جۆرە پێوەندییەك لەگەڵ دەوروبەری جیهانی بەسە. پێشکەوتنێکی ئەوتۆ نیشاندەری ئاوێتەبوونی زێدەرووی تێکنۆلۆژییە جۆراوجۆرە دەق تەوەر، دەنگ تەوەر، وێنە تەوەر و تەنانەت وڵام تەوەرەکانە.

ئەم جۆرە مەیل و تایبەتمەندییانە لە بواری تێکنۆلۆژی و ئامرازەکانی پێوەندی دا نەك تەنیا دەستڕاگەیشتنی مرۆڤەکان بە ئامێرەکانی وەرگرتن و ناردنی زانیاری ساناتر دەکا، بەڵکوو سەربەخۆیی ئەوانیش، بە تایبەت لە بەرانبەر دەوڵەت و هەوڵەکانی ئەو دامەزراوەیە بۆ چاوەدێری کردن بە سەر ڕەوتی زانیاریدا زۆرتر دەکا. ئەوان بەرهەم و کاڵاگەلی زۆرتر لە ڕێگای ڕایەڵکە کابڵییەکان یا ڕایەڵکە مانگیلەییەکانەوە وەردەگرن؛ دەرەتانێکی زیاتریان بۆ پەرچەکردرا و وڵامدانەوە بە ڕاگەیەنەکان لە ڕێگای تەلەفوون یان ڕایەڵکە کامپیوتێرییەکانەوە

هەیە و؛ هەروەها دەتوانن بە یارمەتیی دیسکێت یان شریتی کاسێت، کات و نێوەڕۆکی وەرگرتنی زانیارییەکان کۆنترۆڵ بکەن تا نەبنە وەرگرێکی نا چالاك.

هەمووی ئەم گۆڕانکاری و ئامرازە پێوەندییانە، بەستێن دروست کردنن بۆ دروست بوون و زێدەبوونی پێوەندییەکان و دامەزراوە گەلێکن کە بەش و توخمە سەرەکییەکانی کۆمەڵگەیەکی بان نەتەوەیی پێك دێنن و بە گوتەیەکی دیکە، بە هەر رادەیەك کە راگەیەنە گشتییەکان نێوەڕۆکی پێوەندییە مرۆییەکان هێمایی دەکەن، مەوداکانیش کورت دەبنەوە و مرۆڤە زۆر لێك دوورەکانیش لەگەڵ یەکدی پێوەندی دەگرن. دواتر تا جێگایەك کە پێوەندی و دامەزراوە مرۆییەکان لە ئەزموونەوە بن بە زانیاری، کۆمەڵگەی مرۆییش جیهانی دەبێ و لە چوارچێوەی بەرتەسکی سەرزەوییە نەتەوەییەکان واوەتر دەڕوا.

پەرەگرتنی رەوتە جیهانییەکان و شکڵ گرتنی کۆمەڵگەی بان نەتەوەیی، لە بواری شوناس سازییش دا دەوڵەت تووشی گرفت دەکا. بە داڕووخان و تەنك بوونەوەی سنوورە نەتەوەییەکان، سنوورە شوناسییەکانیش تێك دەرووخێن و هێژمونیی بێ ئەملاوئەولای شوناس و کولتووری نەتەوەیی خەوشدار دەبێ (Hall. 1996: 299). وێك کەوتن و هەڵکردنی کولتوورەکان و توخمە شوناس بەخشەکان لە پانتایی جیهانی دا، رێژەیی بوونی شوناسەکانی لـێ‌دەکەوێـتەوە و هەوڵ و تەقەلای زۆر و جۆراوجۆر بۆ نوێژەنکردنەوەی شوناس و سنوورکێشانی شوناسیی نوێ دەست پێ دەکا.

بەڵام لەم بوارە نوێیەدا، دەوڵەت پێگەیەکی ئەوتۆی نیە و هەوڵدان بۆ نوێژەنکردنەوەی شوناسی نەتەوەیی سوودێکی نابێ. لە سەردەمی نوێبوونەوە دا، پرۆژەی شوناس سازی یەکێك لە ئەرکە سەرەکییەکانی دەوڵەت بوو و جێگیربوونی سنووردانانە شوناسییەکان و بیانەسازی، بەرپرسایەتیی شوناس سازیی لە کۆڵ تاك دەکردەوە، بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوونی رەوتی سەرمایە، کولتوور و زانیاری، شوناس سازیی کردۆتە کارێکی تاکەکەسی (Silverman, 1999: 52). ئەوە تاکە دەکەوێتە بەرانبەر هەموو جۆرە توخمێکی شوناس سازەوە کە پلەبەندی و تێکەڵاوکردنی ئەوان بە هیچ شێوەیەك بەرپرسیارێتییەکی نەتەوەیی نیە.

هەر چۆنێك بێ بە سەرنجدان بەوانەی تا ئێستا گوترا، دەتوانین وێنایەکی روونترمان لە پرۆسەی بەجیهانیبوونی سیاسی هەبێ. بە پەستێوتراویی فەزا و زەمەن، بە پانتایی دەوروبەر و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە زیاد دەبێ و جۆرێك کۆمەڵگەی بان نەتەوەیی دروست دەبێ. بە بەرین بوونەوەی دەوروبەری کۆمەڵایەتی، پانتایی باندۆر هەڵگریی تاکەکان زۆر زیاد دەکا و





کارایی مەوداو کۆسپە سروشتی و سیاسییەکان بۆ سنووردارکردنی کاریگەریی کۆمەڵایەتیی دیاردە جۆراوجۆرەکان تاڕادەیەکی بەرچاو کەم دەبێتەوە. بەم پێیە ئەگەری گۆڕانی گرفتێکی ناوچەیی بە پرسێکی جیهانی زیاتر دەبێ و بەو رادەیەش، توانا و دەرەتانی تاك و دەستە جۆراوجۆرەکان بۆ دوورکەتنەوە لە کاریگەرییەکانی دەوروبەری جیهانی کەمتر دەبێ.

لە دۆخێکی ئەوتۆدا نەخۆشییەکی تەشەنەکەری خۆجێیی، پاکژیی جیهانی و سلامەتیی ئەو مرۆڤانەش کە زۆر دوورن لە ناوەندی نەخۆشییەکە دەخاتە مەترسییەوە. پێشکەوتنە تێکنییەکان لە بواری چەکە ناوکی و ناناوکییە کۆمەڵکوژەکان دا ئاشتی و تەناهی دەکەنە پرسێکی جیهانی. هەستیاری جیهانیی ئابوورییە نەتەوەییەکانیش زۆر زیاتر دەبێ و دەرەتانی سنووردارکردنی قەیرانێکی ئابووری لە پانتایی نەتەوەیی و تەنانەت ناوچەییش دا کەم تا زۆر لە نێوچووە.

پرسە ژینگەییەکانیش لە نموونە زەقەکانی بەجیهانیبوونی پرسە کۆمەڵایەتییەکانن. ئێستاکە تەنانەت بچووکترین هۆکارە وەمەترسیخەرەکانی سەرچاوە ژیانەکییەکان رەنگە دەرنجامی جیهانییان هەبێ. گازە ژەهرییەکانی بەرهەمهاتوو لە سووتەمەنییە فوسیلییە کەربۆندارەکان، کون بوونی ئۆزۆن، گەرم بوونی زەوی، پیس بوونی ئۆقیانووسەکان، بارانە ئەسیدییەکان، داروخان، پیسکەرە ژەهرییەکان و کەمبوونەوە و لە نێوچوونی جۆرەکانی روەك و گیاندار، هۆکارگەلێکن کە هەوا، ئاو، خاك و روەك و گیاندارەکانی گۆی زەوی دەخەنە مەترسییەوە (Kellher and Klein, 1999: 113-15).

پرۆسەی بەجیهانیبوونی پرسە کۆمەڵایەتییەکان کە وادێتە بەرچاو دەرکەوتەیەکی بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی نەپساوەیە و نیشاندەری رووکاری تاریکی نوێبوونەوەیە (Lyon, 1999: 44)، کارلـێ‌نەهاتوویی دەوڵەتی نەتەوەیی و رێکخراوی سیاسیی سەر بەو بە تەواوی دەردەخا. لە چوارچێوەی دنیایەکی لێك تەنراودا کە بەشە جۆراوجۆرەکانی ئەو لێك گرێدراوییەکی قووڵ و بەربڵاویان پێکەوە هەیە، بەڕێوەبەریی نەتەوەیی بە تەنیا ناتوانێ لە پرسە کۆمەڵایەتییەکان بگا و رێگاچارەیان بۆ بدۆزێتەوە. پرسە جیهانییەکان رێگاچارە و راوێژی جیهانییان دەوێ و دەسڕاگەیشتن بە رێگاچارە و راوێژی ئەوتۆش پێویستی بە شکڵ گرتن و هەنگاوی دامەزراوە بان نەتەوەیی، نێونەتەوەیی و جیهانییەکان هەیە.

بەم چەشنە دەسەڵاتدارێتیی نەتەوەیی خەوشدار دەبێ، چونکە دەوڵەتەکان ناچارن هێز و دەسەڵاتی پاوانکارانەی خۆیان هاوسەنگ بکەنەوە و مل بۆ پشکداربوونی دامەزراوەکانی دیکە

لە هێز و دەسەڵاتەکان دا راکێشن. بە گوتەیەکی دیکە، پرۆسە و پرسگەلێکی وەك نێونەتەوەییبوونی بازاڕەکان، مەترسیی لە نێوچوون لە ئاکامی شەڕی ناوکی دا، برسێتی، کۆچی نێونەتەوەیی، مافەکان ژنان و کەمایەتییەکان، پرسە ژینگەییەکان و دەیان پرسی بچووك و گەورەی دیکە دەسەڵاتداریێتیی نەتەوەیی سنووردار دەکەن (Dellaporta, 1999: 21).

زەقترین نیشانەی بان نەتەوەیی بوونی پرسە کۆمەڵایەتییەکان و خەوشداربوونی دەسەڵاتداریێتیی نەتەوەیی، شکڵ گرتنی رێکخراو و دامەزراوە جۆراوجۆرە بان نەتەوەییەکانە کە رۆژ بە رۆژ لە زیادبوون دان. بە پێی ئامارە جۆراوجۆرەکان، ژمارەی ئەم جۆرە رێکخراوە و دامەزراوانە لە ماوەی هەشتا ساڵ دا زیاتر لە بیست هێندە زیادیان کردوە. لە کاتێك دا کە لە ساڵی ١٩٠٩دا تەنیا نزیکەی ٢٢٤ رێکخراوی بان نەتەوەیی هەبوو، لە ماوەی ١٩٩١دا ئەم ژمارەیە گەیشتە ٤٩١٧(Rucht, 1999: 210). تەنانەت لە هێندێك لە سەرچاوەکان دا ژمارەی ئەو رێکخراوانە زۆر زیاتر بەراورد کراوە(UIA, 1992: 1671).

رێکخراوە بان نەتەوەیی یان نێونەتەوەییەکان لە بنەڕەت دا دەتوانین بە دوو دەستەی رێکخراوە نێونەتەوەییە دەوڵەتییەکان و رێکخراوە نادەوڵەتییەکان پۆلێن بکەین. رێکخراوە نێونەتەوەییە دەوڵەتییەکان لە پلەی یەکەم دا بەرهەمی هاوکاری و رێکەوتنی دەوڵەتە جۆارجۆرەکانی جیهانن. لەم جۆرە رێکخراوانەدا وەك باوە دەوڵەتە ئەندامەکان بەشداری دەکەن و رۆژەڤ، پلەبەندیی پرسەکان و تەنانەت تێچووەکانی ئەوانیش هەر ئەو دەوڵەتانە دیاری و دابینی دەکەن. لە راستی دا رێکخراوە نێونەتەوەییە حکوومەتییەکان درێژکراوەی دەسەڵاتداریێتیی دەوڵەتە نەتەوەییەکان لە ئاستی بان نەتەوەیی و ئامادەیی ئەوانن.

لە ساڵەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم دا نزیکەی چل رێکخراوی نێونەتەوەیی حکوومەتی هەبوو کە لە درێژایی کات دا ژمارەیان زیادی کردو لە دەیەی نەوەد دا بوونە چەند هێندە. ئەگەرچی ئامار و ئەژماری جۆراوجۆر لەم بارەیەوە هەیە، [بەڵام] جیاوازییەکە جاری وایە دەگاتە چەند هەزار، بەڵام بێ گومان دەتوانین بڵێین لە نێوەڕاستەکانی دەیەی نەوەد دا، سەدان رێکخراوی نێونەتەوەیی حکوومەتی لە جیهان دا هەبووە و بە پڕ هەڵپەبوونی پرۆسەی بەجیهانیبوون ژمارەی ئەو رێکخراوانەوە زیاتر بووە (McGrew, 1996: 88; Rucht, 1999: 210).

بە پێچەوانەی رێکخراوە نێونەتەوەییە حکوومەتییەکان، رێکخراوە نێونەتەوەییە ناحکوومەتییەکان لە راستی دا نوێنەری بەشی تایبەت یان بە واتایەك، کۆمەڵگەی جیهانین. لەوەڕا کە کاڵا، سەرمایە، مرۆڤ، زانست، وێناکان، تاوان، کولتوور، ماددە بێهۆشکەرەکان، مۆد





و بروا، بەسانایی لە سنوورە سەرزەوییەکان تێدەپەڕن و جیهان وەك فەزایەکی کۆمەڵایەتی نوێژەن دەکرێتەوە، جۆرێك هەستی گرێدراوی بە کۆمەڵگەی هاوبەشی جیهانی شکڵ دەگرێ. کەواتە تاك و دەستە جۆراوجۆرەکان لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی جیهان لە هەوڵی چارەسەر و جێ بە جێ کردنی پرسە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگەی جیهانیدا دەبن و رێکخراوە نێونەتەوەییە ناحکوومەتییەکان بۆ رێکخستن و بەردەوامی دان و کاریگەرکردنی ئەم جۆرە هەنگاوانە پێك دێن.

ژمارەی ئەم رێکخراوانەش لە ساڵانی دواییدا زۆر زیاتر لە رێکخراوە نێونەتەوەییە حکوومەتییەکان زیادی کردوە. لە کاتێك دا کە سەرچاوە و ئامارە جۆراوجۆرەکان باس لە هەبوونی چەند سەد رێکخراوی نێونەتەوەیی حکوومەتی وەك ناتۆ، یۆنسکۆ، رێکخراوی بازرگانیی جیهانی، ناتۆ و ... دەکەن، ژمارەی رێکخراوە نێونەتەوەییە ناحکوومەتییەکان بە چەند هەزار مەزندە کراوە. ئەنجوومەنی جیهانی کلیساکان، خاچی سوور، ئەنجوومەنی کۆمەڵناسان و دەیان رێکخراوی پێوەندیدار بە مافی مرۆڤ و ژینگە، نموونەگەلێکن لە رێکخراوەکانی جۆری دووهەم کە بەستراوەیی و پێوەندیی بان نەتەوەییان هەیە.

بە گشتی رێکخراوە نێونەتەوەییەکان لە بیاڤە جۆراوجۆرەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتووری و سیاسیدا چالاکن. هێندێك لەوان رۆڵی رێکخستنی کارکردی سیستەمی جیهانییان لە ئەستۆ دایە و پێوەندییە بان نەتەوەییەکان رێك دەخەن. ئەو رێکخراوانە زۆرتر لە خزمەتی ئاسانکاری و رێکخستنی رەوتە جیهانییەکان دان و لەم رووەوە دۆخی ئێستا دەپارێزن و بەردەوامیی پێ دەبەخشن. زۆر لە رێکخراوە نێونەتەوەییە پسپۆڕییەکان و رێکخراوە ئابوورییەکانی وەك رێکخراوی بازرگانیی جیهانی و بانکی جیهانی دەتوانین بخەینە ریزی ئەم جۆرە رێکخراوانەوە.

چالاکییەکانی دەستەیەکی دیکە لە رێکخراوە نێونەتەوەییەکان رووی لەو هۆکار و دۆخانەیە کە کۆمەڵگەی جیهانی دەخەنە مەترسییەوە و تەناهی و هێمنایەتیی دانیشتووانی ئەو بە شێوەی جۆراوجۆر دەشوێنن. ئەم جۆرە رێکخراوانە جگە لە کارئاسانی و رێکخستنی رەوتەکان و پێوەندییە بان نەتەوەییەکان، بە مەبەستی نەهێشتنی کەموکووڕییەکان و پێکهێنانی گۆڕانکاریی پێویست لە رێکخراو و بەرێوەبەریی ژیانی کۆمەڵایەتیدا ململانێ لەگەڵ دۆخی ئێستا دەکەن. رێکخراوە جۆراوجۆرەکانی پێوەندیدار بە مافی مرۆڤ و ژینگە دەتوانین لە ریزی گرنگتر و کاریگەرترین نموونەکانی ئەم دەستەیە لە رێکخراوەکان دا دانێین.

هەر چۆنێك بێ ئەگەرچی رێکخراوە نێونەتەوەییەکان لە لایەنی بەستراوەیی بە حکوومەتەکانەوە، بیاڤی چالاکی، ئامانجەکان، پانتایی چالاکی و رادەی گرنگی و کاریگەرییەوە زۆر جۆراوجۆرن، بەڵام لایەنی هاوبەشیشیان هەیە. شکڵ گرتن و پەرەگرتنی ئەم جۆرە رێکخراوانە نیشانەی ئەوەیە کە لە ئاکامی پرۆسەی بەجیهانیبوون دا، رەوتە بان نەتەوەییەکان و رایەڵکە جیهانییەکان زۆرتر و بەربڵاوتر دەبن، جیهان دەبێتە فەزایەکی کۆمەڵایەتیی یەکگرتوو کە بەڕێوەبردن و رێکخستنی ئەو لە توانای دەوڵەت بەدەرە.

بە کورتی پرۆسەی بەجیهانیبوون بە دەربازکردنی بابەتی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوە و بیاڤی ژێر چاوەدێریی دەوڵەت — نەتەوە بۆتە، هۆکاری گۆڕین و هاوسەنگ کردنی پێکهاتە سەرەکییەکانی دەوڵەتی مۆدێڕن. بە دەربڕینێکی روونتر، ئەم پرۆسەیە بە کەمڕەنگتر و ناسکتر کردنی سنوورە نەتەوەییەکان، توانایی و لێهاتوویی دەوڵەت کەم دەکاتەوە، شکڵ و پێکهاتەی ئەو دەگۆڕێ و سەربەخۆیی ئەو خەوشدار دەکا و لە هێژمونی و رەوایی ئەو کەم دەکاتەوە.

لە دۆخێك دا کە سەرمایە، کاڵا، زانیاری و توخمە کولتوورییەکان بە سانایی لە سنوورە نەتەوەییەکان واوەتر دەچن، پانتایی شوێنهەڵگریی هاووڵاتیان لە سنوورە نەتەوەییەکان تێدەپەڕێ و دەوڵەتەکان ناتوانن بەبێ خۆگونجاندن لەگەڵ سیستمی نێونەتەوەیی، وڵامی ویستەکانی هاووڵاتییانی خۆیان (بۆ وێنە لە پێوەندی لەگەڵ ژینگە دا) بدەنەوە. هەروەها بەگوڕتربوونی بەجیهانیبوون، کارلێهاتوویی و کاریگەریی ئامرازە نەریتییەکانی سیاسەت (بە تایبەت هێزی سیاسی) کەم دەکاتەوە و پەنا بردن بۆ رێگا و ئامرازەکانی دیکە بۆ وێنە ئابووریی و کرداری کۆیی دەسەپێنێ و بەم چەشنە توانا و لێهاتوویی دەوڵەت بۆ کۆنتڕۆڵی چارەنووسی خۆی کەم دەبێتەوە.

زێدەبوونی ژمارەی رێکخراوە نێونەتەوەییە حکوومەتییەکان و سیستمە نێونەتەوەییەکان، شکڵی نەریتیی دەوڵەت دەگۆڕێ، چونکە سەروەریی نەتەوەیی بە شێوەگەلی جۆراوجۆر و بە هۆی دامەزراوە نێونەتەوەییەکان لەوپەڕ سنوورە نەتەوەییەکان بەردەوام دەبێ و دەچەسپێ. ئەم گۆرانکارییانە بە واتای نێونەتەوەییبوونی دەوڵەتن کە بڕیاردانی کۆیی و رێکخراوی نێوان حکوومەتەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکان دەکەنە شتێکی بێ ئەم لاوئەولا. لە بیاڤی دانانی سیاسەت نێوخۆییش دا دەوڵەتەکان ناچارن بە سیاسەتە خۆش بژی سزاییە پارە تەوەرانەکان دا بچنەوە یان وەلای نێن، چونکە تەوژمە جیهانییەکان لەگەڵ ئەم جۆرە سیاسەتانە ناگونجێن، بەم پێیە سەربەخۆیی دەوڵەت زۆر کەم دەبێتەوە.





کەمبوونەوەی توانایی و سەربەخۆیی دەوڵەت، کارلێهاتوویی دەوڵەت کەم دەکاتەوە و رەوایی و هێژمونیی دەوڵەت نەتەوە لاواز دەکا. بە گوتەیەکی دیکە، رەوت و رایەڵکە جیهانییەکانی سامان، زانیاری و هێز، بە جۆرێك گۆڕەپان لە دەوڵەت بەرتەسك دەکەن، کە توانای بە جێ گەیاندنی بەڵێنەکانی خۆی، بە تایبەت بەڵێنەکانی[بۆ دابین کردنی] خۆش بژی نەبێ. بەم پێیە رەوایی دەوڵەت رۆژ بە رۆژ کەم دەبێ و بە شوێن ئەوانیش دا تەنانەت متمانە و بایەخی سیستمی سیاسیی لیبراڵ دیمۆکراتیکیش دەکەوێتە بەر پرسیار (Castells, 1997: 343).

بەم چەشنە پرۆسەی بەجیهانیبوون، هێزگەلێك ئازاد دەکا کە دەست دەنێتە دەستی یەکەوە تا ئازادیی کاری حکوومەتەکان و دەوڵەتەکان بە کەمڕەنگ کردنی سنوورەکانی سیاسەتی نێوخۆیی، گۆڕینی دۆخی بڕیاردانی سیاسی، گۆڕینی بەستێنی دامەزراوەیی و رێکخراوەیی کۆمەڵگە سیاسی نەتەوەییەکان، گۆڕینی چوارچێوەی یاسایی و بەڕێوەبەری حکوومەتەکان و لێڵ کردنی هێڵ و سنوورەکانی بەرپرسایەتی و وڵامدەریی دەوڵەتە ناوچەییەکان سنووردار بکەن (Held, 1991: 222).

دیارە پرۆسەی بەجیهانیبوون تەنیا لە پێناوی کەم کردنەوەی توانایی دەوڵەت دا کار ناکا و تاڕادەیەك بوار بۆ بەهێزکردنی ئەویش ئامادە دەکا. لە دنیای ئێستادا، دەوڵەت لەگەڵ ئەوەی کە لە دامەزراوەیەکی خاوەن هێز و دەسەڵاتدارێتیی پاوانکارانەوە بۆتە یاریکەرێکی ستراتیژیك، بەڵام هێشتاش دەتوانێ بەرپرسایەتیی خۆی بۆ پاراستن و بە دواداچوونی بەرژەوەندیگەلێکی دیاریکراو لە چوارچێوەی سیستمێکی جیهانی لێك تەنراودا لە رێگای دەسەڵاتدارێتیی هاوبەشەوە بەڕێوەبەرێ (Castells, 1997: 307).

بەجیهانیبوونی سیاسی هەر لەم کاتە دا کە کاریگەری و شوێندانەریی هێزی سوپایی لە سیاسەتی نێوخۆیی و دەرەکی دا دادەبەزێنێ، توانای دەوڵەت زیاد دەکا. بە گوتەیەکی دیکە بە کارهێنانی کەمتری هێزی سوپایی بۆ پاراستنی ئاشتی، بە واتای دابەزینی گرنگیی ئەو و لە ئاکام دا دابەزینی گرنگیی دەوڵەت نیە. دەوڵەتەکان هێشتاش کەم تا زۆر هێزی سوپایی پاوانکارانەیان هەیە و لەم رووەوە بە دامەزراوە سەرەکییەکانی سیستمی جیهانی دەژمێردرێن.

شکڵ گرتن و پەرەگرتنی رێکخراوە و رێژیمە نێونەتەوەییەکانیش ناتوانین بە بەڵگەی لاوازی و بێ توانایی دەوڵەت دانێین. ئەم جۆرە رێکخراوانە لە هەمان کات دا کە دابەش کردنی دەسەڵاتدارێتیی نەتەوەییان لـێ دەکەوێتەوە، بەستێنەکانی هاوکاریی نێونەتەوەییش ئامادە دەکەن. دەوڵەتەکان دەتوانن لە رێگای ئەو هاوکارییە نێونەتەوەییانەی ئەو رێکخراوانە دابینی

دەكەن چاوەدێری و كۆنترۆڵێكی زیاتریان، بە سەر نیشتمانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان دا هەبێ و لەگەڵ هۆكارەكانی تێكدانی تەكووزیی نێونەتەوەیی بەربەرەكانی بكەن.

هەروەها دەبێ ئەم خاڵە لە بەر چاو بگیرێ كە لێك تەنراویی بەرهەمهاتوو لە پرۆسەی بەجیهانیبوون تەنیا خەسارهەڵگریی دەوڵەتی لێناكەوێتەوە. بە هەر رادەیەك كە رایەڵكە گرێدەرەكانی بەشە جۆراجۆرەكانی جیهان گشتگیرتر و بەهێزتر بن، هەستیاریی دەوڵەتەكان سەبارەت بە رووداوەكان یان كردارە دەرەكییەكانیش زێدەتر دەبێ. هەر ئەم هەستیارییە زێدەڕوویە(فزاینده) دەتوانێ دەوڵەتەكان ناچار بكا تا بە گۆڕینی پێكهاتە و چیەتیی خۆیان، هەروەك دامەزراوەگەلی خاوەن دەسەڵاتداریێتیی هاوبەش، توانایيە حكوومەتییەكانی خۆیان زۆرتر بكەن (McGrew, 1996: 92 – 94).

لە كۆتایی دا، بە سەرنجدان بە پرۆسەیەكی دیالكتیكیی كە هەڵگری لاوازكردن و بەهێزكردنی دەوڵەتە و بۆ خۆپاراستن لە هەر جۆرە دژوازی بێژییەك، دەبێ ئەم خاڵە وەبیر بهێنرێتەوە كە پرۆسەی بەجیهانیبوونی سیاسییش وەك پرۆسەی بەجیهانیبوونی ئابووری، تەنینەوەیەكی نایەكسانی هەیە. ئەگەر بەجیهانیبوون بە پرۆسەیەك دابنێین كە بەستراوەی پەستێوتراوی، رەوانی، رەوت، تەنینەوە، سنوورسڕینەوە و بزاوت و راگواستنی خێرایە ، ئەو بەشانە لە ژیانی سیاسی دا جیهانیتر دەبن كە بەستینمەندییەكی كەمتریان هەبێ و پێوەندیان لەگەڵ بەستێن و شوێنێكی سنووردار و دیاریكراو لاواز و سست بێ. بە گوتەی گیدێنز بە هەر رادەیەك پێوەندی و كردارە سیاسییەكان لە بەستێن سڕدرابێتەوە، هەر بەو رادەیە جیهانی دەبن.

پرۆسەی بەجیهانیبوون هەر لەم كاتەدا كە كۆنترۆڵی دەوڵەت بە سەر فەزا و زەمەن دا زۆر كەم دەكا، ئەوەندە لە توانایی ئەم دامەزراوەیە بۆ نواندنی هێز لە نیشتمانێكی دیاریكراودا و پاراستنی سنوورەكانی كەم ناكاتەوە. كەواتە سیاسەت هەر بەو رادەیەی كە لە نیشتمان دەسڕدرێتەوە، جیهانیش دەبێ. لە بیاڤەكانی كولتووری سیاسی دا كە دانوستاندنی كۆمەڵایەتی شێوەی هێمایی بە خۆیەوە دەگرێ، سنوورە سروشتی و سیاسییەكان لە بەرانبەر ئەم جۆرە دامەزراوانە دادەبەزن و فەزای جیهانی دەبێتە بواری شكڵ گرتن و نوێژەن بوونەوەی دامەزراوە و پێوەندییە كۆمەڵایەتییە بان نەتەوەییەكان. بەڵام لەو بیاڤانەدا كە پێوەندی و كردارە كۆمەڵایەتییەكان بەستێنمەند و ماددیترن، دەوڵەت هێشتا توانای چاوەدێرانە و سنووردارکەرانەی بەرچاوی هەیە.



## بەجیهانیبوونی كولتووری

هەروەك گوترا، بەجیهانیبوون بریتییە لە پرۆسەی پەستێوتراویی فەزا و زەمەن، بچووكبوونی دیاردەناسانەی جیهان و شكڵ گرتنی كۆمەڵگەی جیهانی. بە گوتەیەكی دیكە، دەتوانرێ بەجیهانیبوون بە دابەزینی بەرچاوی ئەو تێچوو و سنووردارێتییانە دابنرێ كە فەزا و زەمەن بە سەر ژیانی كۆمەڵایەتیدا دەسەپێن. بەهەر رادەیەك تیچووەكان و سنووردارێتییە ناوبراوەكان كەم بنەوە، بەربڵاویی ژیانی كۆمەڵایەتی و بارستایی و چڕیی پێوەندی و كردراە كۆمەڵایەتییەكان زیاد دەكا. دەتوانین پێشكەوتووترین و كامڵ ترین قۆناخی بەجیهانیبوون بە نوێژەن كردنەوەی تەواوی پێوەندی و كردارە كۆمەڵایەتییەكان لە پانتایی جیهانی دا و پێوەندیی تاك و كۆمەڵگە لەم پانتاییە دا دانێین.

لەم روانگەیەوە، بەجیهانیبوون هاوتایە لەگەڵ لاوازی، داروخان و دارمانی هەر چەشنە سنوورێك كە بەر بە پێوەندیی تاك و كۆمەڵگە لەو پانتاییەدا بگرێ یان سنووورداری بكا و كۆسپی بۆ دروست بكا. جوغرافیا، سیاسەت و كولتوور هەمیشە گرنگترین هۆكاری سنوور خولقاندن لە بەرانبەر بەرینخوازی و جیهانگەرایی بابەتی كۆمەڵایەتی دا بوون و پێوەندیی كۆمەڵایەتییان لە رووبەرە ناوچەیی و نەتەوەییەكان دا گەمارۆ داوە. بەم پێیە هەر گۆڕانێك كە "مردنی جوغرافیا"ی لێبكەوێتەوە، توانایی سنووردارکەرانەی دەوڵەت دادەبەزێنێ و داخراوەیی كولتووری كەم بكاتەوە، هۆكارێكی جیهانیساز، سنوورلابەر و ئاوێتەكەرە.

لە بیاڤی ئابووریدا، شكڵ گرتنی ئابوورییەكی بان نەتەوەیی، بە هێما و وێنای تێك رمان و داروخانی سنوورەكان و كۆسپەكانی بەرینبوونەوە و جیهانداگربوونی ژیانی كۆمەڵایەتی دەژمێردرێ. لە ساڵانی دوایی دا، شۆڕشی پێوەندییەكان و پێشكەوتنە سەر سوورهێنەرەكانی بواری پێوەندی و راگوازتن، ئەم دەرەتانەی بۆ سیستمی سەرمایەداری پێك هێناوە تا ئاواتی لە مێژینەی خۆی بێنێتە دی و ببێتە سیستمێكی جیهانی. ئێستاكە و بە تایبەت لەو بەشە ئابوورییانە دا كە دانوستاندن لە رێگای دامەزراوەكان و هێما و نیشانەكان، وەك كاروباری پارەیی و دارایی و خزمەتگوزاریی زانیاری ئەنجام دەدرێ، سنوورە نەتەوەییەكان گرنگییەكیان نیە و لێك تەنراوی و لێك گرێدراویی بەرانبەری ئابووری لە پانتایی جیهانی دا بە چەشنێك بەگوڕتر و بەهێز بووە كە هیچ جۆرە دوورەپەرێزی و پەراوێزبوونێك وەخۆناگرێ.

بەجیهانیبوونی سیاسییش گرێدراوی ئەو هۆكار و پرۆسانەیە كە بە دەربازكردنی بابەتی كۆمەڵایەتی لە پانتایی سنووورداری دەوڵەت — نەتەوە، بەستێنەكانی شكڵ گرتنی كۆمەڵگەی

بان نەتەوەیی ئامادە دەکەن و توانایی دەوڵەت بۆ پاراستنی سنوورە نەتەوەییەکان و بەرگرتن بە رەوتە بان نەتەوەییەکان کەم دەکەنەوە. بەم پێیە دامەزراوەی دەوڵەت لە بە جێ گەیاندنی ئەرکەکانی خۆی تووشی گرفت دەبێ و رادەیەکی زۆرتر لە هێز و دەسەڵاتی خۆی بە رێکخراوە نێونەتەوەییەکان دەدا. کەواتە هەم لە بیاڤی ئابووری دا و هەم لە بیاڤی سیاسی دا، سنوورەکان کەم تا زۆر تێك دەڕووخێن و رایەڵکە گەلێك لە رەوتە جیهانییەکان شکڵ دەگرێ کە دەرەنجامەکەی لێك تەنراوی، ئاوێتە بوون و هاوچەشنیی زێدەروویە لە پانتایی جیهانی دا.

بە سەرنجدان بەم باسە، دەتوانین بەجیهانیبوونی کولتوورییش بە لە خۆگری ئەو پرۆسە و هۆکارانە بزانین کە هەر جۆرە سنووردارکردنێکی کولتووریی ژیانی کۆمەڵایەتی هاوسەنگ دەکەن یان لە نێو دەبەن، بە گوتەیەکی دیکە بەجیهانیبوونی کولتووری بریتییە لە شکڵ گرتن و پەرەگرتنی کولتوورێکی تایبەت لە پانتایی جیهانی دا، ئەم پرۆسەیە شەپۆلێك لە هاوچەشنیی کولتووری لە جیهان دا دروست دەکا و رووبەڕووی هەموو کولتوورە تایبەتەکان دەبێتەوە. پرۆسەی بەجیهانیبوون لەگەڵ ئەوەی کە ئابوورییەکی جیهانی و کۆمەڵگەیەکی بان نەتەوەیی دروست دەکا، کولتوورێکی جیهانییش بەدی دێنێ.

وێنا و هزری کولتووری یەکگرتووی جیهانداگر رابردوویەکی درێژی هەیە. لە ئیمپراتۆریا کۆنەکانی وەك چین یان رۆم دا بەرنامە و مەیلێکی ئەوتۆ هەبووە. ئایینە جیهانییەکانی وەك مەسیحییەت و ئیسلام روویان لە هەموو مرۆڤەکان بووە و کەڵکەڵەی جیهانداگر بوونیان هەبووە. کۆڵەکەی ئامانجەکانی سوسیالیستەکانی وەك سێن سیمۆن شکڵ گرتنی کۆمەڵگە و کولتوورێکی جیهانی بوو. بزووتنەوە جۆراوجۆرەکانی خوازیاری دامەزراندنی ئاشتیی جیهانی و بەرنامەکانی پێوەندیدار بە برەودان بە زمانە نێونەتەوەییەکانی وەك سپرانتۆیش پێوندییان بە وێنای کولتووری جیهانییەوە هەبووە. هەمووی ئەمانە، سەرەڕای جیاوازییەکانیان نیشانە زەقەکانی ئۆگری بە کولتووری جیهانی و هەوڵ بۆ هێنانەدی و برەودان بەون.

بەڵام باسەکانی ئێستا سەبارەت بە کولتووری جیهانی کە یەکێك لە بابەتە بەرچاوە گەنگەشەهێنەرەکانی گوتارە رووناکبیری و رەخنەییەکانی دەیەی نەوەدن، باس گەلێکی جیاوازن. ئەوان نەك بە ئامانج و ئاواتی شکڵ گرتنی کولتووری جیهانی، بەڵکوو پێوەندییان بە پرۆسە هاوچەشن سازەکان لە بواری کولتوورەوە هەیە. بە گوتەیەکی دیکە لە بەستێنی پرۆسەی بەجیهانیبوون دایە کە باسەکانی ئێستا سەبارەت بە کولتووری جیهانی یان بەجیهانیبوونی



کولتووری گرنگییەکی جیاوازیان هەیە؛ باس گەلێك کە زۆرتر لە سەر رووکارە ناشیرین و مەترسیدارەکانی پرۆسەیەکی ئەوتۆ پێ دادەگرن.

ئەگەرچی هەڵسەنگاندن و روانگەی زۆر و جۆراوجۆر لەبارەی بەجیهانیبوونی کولتووری و شێوازی شکڵ گرتن و تەنینەوەی کولتووری جیهانی لە گۆڕێ دایە، بەڵام بە گشتی دەتوانین لەم بارەیەوە سێ لایەنی گشتی دەس نیشان بکەین و باسیان لێوە بکەین. ئەم لایەنانە بریتین لە پەرەگرتنی نوێبوونەوە (مۆدێرنیتە)ی رۆژئاوایی، پەرەگرتن و جیهانگیربوونی کولتووری بەکارهێنەرکیی سەرمایەداری و بەجیهانیبوونی کولتووری ئەمریکایی. لە دێڕەکانی دواتردا، بە کورتی باس لە تایبەتمەندییەکانی هەر سێ لایەنی بەجیهانیبوونی کولتووری دەکەین.

دەتوانین جیهانگیربوونی تایبەتمەندییە تەوەرییەکانی نوێبوونەوە بە زەق ترین رووکاری بەجیهانیبوونی کولتووری دانێین. ئەم تایبەتمەندییانە بریتین لە زنجیرەیەك دامەزراوە و شێوازی هەڵسوکەوت (ئاکار) کە دوا بە دوای لێك بڵاوبوونی سیستمی فیۆداڵی لە ئەورووپای رۆژئاوا شکڵی گرت و لە ماوەی چەندین دەیەدا بۆ هێندێك شوێنی دیکەی جیهان لەوانە ئەمریکای باکوور، ئۆقیانووسییە و ژاپۆنیش گوازرانەوە. بە دەست پێ کردنی سەدەی بیستەم، پرۆسە تەنینەوەی کولتوور و ژیاری رۆژئاوایی بە هەڵپە و توندییەکی زۆرتر درێژەی کێشا و لە نیوەی دووهەمی سەدەش دا بە هۆی پێشکەوتنە بەرچاوەکانی بواری پێوەندییەکان، دیسان پڕ هەڵپەتر و بە گوڕتر بوو.

یەکێك لە تایبەتمەندییە بنەماییەکانی نوێبوونەوە بریتییە لە سنعەتگەرایی کە بە جۆرێك رێکخراوی ئابووری— کۆمەڵایەتی دەژمێردرێ. لە چوارچێوەی ئەم رێکخراوەدا، هێزی ماددی و ئامێرە ماشینییەکان بە شێوەیەکی بەرین لە پرۆسەکانی بەرهەمهێنان دا بە کار دەبردرێ و بەرهەمهێنان بە لایەنی ناوەندییانە، کارگەیی یا فرە و پسپۆڕییانە بە خۆیەوە دەگرێ تاوەکوو لەگەڵ ئەم جۆرە چالاکییە ئابوورییە و پرۆسەی بەرهەمهێنان گونجاو هاوچەشن بێ.

دیارە سنعەتگەرایی دەکەوێتە چوارچێوەی سیستمێکی ئابووری— کۆمەڵایەتیی گشتگیرترەوە کە تایبەتمەندییەکی دیکە و لایەنی بنەمایی نوێبوونەوە پێك دێنێ. ئەم سیستمە، ناوی سەرمایەدارییە و لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمەوە بووەتە سیستمێکی ئابووری— کۆمەڵایەتیی باڵادەست لە رۆژئاوادا. سەرمایەداری جۆرێك سیستمی کاڵاییە کە بازاڕەکانی بەرهەمهێنانی رکەبەرانە و کاڵایبوونی هێزی کار دەگرێتە خۆی. بە دەربڕینێکی دیکە لەم سیستمەدا هەموو بیاڤەکان و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە پێوەندی لەگەڵ

بەرهەمهێنانی کاڵایی دا نوێژەن دەکرێنەوە و توانایی ئابووریی دەبێتە گرنگتر پێوانەی بایەخ لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا.

سێهەمین تایبەتمەندیی نوێبوونەوە بریتییە لە دامەزراوەکانی چاوەدێری و کۆنترۆڵ. ئەم دامەزراوانە کۆڵەکە و بنەمای زێدەبوونی بەگوڕی هێزی ڕێکخراوەیین کە پێوەندییان بە دەرکەوتنی ژیانی کۆمەڵایەتیی مۆدێرنەوە هەیە. چاوەدێری کۆنترۆڵی چاوەدێرانەی مرۆڤە جۆراوجۆرەکان دەگرێتەوە کە کۆمەڵگە جۆاوجۆرەکان دا دەژین. کۆنترۆڵێکی ئەوتۆ یان لە ڕێگای ئەو شتەی فۆکۆ چاوەدێریی "ڕاشکاوانە"ی ناو لـێ‌دەنێ، دەلویێ یان بە کەڵك وەرگرتن لە جۆرەکانی زانیاری[بەڕێوەدەچێ]. هەر چۆنێك بێ لە هەر دوو حاڵەت دا، مەبەست ئەوەیە کە تەکووزییەکی تایبەت بە سەر خەڵك دا زاڵ بێ و جۆرێك هاوئاهەنگی لە نێوان چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان دا دامەزرێنێ (Giddesn, 1991: 15).

دەوڵەت– نەتەوە وەك شکڵێکی کۆمەڵایەتیی جیاوازییش لە توخمە تایبەتمەندییەکەرەکانی نوێبوونەوەیە. ئەم دامەزراوەیەش کە بۆ یەکەم جار لە ڕۆژئاوا پێك هات، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی– سیاسییە و جیاوازیی بنەڕەتیی لەگەڵ زۆربەی سیستەمە کۆمەڵایەتییە نەریتییەکان هەیە. گرنگترین لایەنی جیاکەرەوەی دەوڵەت– نەتەوە ئەوەیە کە لە سەر ڕووبەرێکی نیشتمانیی بە تەواوی دیاریکراو و سنووردار دا جێگیرە، توانایی چاوەدێری و کۆنترۆڵی تایبەتی هەیە و ئامرازە کاریگەرەکانی توندوتیژی دەخاتە پاوانی خۆیەوە. لە ڕاستی دا دەوڵەتی مۆدێرن جۆرێك سیستەمی چاوەدێرییە کە سیاسەتگەلێکی کولتووری لە پانتاییەکی ژێئۆپۆلێتیك دا دەگرێتەبەر و بەڕێوەیان دەبا.

بێجگە لەوانە، دەتوانین هێندێك تایبەتمەندیی دیکەش بۆ نوێبوونەوە دەستنیشان بکەین کە پێوەندییان بە سیستەمی سەرمایەداری و دەوڵەتی مۆدێرنەوە هەیە. دەوڵەتی مۆدێرن پابەندی دێمۆکراسی، هاووڵاتێتی و نەتەوەگەراییە و بۆ پەرەپێدانی ئەم بایەخانە تێ‌دەکۆشێ. سیستەمی سەرمایەدارییش پابەندی ئاوەزمەندێتیی ئامێری، قازانج تەوەری، تاك گەرایی و سامان کۆکردنەوەیە. لە پەنا ئەم تایبەتمەندییانەدا دەبێ ئاماژە بە پەرەگرتن و جیهانداگربوونی زمانە ئەورووپاییەکان بە تایبەت ئینگلیسی، نموونەکانی پۆشین (جل و بەرگ)، خۆراك و میعماری، ژیانی شارییانە و سنعەتی و زنجیرەیەك بایەخی کولتووری لەبارەی ئازادیی تاکەکەسی، پێوەندییە ڕەگەزییەکان، مافی مرۆڤ و سکۆلاریزمیش بکرێ (Tomlison, 1999: 23).



هەروەك پێشتر باس کرا، ئەم جۆرە تایبەتمەندییانە — کە ژمارەیان زیاتر دەبێ — بۆ یەکەم جار لە ڕۆژئاوا شکڵیان گرتووە و پەرەیان ئەستاندوە، بەڵام نەك هەر هیچ جۆرە پێوەندییەکی ناخییان لەگەڵ ئەم چوارچێوە جوغرافیاییە نەبووە، بەڵکوو هێندێك لەوان لە ناخیان دا پەرەخواز و کۆیی بوون. بەم پێیە نوێبوونەوە ئەگەرچی لە ڕۆژئاوا شکڵی گرت و تایبەتمەندیی بە کولتوور و شارستانەتیی ڕۆژئاوا بەخشی، بەڵام کەم تا زۆر مەیلێکی جیهانی بووە و هێندێك لە توخمەکانی ئەو، بە تایبەت سیستەمی سەرمایەداری، دوای شکڵ گرتن بە خێرایی پەرەیان گرت.

پەرەگرتنی نوێبوونەوە لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان لە ماوەی چەند دەیەدا بەردەوام بوو، بەڵام لە سەدەی بیستەم دا و بە تایبەت لە دەیەکانی دواییدا، هەڵپە و تاوێکی زۆرتری هەڵگرت. لەم ڕووەوە دەتوانین بەجیهانیبوون بڵێین بەجیهانیبوونی نوێبوونەوە یان بە واتایەك بەجیهانیبوونی کولتووری و ژیاری ڕۆژئاوایی دابنێین. لە سەر بنەمای ڕوانگەیەکی ئەوتۆ، هێندێك لە تیۆریستەکانی بەجیهانیبوون لەم بڕوایە دان کە پڕۆسەی بەجیهانیبوون تەنیا ئاوێتەبوونی ئابووریی جیهانی لـێ‌ناکەوێتەوە. بەڵکوو جۆرێك هاوچەشنیی کولتووریشی لە گەڵ دایە، بەڵام ئەم هاوچەشنییە کولتوورییە لە زاڵ بوون و جیهانداگربوونی نوێبوونەوە یان ژیاری ڕۆژئاوایی دا دەردەکەوێ. بۆ وێنە تیۆریستەکانی وەك گیدێنز، ڕابێرتسۆن بەجیهانیبوون بە پەرەگرتنی نوێبوونەوە لە کۆمەڵگەوە بۆ جیهان و پەرەگرتنی تایبەتمەندییە تەوەرییەکانی نوێبوونەوە لە ڕادەیەکی جیهانیدا دەزانن (Clark, 1997: 23).

لە کاتێك دا کە زۆر لە تیۆریستەکانی بەجیهانیبوون، شکڵ گرتنی کولتوورێکی جیهانی لە چوارچێوەی نوێبوونەوەی ڕۆژئاواییدا قەبووڵ دەکەن، بەڵام لە هەڵسەنگاندنی ئەودا جیاوازیی بۆچوونیان هەیە. تێگەیشتنێکی باو و ناسراو لە بەجیهانیبوونی کولتوور(ڕۆژئاوایی) هەمان ئیمپریالیسمی کولتوورییە. لەم ڕوانگەیەوە بەجیهانیبوون بریتییە لە ویستی هاوچەشن کردنی کولتووریی جیهان. کەواتە باشترە باس لە جیهانیکردن یان بە واتایەکی دروست تر، ڕۆژئاوایی کردنی جیهانی بکەین. بەجیهانیبوون، پڕۆسەیەکی نەخوازراو و پاشکۆی هێزە پێکهاتەییەکان نیە، بەڵکوو جۆرێك داسەپاندنی کولتووری ڕۆژئاوایە بە سەر جیهانی نارۆژئاوایی دا کە لە لایەن هۆکار و ویستە ئابووری– سیاسییە بەهێزەکانەوە بەڕێوەدەچێ.

ئەو تیۆریستانەی پابەندی تیۆری ئیمپریالیسمی کولتوورین لەم بڕوایە دان گومانێك سەبارەت بە پەرەگرتن و باڵادەستیی زێدەڕۆی کولتوورێك لە جیهان دا لە گۆڕێ دا نیە، بەڵام

ئەم کولتووورە هەمان بایەخ و بەها و باوەڕە ئیتنیك تەوەرە ڕۆژئاواییەکانە کە لە ڕواڵەتێکی گشتی و نائیتنیکیدا دەخرێتە بەرچاو. ئیدوارد سەعید دەڵێ کە ڕۆژئاوا لە ڕێگای گوتارەکانی هێز و بیانە (ئەوی دیکە) سازییەوە خەریکی جۆرێك ئیمپریالیسم و کلونیالیسمی کولتوورییە. فاتمە مەرنیسیش وەك ڕووناکبیر و تیۆریستێکی موسوڵمان ڕەخنە لە باڵادەستیی کولتووریی ڕۆژئاوا دەگرێ (Meyer & Geschiere, 1999: 1: .Mernisi: , 1993: 141)

بە پێی تیۆریی ئیمپریالیسمی کولتووری، ئەگەرچی بەجیهانیبوونی کولتووری وەك دیاردەیەکی بان مێژوویی و بان نەتەوەیی یان هێزێکی مەزن و جیهانی دەردەکەوێ، بەڵام لە ڕاستی دا لە هەناردەکردنی کاڵا، بایەخەکان و پلەبەندییەکانی ژیانی ڕۆژئاوایی زیاتر شتێك نیە، ئەوەی لە پانتایی بەجیهانیبوونی کولتووردا دەبێتە باو و زاڵ دەبێ، وێناکان و دەستکردەکان و شوناسەکانی نوێبوونەوەی ڕۆژئاواییە کە سنعەتی کولتووری ڕۆژئاوایی دەیخاتە بەرچاو. ئەم سنعەتە بە سەر ڕایەڵکە جیهانییەکان دا زاڵە و دەرەتانێکی ئەوتۆ بۆ پێوەندی و ئاڵوگۆڕی کولتووری لە نێوان ڕۆژئاوا و باقیی جیهان دا ناهێڵێتەوە (Hall, .1996: 305)

نەخشی دیاریکەرانەی سنعەتی کولتوورسازیی ڕۆژئاوا لە پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتووریدا نیشانەی پێگەی گرنگی ئابووری لە بواری کولتوور دایە. بە گوتنێکی دیکە، ئەگەرچی پەرەگرتن و تەنینەوەی کولتووری ڕۆژئاوایی لە جیهان دا هەڵگری تۆخمە جۆراوجۆرەکانی نوێبوونەوەی ڕۆژئاواییە، بەڵام دەتوانرێ بگوترێ لە نێو کۆمەڵەی تۆخمە تایبەتمەندیبەخشەکانی نوێبوونەوەدا، ئەوەی کە زۆرتر و بەگوڕتر لە تۆخمەکانی دیکە جیهانداگر دەبێ، جۆرێك کولتووری بەکارهێنەکیی گونجاو لەگەڵ سیستمی سەرمایەدارییە. کەواتە پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتووری گرێدراوی پرۆسەی بەجیهانیبوونی ئابووری یان سیستمی جیهانیی سەرمایەدارییە. ئەم ڕووکارەی بەجیهانیبوونی کولتووری لە ژێر ناوی جیهانداگربوونی کولتووری بەکارهێنەکیی سەرمایەداریدا تاوتوێ دەکەین.

ئەگەر پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتووری بە هاوچەشن بوونی جیهان بە هۆی پەرەگرتنی یەك کولتوور لە پانتایی جیهان دا بزانین، دەتوانین بڵێین کە سیستمی سەرمایەداری دەبێتە هۆی گۆڕانێکی ئەوتۆ. ئەم سیستمە کە لە ناخیدا پەرەخوازە و مەیلی جیهانیی هەیە، بەردەوام هەوڵی داوە جیهان بکاتە بازاڕی بەرهەم و بەکارهێنان. بەم پێیە دەیهەوێ تا بە یارمەتیی ئایدیۆلۆژی یان کولتووری بەکارهێنەکی و وێناکانی خەڵك لە بەکارهێنان و پێویستییەکانیان، ئەوانە بکەنە بەکارهێنەرانێك کە لە خزمەتی پرۆسەی کەڵەکەکردنی سەرمایە دان.





ئەگەرچی سەرمایەداری بەردەوام لە هەوڵی پەرەپێدانی کولتووری بەکارهێنەکی لە جیهان دا بووە، بەڵام زێدەبوونی بەرچاوی توانای بەرهەمهێنانی ئەو، گرنگی و پێویستییەکەی زۆرتر کردوە. ئێستاکە چەندایەتی و جۆراوجۆریی بەرهەمهێنانی کاڵا بەکارهێنەکییەکان بە شێوەیەکی بێ وێنە بەرەو ژوور چووە. لە کاتێك دا کە پێوەندیی سەرمایەدارانەی بەرهەمهێنان وەك کۆسپێك وایە لە بەرانبەر ئاستی بەکارهێنانی کاڵاکان لە لایەن خەڵکی جیهانەوە. بەم پێیە مانەوەی سیستمی سەرمایەداری بەستراوەتەوە بە فرۆشتنی هەرچی زیاتری کاڵا و خزمەتگوزارییەکان بە خەڵکێك کە ڕەنگە پێویستییە سەرەکییەکانیان دابین نەکرابێ و ئەم [پرسە]گرنگەش جێ بە جێ نابێ، مەگەر لە ڕێگای دانان و برەودان بە کولتووری بەکارهێنەکییەوە (Sklair, 1998: 302).

کولتووری بەکارهێنەکی خەڵك هان دەدا کە زیاتر لە پێویستییەکانی ژیانیان بەکار بێنن تا لەم ڕێگایەوە پرۆسەی کەڵەکەکردنی سەرمایە درێژەی هەبێ و کارکردی سیستمی سەرمایەداری جیهانی مسۆگەر بێ. لەم کولتوورەدا بنەما ئەوەیە کە مانا و چەمکی ژیان لە سەر ئەو شتەی کەس (شخص) هەیەتی، ڕاوەستێ. بەکارهێنان واتە ژیانی حەقیقی کامڵ و بۆ گەیشتن بەم ئاستە لە ژیان، ڕێگایەك بێجگە لە بەکارهێنان نیە. کەواتە خەڵك لە ڕاستیدا بە کارهێنەرن و چەمکی ژن یان پیاو وەك بوونەوەری ئابووری یان سیاسی وەلا دەنرێ.

لە ژێر کارتێکەریی کولتوورێکی ئەوتۆدا، هەموو خەڵکی جیهان، ڕۆژهەڵاتی یان ڕۆژئاوایی، باکووری یان باشووری و هەژار و دەوڵەمەند، بە کارهێنخواز دەبن و کۆمەڵگەی بەرخۆر (بەکارهێنەکی) دروست دەبێ. سنووری نێوان بەکارهێنان بۆ دابین کردنی پێداویستییەکانی گوزەران و بەکارهێنان وەك شێوەی گوزەران تێك دەرووخێ و زۆربەی چالاکییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان لە کڕین و بەکارهێنان دا کورت دەبنەوە. بە دەربڕینێکی دیکە کڕین دەبێتە "مۆدی باڵادەستی ژیانی گشتیی هاوچەرخ" کە بە ڕاشکاوانەترین شێواز لە کۆمەڵگەی ئێستای ئەمریکادا دەرکەوتووە.

ئێستاکە لە کۆمەڵگەی ئەمریکادا، "کڕین" دووهەمین چالاکیی خۆشیبەخشە لە کاتی بێکاریدا. دیارە پێگەی یەکەم بۆ چاو لـێکرانی تلویزیۆن تەرخان کراوە کە ئەویش زۆرتر بانگەشە بۆ کڕینی کاڵای جۆراوجۆر و کەڵك وەرگرتن لە خزمەتگوزارییە جۆراوجۆرەکان دەکا. لە کاتێك دا کە لە ساڵی ١٩٦٠ دا نزیکەی بیست خولەك لە کاتی بەتاڵی ئەمریکاییەکان بۆ کڕین تەرخان کرا، لە سەرەتاکانی دەیەی نەوەددا هەر ئەمریکاییەك بە شێوەیەکی نێونجی

نزیکەی سێ کاتژمێر لە کاتی بەتاڵی خۆی بۆ ئەم چالاکییە تەرخان دەکرد کە زۆرتر لە ناوەندەکانی کڕینی پیادە*دا تێپەڕ دەبوو (Goss 1993: 18).

دەتوانین برەو پەیداکردنی ئەم جۆرە ناوەندانەی کڕین بە نیشاندەری شکڵ گرتنی فەزایەکی گشتیی دیکە دابنێین کە دوای ماڵ و کار/ قوتابخانە، بە سێهەمین فەزای گرنگی گشتی لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا دەژمێردرێ. ناوەندەکانی کڕینی پیادە تەنیا شوێنگەلێك بۆ کڕین و فرۆشتن نین و ئەرکی دیکەی وەك ئەرکی پەروەردەیی و کولتووریش بەڕێوەدەبەن و زۆرتر تاکەکانی چینی نێونجی رادەکێشن. ئەم ناوەندانەی ناویان برا شوێنگەلێکی هێمن و دڵنیان بۆ کڕیارە ئاساییەکان، بەڵام لە هێندێك خزمەنگوزاریی گشتیی وەك تەوالێتی گشتی و تەلەفوونی گشتی کە رەنگە ناکڕیارەکانیش کەڵکی لــێوەرگرن، بێ بەشن (Sklair, 1998: 304).

دیارە شەپۆلی مەزنی بەرکاهێنانخوازی لە هیچ بیاڤێك دا کورت نابێتەوە و هەموو قوژبنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دەگرنەوە. وادێتە بەرچاو کە هیچ کەس و هیچ شتێك لە کاڵاییبوون و لە بازرگانیبوون نەپارێزراوە و کەم تا زۆر شیاوی کڕین و فرۆشتنە. سەرمایەداریی جیهانی بونیادنراو لە سەر کۆمپانییە بان نەتەوەییەکان، زۆربەی چالاکییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان دەکاتە چالاکیی ئابووری و بازرگانی. لەم چوارچێوەیەدا واتای چالاکیی ئابووریی بریتییە لە دابین کردنی سەرچاوەکانی بەرکاهێنان و چالاکیی سیاسی بریتییە لە دەستەبەرکردنی هەلومەرجی پێویست بۆ بەکارهێنان.

بەم پێیە هونەر و میعماری لە بازرگانیدا ئاوێتە دەبن و موسیقی، شانۆ و فیلم دەبنە "سنعەتە" پارەسازکان. تەنانەت مێژوو و جوغرافیاش لە کولتووری جیهانداگری بەکارهێنانخوازی دا خۆیان بەدەستەوە دەدەن و بەهاو واتای تایبەت بوون و جیاوازبوون دەگۆڕدرێ. لە راستی دا هەرچەشنە جیاوازی و جۆراوجۆرییەك تا ئەو جێگایە بەهاو گرنگیان هەیە کە سنعەتی گەشتیاری دەوڵەمەندتر بکەن. ئەم جۆرە جیاوازی و جۆراوجۆرییانە تەنیا بەشێك لە سنعەتی توریسمن کە وەك کاڵا لە چێشتخانەکان، مووزەخانەکان و باخچە زانستی— "تفریحی"یەکان دا دەخرێنە بەرچاو (Miyoshi, 1998: 259).

کولتووری بەکارهێنەکی لەو رووەوە هێزێکی هاوچەشنی خولقێن و جیهانسازە کە هەر شتێك دەکاتە کاڵا و دەی خاتە بازاڕی جیهانییەوە. ئەم پرۆسە جیهانییەی بە کاڵاییبوون ئەوەندە بەهێز و گشتگیرە کە تەنانەت لە بەرزترین بوارە کولتوورییەکان دا، چۆنییەتیەکان رێژەیی دەبن تا بە

* mall



سانایی شیاوی کڕین و فرۆشتن بن. بۆ وێنە دانیەل ستیل بەڵێن دەدا کە لە بەرانبەر وەرگرتنی شەست میلیۆن دۆلاردا پێنج کتێب بنووسێ یان ستێڤن کینگ رێککەوتننامەیەك بە بایی چل میلیۆن دۆلار دەبەستێ تا چوار رۆمان بنووسێ (Miller & Ames, 1996).

ئەم گۆڕانکارییانە دەری دەخەن کە پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتووری بە هۆی پەرەگرتنی پڕهەڵپەی کولتووری بەکارهێنانخوازییەوە نەك تەنیا هەموو کلتوورە ناوچەیی و نەتەوەیی و خۆ جێییەکان دزەهەڵگر دەکەن و وەمەترسی دەخەن، بەڵکوو جیاوازیی نێوان کولتووری بەرز و کولتووری کۆیی لە نێو دەبا (Lyon, 1999: 96). جیهانداگربوونی کولتووری بەکارهێنەکی و زاڵ بوونی زێدەرووی لۆژیکی ئابووری و بازرگانی بە سەر بیاڤی کولتووریدا، هەر دوو جۆرەکەی کولتوور لە بەرکاهێنانخوازی دا ئاوێتە دەبن و کولتووری بەرز دا دەبەزێ و شکڵی، دەبێتە ئامرازێك بۆ سامان کۆکردنەوە، لاف لێدان و ناوبانگ پەیداکردن.

لەوەها فەزایەك دا زۆربەی پێشانگا هونەرییەکان دەبنە شوێنی پڕ داهاتی بازرگانی و بەرهەمە هونەرییەکان پێوندییەکی توندیان لەگەڵ سنعەتی گەشتیاری و دەڵاڵانی هونەر کە بەردەوام خەریکی کڕین و فرۆشتنی پشکەکانی کولتووری بەرزن، دەبێ. بۆ وێنە لە هاوینی ١٩٩٦دا مووزەخانەی هونەری فیلادلفیا پێشانگایەکی بۆ بەرهەمە هونەرییەکانی هونەرمەندێك پێك هێنا کە زیاتر لایەنی بازرگانیی هەبوو و بانگەشەکانی لە Business Week دا چاپ دەبوو (Miyoshi, 1998: 260).

بەم چەشنە کولتووری بەکارهێنەکی جیهان داگیر دەکا و بابەتی کولتووری بە ئابووری دەبێت (Gameson, 1998: 60). لەوەڕا کە کولتووری بەئابووری بوو لە رێگای هێماکانەوە دەگۆڕدرێتەوە، بایەخ و سەلیقە دیاریکراوەکان لە شوێن و جوغرافیایەکی تایبەت دەرباز دەکا و دامەزراوە و پێکهاتە کۆمەڵایەتی سیاسییە سنوور خولقێنەکان بێ متمانە دەکا و بە گوتەیەکی دیکە، کولتووری بەکارهێنەکی بە دابەزاندن و رووخاندنی تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی نوێبوونەوە- کە جۆرێك جیاکردنەوە سڕینەوەی کولتوورییە- جۆرێك هاوچەشنیی جیهانی دروست دەکا. ئەو کاڵایانەی کە لەم پرۆسەیەدا بەرهەم دێن و دەخرێنە بەرچاو، هەر تاکێکی دانیشتووی سەر گۆی زەوی دەستی پێی را دەگا، بەو مەرجەی پارەیەکی بۆ کڕین هەبێ (Miyoshi, 1998: 295).

ئابووریبوونی کولتوور و رەوتە جیهانداگرەکانی کولتووری بەکارهێنەکی، نموونە و شێوازەکانی شوناسخوازیش دەخەنە ژێر کاریگەرییەوە. پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتووری لە

هەمان کات دا کە هەموو سنوورە کولتوورییەکان تێك دەدا لەگەڵ دامەزراوە و توخمە نەریتییە شوناسبەخشەکان دا ململانێ دەکا و بەکارهێنان دەکاتە سەرچاوەی سەرەکیی شوناس و جیاکردنەوەی کۆمەڵایەتی. لە راستی دا پەرەگرتنی بەجیهانیبوونی کولتووری بەکارهێنەکی تارادەیەکی زۆر بەکارهێنان دەخاتە جێگای پێوەندییە چینایەتی و سیاسییەکان کە بۆ ماوەیەکی زۆر بە گرنگترین هۆکارە شوناسبەخشەکانی ژیانی مۆدێرن دەژمێردران. لە کولتوورێکی بەکارهێنەکی دا، بە کارهێنان تەنیا لە لایەنەکانی گوزەران و ژیانەدا کورت نابێتەوە و هەم بایەخی ماددی هەیە و هەم بایەخی هێمایی. بە دەربڕینێکی دیکە، لە کۆمەڵگەی جیهانیی گیرۆدەی بەکارهێنان دا کە تاکەکان دەنە دەدرێن تا زیاتر لەوەی پێویستیانە، بیانهەوێ و سنووری نێوان ئەو دوو چەمکە تێك دەرووخێ، بەکارهێنانی دەبێتە شێوازی سەرەکیی خۆدەرخستن(خۆرانان) و سەرچاوەی سەرەکیی شوناسی کۆمەڵایەتی. ئەو چەشنە ئاکارە کۆمەڵایەتییانە جۆرێك ستراتیژیی کولتوورین کە لە دۆخی نوشستی هێنانی شوناسە نەریتی و مۆدێرنەکان دا، دەرەتان بۆ خۆدەرخستن لە رێگەی بەرهەمهێنانی کالاییانەی شوناسەوە پێك دێنن (Friedman, 1994: 191).

کولتووری بەکارهێنەکی نەتەنیا بەهایەکی هێمایی و بان گوزەرانی دەدا بە بەکارهێنان، بەڵکوو زۆرجار ئەو لایەنەی بەکارهێنان لە بەرانبەر لایەنەکەی دیکەی ئەودا (بەکارهێنان بە مەبەستی دابین کردنی پێویستییەکانی ژیانی مرۆڤ) دەخاتە پێشەوە. بەم پێیە داهات و دەرکەوت لە سەر بنەمای پێویستییە کولتوورییەکان رێك دەخرێ تاوەکوو پێویستییەکانی گوزەران. ئەمرۆکە دەکرێ بگوترێ لە هەموو کۆمەڵگەکانی جیهان دا دەتوانین مرۆڤگەلێکی هەژار بدۆزینەوە کە دەچنە ژێر باری قەرزی قورسەوە تا بە کڕینی کالای خاوەن مارکی ناسراو جۆرێك شوناس وەدەست بێنن(Sklair, 1998: 303).

کەواتە لە سیستمی جیهانیدا، بەکارهێنان هەمیشە جۆرێك بەکارهێنانی داشکاو بە لای شوناس دایە و نوێژەن کردنەوەی کولتووری خود لە رێگای ئەو دەرەتانەی کە بازاڕی سەرمایەداری دەی خولقێنی جێگیر دەبێ. کولتووری بەکارهێنەکی دەبێتە هۆی ئەوەی کە تاك لە جیاتی ئەوەی کە لە رێگای پیوەندیی ئابووری (چین) یا پێوەندیی سیاسی (نەتەوە) شوناس وەدەست بێنێ، بە خواردن، خواردنەوە، پۆشین، شێوەی تێپەڕکردنی کاتی بەتاڵ یان بە واتایەك، شێوە ژیان شوناس وەدەست بێنێ. تەنانەت بزووتنەوە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانیش بە کارهێنەرن (Friedman, 1994: 104).





شەپۆلی گشتگیر و هاوچەشن سازی کولتووری بەکارهێنەکی، کولتوورەکانی بەرگری و نارەزایەتیش لە نێو دەبا و لە خۆی دا ئاوێتەیان دەکا. ئەگەر توخمی تایبەتیبەخشی ئەو جۆرە کولتوورانە کە ئێستا بە "دژە کولتوورەکان" ناسراون، خستنە رووی کۆمەڵە جێگرێك بۆ ژیانی کۆمەڵایەتیی ئێستا بێ، دەتوانین بڵێین کە کولتووری بەکارهێنەکی راست لەم تایبەتمەندییەی دژە کولتووررەکان کەڵکی خراپ وەردەگرێ. بە دەربڕینێکی دیکە ئەم کولتوورانەی باسیان کرا بە خستنەرووی جۆراوجۆری و جێگرەوەی ریالیستانە یان ئایدیالیانە، دەرەتان بۆ سەرمایەداریی جیهانی دەخولقێنن تا لە جۆراوجۆریی شێواز کولتوورییەکان وەك کالایەك کەڵك وەرگرێ.

ئابوورییبوونی کولتووری رەخنە و نارەزایەتی لە بیاڤی سیاسیدا نیشانەگەلێکی بەرچاوی هەیە. ئەو رێورەسمە جۆراوجۆرانەی کە بۆ رێزگرتن لە بیستەمین ساڵوەگەری بزووتنەوەی خوێندکاریی دەیەی شەست بەڕێوەچوون، بە شێوەیەکی بەربلاو لە راگەیەنەکان دا دەنگدانەوەی هەبوو و بێ بەزەییانە سوودی بازرگانیی لێوەرگیرا، تا ئەو جێگایەی کە چیەتی و راسپاردەی سەرەکیی ئەو[بزووتنەوەیە] لە بیر کرا. شۆڕشەکانی فەڕانسە و ئەمریکاش لە کەڵك لێوەرگیرانی بەکارهێناخوازانە پارێزراو نەبوون. بزووتنەوەی ژینگەش تووشی چارەنووسێکی ئەوتۆ بوو و هێندێك لە نوێنەرانی ئەو یان لە کولتووری بەکارهێنەکی دا ئاوێتە بوون یان وردە وردە کەوتنە پەراوێزەوە. بۆ وێنە "سەوزکردنی کۆمپانیاکان" دروشێکی باشە، بەڵام لە راستی دا ئەوە کۆمپانیاکانن کە ئەم پرۆسەیە کۆنترۆڵ دەکەن نەك "سەوزەکان" (Sklair, 1998: 302).

بارودۆخی دژە کولتوورەکان لە بیاڤی هونەریدا هێندە باشتر لەبارودۆخی ئەوان لە بیاڤی سیاسی دا نیە. موسیقیی راك و رەپ، بێرێك دەنسینگ و دیوارنووسی[42] کە وەك هونەری نارەزایەتی و بەرگری دروست ببوون و پەرەیان گرتبوو، ئێستاکە بە سانایی سووڕهێنەر، سوود تەوەر و شیاوی سازان دەبن. بە تایبەت لە وڵاتانی جیهانی سێهەم دا، ئەم کولتوورانە بە شێوەی کالای جۆراوجۆر دەخرێنە بەرچاو و تاك و دەستە جۆراوجۆرەکان بە بەکارهێنانی ئەوان شوناس وەدەست دێنن (Miyoshi, 1998: 260). یەکێك لە دەرکەوتە سەرەکییەکانی پرۆسەیەکی ئەوتۆ، خۆراگرکردنی سیستمی جیهانیی سەرمایەداری لە بەرانبەر بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان دایە.

42- graffiti

هەر چۆنێك بێ بەسەرنجدان بەو بابەتانەی باسیان لێوەکرا دەتوانین بڵێین کە بەجیهانیبوونی کولتووری گرێدراوی پرۆسەی داروخان و ناسك بوونی سنوورەکان و بەم پێیە هاوچەشنتر بوونی جیهان بە هۆی پەرەگرتنی زێدەرووی کولتوور یان تۆخمە کولتوورییە جۆراوجۆرەکانە. ئەم کولتورە هەمان نوێبوونەوە یان کولتوور و ژیاری رۆژئاواییە کە لە دەیەکانی دوایی دا، بە تایبەت لە چوارچێوەی کولتووری بەکارهێنەکیی دا، بە خێرایی و گوڕێکی زۆر پەرە دەگرێ و کەم تا زۆر دەبێتە کولتووری جیهانی. بەڵام وا دێتە بەرچاو زەقترین و بەربڵاوترین رووکاری ئەم کولتوورە جیهانییە، جۆرێك کولتووری ئەمریکاییە کە ئێستا لە ژێر ناوی سێهەمین رووکاری پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتووری دا تاوتوێی دەکەین.

هەروەك کە بەجیهانیبوونی کولتوور و ژیاری رۆژئاوایی زۆرتر لە بەجیهانیبوونی کولتووری و بەکارهێنەکیی پێوەندیدار بە سیستمی سەرمایەدارییەوە دەردەکەوێ کولتووری ئەمریکاییش کاکڵی سەرەکیی ئەم کولتوورە بەکارهێنەکییە پێك دێنێ. بە دەربڕینێکی دیکە، ناتوانین گومانمان هەبێ کە پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتووری بە پەرەپێدانی کولتوورێکی تاقانە لە سەرانسەری جیهان دا، جۆرێك ئاوێتە و هاوچەشنیی جیهانی دروست دەبێ، بەڵام کولتوورێك کە جیهان داگیر دەکا لە راستی دا کۆپی ئەمریکایی کولتووری بەکارهێنەکیی سیستمی سەرمایەدارییە هەرچەند کە دەتوانرێ تۆخم و تایبەتمەندیی نائامریکاییش لەم کولتوورەدا دەس نیشان بکرێ بەڵام لایەنی باڵادەستی ئەم کولتوورە ئەمریکاییە (Owen, 1999: 117).

ئەوەی کە پێی دەگوترێ کولتووری جیهانی، جۆرێك کولتووری بەکارهێنەکییە کە بە یارمەتیی پێوەندییە بەربڵاوەکان و تێکنۆلۆژیی ئیلێکترۆنیك یان هەمان راگەیەنەی کولتووری، جیهانداگر دەبێ. ئەم کولتوورە ئەگەرچی خۆی گشتی و یونیورساڵ نیشان دەدا، بەڵام لە راستی دا لە سەرچاوەیەکی تاقانەوە سەرچاوە دەگرێ کە کولتووری ئەمریکاییە. کولتووری جێگای باس لە شوێنێکی دیاریکراو بەرهەم دێ و وەك هونەری چاولێکەرانە(تقلیدی)ی رووکەش لە دنیای ئیلکترۆنیك دا دەخرێتە بەرچاو. بەم پێیە کولتوورێکی تایبەت و دیاریکراو دەبێتە کولتووری جیهانیی بێکات، بێ شوێن و بێ یادەوەری (Smith, 1998: 215).

کولتووری بەجیهانیبووی ئەمریکایی لە بیاڤە جۆراجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی خەڵکی جیهان دا دەردەکەوێ و چین و دەستە جۆراوجۆرەکان، لایەنە لێك جیاوازەکانی ئەم کولتوورە وەردەگرن. ئەمرۆکە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی کۆمەڵگە جۆراجۆرەکانی جیهان، ویستراو یان نەویستراو، شێوە ژیانی ئەمریکاییان کردۆتە نموونە بۆ خۆیان. لە راستی دا بەجیهانیبوون





دیاردەیەکی کەم تا زۆر ئەمریکاییە، چونکە "خاوەنی گوێچکەکانی میکی مووسە، بیگ مەك* دەخوا و کۆکا دەخواتەوە" (Friedman, 1996).

لەم روانگەیەوە دەتوانرێ بگوترێ کە زەقترین رووکاری ئەمریکاییبوونی جیهان، پەرەگرتنی کولتووری بەکارهێنەکیی ئەمریکاییە. ئەم کولتوورە بەکارهێنەکییە لە پلەی یەکەم دا لە بەرهەمهێنان، بڵاوکردنەوە و بەکارهێنانی هێندێك لە بەرهەمەکانی کۆمپانیا بەناوبانگە ئەمریکاییەکانەوە جیهانداگر دەبێ و رۆژ بە رۆژ بە ژمارەی بەکارهێنەرانی ئەوانەوە زیاد دەبێ. هەر بەم هۆیەیە کە هێندێك لە توێژەران و تیۆریستەکان ئێستاکە باس لە دیسنی فیکاسیۆن*، کۆکاکۆلاریزاسیۆن و مەك دۆنالدیزاسیۆن دەکەن و سەبارەت بە زاڵبوونی تەواوی کۆمپانیا زۆر بەهێزە ئەمریکاییەکان بە سەر کولتووری جیهانی دا پەرۆشییان دەربڕیوە (Elliot & Atkinson, 1998: 19).

پەرەگرتنێکی ئەوتۆ بە سانایی دەتوانین لە بەجیهانیبوونی بەرهەمهێنان، بڵاوکردنەوە و بەکارهێنانی مەك دۆنالد دا ببینین. مەکدۆناڵد کە جۆرێك خواردنی ئامادەیە، یەکەم جار ساڵی ١٩٥٥ لە ئەمریکا دروست کرا. بە دوای پێشوازیی بەرچاوی خەڵك لەم بەرهەمە، مەك دۆنالدەوە لە ماوەیەکی کورت دا سەرانسەری ئەمریکای تەنیەوە و دواتر لە سنوورەکانی ئەمریکا تێپەڕی. هەموو ساڵێك بە ژمارەی لقەکانی خستنەرووی مەك دۆنالد زیاد بووە و ئەم بەرهەمە لەو کۆمەڵگەیانەش دا کە هیچ جۆرە نزیکایەتی و وێکچوونێکیان لەگەڵ کولتووری ئەمریکایی نەبوو، کڕیاری زۆری پەیدا کرد. تەنانەت بە دوای گۆڕانکارییە سیاسییەکان و لە بەر یەك بڵاوبوونی بەرەی رۆژهەڵات، لە شارەکانی وەك موسکۆ و پەکەنیش لقەکانی مەك دۆنالد کرایەوە.

لە دەیەی نەوەددا پرۆسەی پەرەئەستاندنی مەك دۆنالد هەڵپەیەکی زۆرتری گرت و دوازدە هەزارەمین لقی مەك دۆنالد لە ساڵی ١٩٩١ دا دەست بەکار بوو. ئەگەرچی بەشێك لەم پەرە ئەستاندنە لە کۆمەڵگەی ئەمریکا دا بوو، بەڵام کۆمەڵگەکانی دیکەشی داگیر کرد. لە ساڵی ١٩٩٤ دا نزیکەی پێنج هەزار لقی مەك دۆنالد لە دەرەوەی سنوورەکانی ئەمریکادا بوون. لە ساڵی ١٩٩٥یش دا بەرهەمەکانی مەك دۆنالد بیست میلیۆن بەکارهێنەری لە جیهان دا هەبوو

* Big Macs
* Disnification

و ٤٥ لە سەدەی ئەم کۆمپانییە لە ڕێگای چالاکییە نێونەتەوەییەکانەوە وەدەست هاتبوو. (Ritzer, 1993: 204).

دیارە تێگەیشتن و خوێندنەوەیەکی وەك یەك(هاوشێوە) لە دیاردەی مەك دۆنالدیزاسیۆن لە گۆڕێدا نیە. جۆرج ڕێتزێر، تیۆریستی مەك دۆنالدیزاسیۆن، پەرەگرتنی کولتووری بەکارهێنەکی لە چوارچێوەی پرۆسەی مەك دۆنالدیزاسیۆن دا بە پەرەگرتنی پرۆسەی ئاوەزمەندێتیی ڕۆژئاوایی دەزانێ. لە ڕوانگەی ئەوەوە پڕۆسەی مەك دۆنالدیزاسیۆن "کە لە ڕێگای ئەوەوە ڕێوشوێنەکانی بەکارهێنانی خۆراکی ئامادە لە بەشگەلێکی زۆرتر و زۆرتری کۆمەڵگەی ئەمریکا و باقیی جیهان زاڵ دەبێ"، پەرەگرتنی هەمان ئەو ئاوەزمەندێتییەیە کە وێبێر پێشبینی کردبوو. بە گوتەیەکی دیکە مەك دۆنالدیزاسیۆن نیشاندەری بەخشینی تەکووزیی دووبارەیە بە بەرهەمهێنان و بەکارهێنان یان ئاوەزمەندکردنی کردار و ئاکارەکان کە پێشتر نافەرمی و ماڵەکی (نێوخۆیی) بوون. بەم پێیە پرۆسەی جێگای باس بەستێن خۆشکەری هاوچەشنیی زۆرتری جیهانە (Ritzer, 1993: 7 – 13).

بە بۆچوونی ڕێتزێر مەك دۆنالدیزاسیۆن لەو ڕووەوە ئابووری، ڕێکخستن و ژیانی کەسێنی ئاوەزمەند دەکا چونکە لە سەر کارلێهاتوویی، بەراورد هەڵگری، پێش بێنی هەڵگری و کۆنتڕۆڵ هەڵگری بونیادنراوە. مەك دۆنالدیزاسیۆن بە کەم کردنەوەی ڕادەی کات و کاری پێویست لە نێوان پێداویستی و وڵامدانەوە بەو پێداویستییە دا، کارلێهاتوویی زیاتر دەکا؛ بە ستاندارد کردنی بەرهەمەکان و کەم کردنەوە جێگرەوەکان پێش بینی هەڵگری زۆرتر دەکا و بە کەڵك وەرگرتن لە تێکنۆلۆژیی مادی، وەك کۆنترۆڵی بژاردەکانی بەکارهێنەران لە ڕێگای ڕیز و مێنوە دیاریکراوەکانەوە، دەرەتانی کۆنترۆڵی مرۆڤەکان زیاتر دەکا (Holton, 1998: 168).

بەڵام ژمارەیەك لە تیۆریستەکان، پرۆسەیەکی ئەوتۆ زیاتر بە نیشانەی پەرەگرتنی کولتووری ئەمریکایی دادەنێن تاوەکوو گەشە و پەرەگرتنی ئاوەزمەندێتی لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا. لە ڕوانگەی ئەوانەوە ئەگەرچی وا دێتە بەرچاو پرۆسەی مەك دۆنالدیزاسیۆن دەسبەرکەری جۆرێك ئاوەزمەندێتیی وێبرییە، بە تایبەت لە لایەنی زێدەکردنی کارایی و پێش بینی هەڵگرییەوە، بەڵام لە ڕاستی دا کولتوورێکی تایبەت پەرەپێدەدا کە کولتووری ئەمریکاییە. هەرچۆنێك بێ دەتوانین بڵێین کە پرۆسەی مەك دۆنالدیزاسیۆن جۆرێك پرۆسەی هاوچەشنیی کولتووریی جیهانە کە لە ڕێگای پەرەگرتنی داب و نەریتێکی تاقانە لە زۆربەی دامەزراوە و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی ژیانی ئێستا دا بەڕێوەدەچێ.



لە بیاڤەکانی کولتووریی تایبەتیش دا زاڵبوون و پەرەگرتنی کولتووری ئەمریکایی کەم تا زۆر دیارە و بەرهەمە کولتوورییەکانی ئەم وڵاتە لە دوورترین شوێنەکانی جیهان دەخرێنە بەرچاو و بەکار دەهێنرێن. ئێستاکە ژمارەیەك لە بەرنامە تلویزیۆنییە بەرهەمهاتووەکان لە ئەمریکا بە شێوەی جیهانی بڵاو دەبێتەوە و ڕۆژ بە ڕۆژ بەرهەمهێنانی ئەم بەرنامانە زێدەتر دەبێ. بەرنامەکانی وەك دالاس و دۆسیە نادیارەکان[43] میلیۆنان بینەریان لە سەرانسەری جیهان دا هەیە و خەڵکی وڵاتانی جۆراوجۆر لە ڕێگای وەرگرەکانیانەوە (Reserver) چاو لە ڕاپۆرتە ڕاستەوخۆیەکانی ڕایەڵکەی "CNN" دەکەن.

هەمووساڵێك بە ژمارەی بەڕێوەبەران، خاوەنان و هەڵسووڕێنەرانی دیکەی ڕایەڵکە جۆراوجۆرە تلویزیۆنییەکانی ئەو وڵاتە جۆراوجۆرانەی کە داواکاری کڕینی بەرهەمە ئەمریکاییەکانن، زیاد دەبێ و تەنانەت وڵاتە ئەورووپاییەکانیش دەبنە کڕیارە شێلگیرەکانی ئەم بەرنامانە. لە دەیەی هەشتادا زۆربەی وڵاتانی ئەورووپایی و ئەمریکای لاتین نزیکەی ٢٥ لە سەدی بەرنامە تلویزیۆنییەکانی خۆیان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە هاوردە کردبوو، لە کاتێك دا کە ڕادەی هاوردەی وڵاتە یەکگرتووەکان کەمتر لە پێنج لە سەد بوو (Holton, 1998: 160).

زاڵبوونی هالیوود بە سەر سنعەتی سینەما و بەم پێیەش بە سەر کولتووری جیهانیش دا بە تەواوی دیارە. وەك دیارە لە زۆربەی وڵاتانی جیهان دا ناوی پڕ فرۆشترین فیلمی ساڵ بە بەرهەمەکانی هالیوود دەبڕێ و سەرکەوتنی فیلمە نێوخۆییەکان بە پێبەندیی ئەوان بە ڕێوشوێنەکانی فیلم سازیی ئەمریکایی بەستراوەتەوە. لە ساڵی ١٩٩١دا تێرميناتۆری ٢ پڕ فرۆشترین فیلم لە ئارژانتین، برزیل، شیلی، ژاپۆن، مالێزی و میکزیك بوو و لە ئۆتریش (نەمسا)، دانمارك، میسر، فەڕانسە، ئیسلەند، هولەند، لەهستان (پۆلۆنیا)، ئیسپانیا و سویدیش دا ئەم ناوە بە "سەماکەر لەگەڵ گورگەکان"، فیلمێکی سەرکەوتووی دیکەی هالیوود بڕا (Burber, 1995: 308).

لە بیاڤە هونەرییەکانی دیکەش دا کولتووری ئەمریکایی مەیدانی بە کولتوورە ناوچەییەکان تەنگەبەر کردوە. لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی جیهان دا جۆرەکانی موسیقیی پاپی ئەمریکایی ئاوازێکی ناسراوە و بە تایبەت بەرەی لاو زۆرتر ئەم جۆرە موسیقییەیان پێ لە ئاوازە ناوچەییەکان باشترە، هەرچەند نەتوانن لە زمانی گۆرانیبێژیش تێبگەن. زۆرجار،

43- The X - files

بوونی ئامێرە زۆر پێشکەوتوو و گشتگیرەکان دەبێتە هۆی ئەوە کە دوایین بەرهەمە کولتوورییەکانی کۆمپانیاکان و بەرهەمهێنەرە جۆراوجۆرە ئەمریکاییەکان لە ماوەی زۆر کورت دا لە جیهان بەکاربهێنرێن و فیلمەکانی وەك دالاس و بتمەن سینەماکانی زۆربەی وڵاتانی جیهان داگیر بکەن (Morley & Robins, 1996: 111).

جیهانداگربوونی کولتووری ئەمریکایی بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەستێرە ئەمریکاییەکانی بیاڤە جۆراوجۆرە هونەرییەکان دەست بکەن بە ململانێیەکی توند لەگەڵ ئەستێرە خۆجێیەکانی وڵاتانی دیکە دا. تەنانەت لەو وڵاتانەدا کە خەبات لەگەڵ تەشەنەکردنی کولتووری ئەمریکایی بە ئەرکی سەرەکیی خۆیان دەزانن، وێنە جۆراوجۆرەکانی مایکل جاکسۆن، مادۆنا و سیما خۆشەویستەکانی دیکەی بواری هونەری ئەمریکا لە سەر کراسەکانی لاوان و تازە لاوان دەنەخشێ (Haynes, 1999: 16). بێ گومان دەتوانرێ بگوترێ کە لانیکەم بۆ بەرەی لاوی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان، شێوە ژیانی ئەمریکایی سەرنجڕاکێشترین نموونەیە.

ئەمریکاییبوونی بەرچاوی جیهان لە پلە یەکەم دا لە توانای دارایی مەزنی کۆمپانییە ئەمریکاییەکان و زاڵبوونی ئەم وڵاتە بە سەر سنعەتە کولتوور سازەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. لە جیهانی ئێستادا گەورەترین و بەهێزترینی ئەو کۆمپانیانەی لە بواری بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی کولتووردا چالاکن، لە خاوەندارێتیی ئەمریکاییەکان دان. ئەگەرچی هێندێك لە وڵاتە پێشکەوتووەکانیش لەم بیاڤەدا چالاکن، بەڵام زاڵێتیی بە سەر سیستەمە مانگیلەییەکان، دروست کردنی تێکنۆلۆژیی زانیاری، ئاژانسە هەواڵییەکان، راگەیاندن، بەرهەمهێنانی بەرنامە تلویزیۆنییەکان و سنعەتی فیلم سازی دا بە شێوەیەکی جیدی ناکەوێتە مەترسییەوە.

کۆمپانییە ئەمریکاییەکان بە لە دەست دابوونی سەرچاوە مەزنە داراییەکان، وەپێش رکەبەرەکانی خۆیان دەکەون و پێشڕەوایەتیی خۆیان لەم بوارەدا دەپارێزن. زێدەتر لەوانە، دەوڵەتی ئەمریکاش هەوڵ دەدا لە بەرانبەر هەر هەوڵ و گۆڕانکارییەك دا کە زاڵێتیی کولتووریی ئەو وەمەترسی بخا بەرەنگاری بکا. سیاسەتوان و بەرنامەداڕێژە ئەمریکاییەکان هەوڵ دەدەن بە کەڵك وەرگرتن لە تێکنیکی و ئامرازی جۆاوجۆر بەر بەو هەوڵ و هەنگاوە جۆراوجۆرانەی کە ئامانجیان ئامادە کردنی بەستێنێکی شیاوە بۆ بازرگانیی ئازادی زانیاری و بەرهەمە کولتوورییە بگرێ.

هێندێك جار دەوڵەتی ئەمریکا لەگەڵ هەر چەشنە سانسۆر و کۆنترۆڵێك کە لە وڵاتە جۆراوجۆرەکان بە مەبەستی پاراستنی کولتووری نەتەوەیی لە بەرانبەر نفووز و بڕەو ئەستاندنی



کولتووری ئەمریکایی ئەنجام دەدرێن خەبات و بەربەرەکانی دەکا. هەوڵە پاوان شکێنەکانی وڵاتانی دیکە، وەك ئینگلیستان بە شێوەیەکی سروشتی لەگەڵ دژایەتی و کۆسپ خولقێنیی ئەمریکاییەکان بەرەوروو دەبێ. هەروەها هەر چەشنە هەنگاوێك بە کە مەبەستیان دانانی چوارچێوەیەك بۆ ئەو پێوەندییە جیهانییانەی خاوەنی پێشتێی(اولویت) و ئامانجی نابازرگانین لە لایەن دەوڵەتی ئەمریکا و دامەزراوە و کۆمپانییە خاوەن قازانجەکانەوە پووچەڵ دەکرێتەوە؛ کە لەم بارەیەوە دەتوانین ئاماژە بە بەربەرەکانیی ئەمریکا لەگەڵ بەرنامەکانی یۆنسکۆ بکەین (Holyon, 1998: 167).

دیارە پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتووری تەنیا لە ئەمریکاییبوون دا کورت نابێتەوە. ئەگەرچی مەك دۆناڵد، والت دیسنی و کۆکاکۆلا، بە شێوەیەکی زێدەروو ژیان و کولتووری ئێمە کۆنترۆڵ دەکەن (Ellion & Atkinson, 1998: 19) و کولتووری تایبەتی ئەمریکایی لە چوارچێوەی بەرخۆرگەرایی دا دەبێتە کولتوورێکی گشتی و جیهانی، بێ گومان ئەگەر بەجیهانیبوون (ی کولتووری) تەنیا بە جۆرێك ئەمریکاییبوون بزانین، دەبێتە مایەی سەرلێ شێواندن. لایەنی باڵادەستی ئەم پرۆسەیە ئەمریکاییبوون پێکی دێنێ، بەڵام لە هەمان کات دا بانتر و گشتگیرتر لەوە.

لەگەڵ ئەوەی کە دەوری کۆمپانییە ئەمریکاییەکان و بەم پێیە، کولتووری ئەمریکایی لە هاوچەشن کردنی کولتووریی جیهان دا زۆر زەق و دیارە، کۆمپانییە نائەمریکاییەکانش کەم تا زۆر لەم بوارەدا چالاکن. زێدەتر لەمانە، وادێتە بەرچاو کە دەبێ بەجیهانیبوون بە کۆتایی زاڵێتیی هێژمۆنیکی ئەمریکا و دەستپێکی قۆناخێکی نوێ لە مێژووی جیهان دانێین. بەجیهانیبوون سەر بە کاتێکی جیاوازە و دوای پووکانەوەی ئەمریکا و کۆتایی رێبەریی هێژمونیکی ئەو — کە تایبەتمەندییەکەی جۆرێك خۆشبینیی کۆمەڵایەتییە — دەستی پێ کردوە. بەم پێیە کولتوورێکیش کە لە پانتایی جیهانیدا دروست دەبێ، هەڵگری توخم و تایبەتمەندییە نائەمریکاییەکانیشە (Taylor, 1999: 123).

لەم روانگەیەوە، هێندێك لە تیۆریستەکان قسە لەوە دەکەن کە کولتووری جیهانی، کولتوورێکە جیاواز لە کولتوورە تایبەتەکان و پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتووری ناتوانرێ بە پرۆسەی بە ئەمریکاییبوونی جیهان دابنرێ. بە رای ئەوان لە سەر بنچینەی ژێربینا ئابووری و تێکنیکییەکانی جیهان، کولتوورێکی جیهان گرەوە[44] دروست دەبێ کە بە پێچەوانەی کولتوورە

44- cosmopolitan

نەتەوەیی یان ئیتنیکییە تایبەت و کاتمەندەکان، گرێدراوی هیچ شوناسێکی مێژوویی نیە و یادەوەری تەوەر نیە. لە راستیدا کولتووری جێگای باس کولتوورێکە "لاساییکەرەوانە، گشتی، بێ کات و تێکنیکی (Smart, 1993: 140).

هەر چۆنێك بێ، ئەگەرچی تێگەیشتن و خوێندنەوەی جۆارجۆر سەبارەت بە کولتوورێك کە جیهانداگر دەبێ و هەیە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك ناتوانین نکۆڵی لە پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتووری بکەین. نەك تەنیا سنوورەکانی کولتووره جۆراوجۆرەکان لە بەرانبەر کولتوورێکی جیهانیدا تێك دەرووخێن، بەڵکوو لایەنەکانی دیکەی ژیانی کۆمەڵایەتییش "کولتووری" و جیهانی دەبن. لە ئاکامی پرۆسەیەکی ئەوتۆ دا هاوچەشنییەکی کولتووریی زێدەروو لە جیهان دا دەردەکەوێ و هێندێك لە بەهاکان، داب و نەریتەکان و سەلیقەکان جیهانگیر دەبن.

رووکاری باڵادەست و بەشی بەرچاوی کولتوورێك کە بەجیهانی دەبێ، رۆژئاواییە و پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتووری بە توندی لە ژێر کاریگەریی هێزی کولتووریی رۆژئاوا دایە. داب و نەریت و دامەزراوە کولتوورییەکانی رۆژئاوایی هێشتا پێشەنگی گۆڕانی کولتووریی جیهانیین و لە هەر گۆشە نیگایەکەوە بڕوانینە بواری کولتووری جیهان، ناتوانین هێزی دیاری سەرمایەداریی رۆژئاوایی و کولتووری سەرچاوەگرتوو لەو لەبەرچاو نەگرین؛ چ ئەم کولتوورە هێمای کولتوورێکی گشتیی وەك کاڵاییبوونی ژیانی رۆژانە یان کولتووری بەرخۆری بێت، چ دەستەیەکی تایبەتی سنعەتە کولتوورییە جیهانییەکانی وەك رایەڵکە زۆر بەهێزە رۆژئاواییەکانی زانیاری بێت. کەواتە دەتوانین پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتووری بە درێژکراوەی پرۆسەی زاڵێتی و ئێمپریالیسمی رۆژئاوایی دانێین کە لە سەدەی حەڤدەیەمی زایینەوە شکڵی گرتوە.

بەڵام هەروەك لەبارەی بەهاوتا زانینی کولتووری جیهانی و کولتووری ئەمریکایی دا گوترا، لە قەڵەم دانی بەجیهانیبوونی کولتووری بە تەنیا جۆرێك ئیمپریالیسمی کولتووری نەك تەنیا لەگەڵ راستی ناگونجێ، بەڵکوو سەر لـێشێواندنیش دروست دەکا. رەوتی نێوان بیاڤە کولتووری/ جوغرافیاییە جۆراجۆرەکان هەمیشە هەڵگری جۆرێك گۆڕان، ئاوێتە بوون، پێك گرتن (انطباق) و دانوستاندنی کولتوورییە و کولتووری خانەخوێ زۆرتر بە شێوەیەکی دیالیتکی رووبەرووی هاوردە کولتوورییەکان دەبێتەوە. روانگەی ئیمپریالیسمی کولتووری ئەگەرچی توانایی گەلێکی بەرچاوی بۆ روونکردنەوەی دیاردە کولتوورییەکانی جیهانی هاوچەرخ هەیە، بەڵام چەمەهەڵگری (انعطاف پــذیری) و بزۆکیی کولتوورە نارۆژئاواییەکان و توانایی ئەوان بۆ



خۆماڵی کردنی هاوردە کولتوورییە رۆژئاواییەکان و تەنانەت رەوتی پێچەوانەی دزە کردنی کولتووری نارۆژئاوایی لە کولتووری رۆژئاواییەکان کەم تا زۆر لە بیر دەکا.

ناتوانرێ حاشا لەوە بکرێ کە رۆژئاوا بە مانا تایبەتەکەی، لە لایەنی کولتوورییەوە زۆر بەهێزە، بەڵام ئەم بەهێزی و زاڵێتییە کە پێوەندییەکی توند و تۆڵی لەگەڵ توانای تیکنیکی، سنعەتی و ئابووریی رۆژئاوا هەیە، تەواوی راستییەکە نیە. دوور لە راستییە کە بڵێین ئێستا شێوەی ژیانی رۆژئاوایی لە رێگای پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتوورییەوە بۆتە نموونەیەکی کولتووریی رووبەڕووبوونەوە هەڵنەگر بۆ هەموو خەڵکی جیهان. کولتووری جیهانی هەر چییەك بێ، تەنیا هەڵگری شوناسێکی کولتووری/ جوغرافیایی بان نەتەوەیی تایبەت نیە و هۆکارو دۆخ گەلێك هەن کە لە گۆڕانی بەجیهانیبوون بۆ بەجیهانیبوونی بێ ئەملاولای کولتووری رۆژئاوایی بەرگری دەکەن (Tomlinson, 1999 a: 24 – 25).

تەنانەت هێندێك لە تیۆریستەکان واوەتریش چوون، پرۆسەی بەجیهانیبوونی کولتووری بەدەستەبەرکردنی جۆرێك پووکانەوەی رۆژئاوا دەزانن. لە روانگەی گیدێنزەوە ئەگەرچی پرۆسەی بەجیهانیبوونی نوێبوونەوە بە پەرەگرتنی دامەزراوە رۆژئاواییەکان دەستی پێ کرد، بەڵام گشتگیر بوونی ئەم جۆرە دامەزراوانە (سەرمایەداری، سنعەتگەرایی، دەوڵەت — نەتەوە و...)، وێکنەچوون و جیاوازیی نێوان رۆژئاوا و دنیای نارۆژئاوا زۆرتر لە پێشوو کەم دەکاتەوە: یەکەمین قۆناخی بەجیهانیبوون لە راستیدا لە ژێر زاڵێتیی پەرەگرتنی رۆژئاوا و ئەو دامەزراوانەی لە رۆژئاوا دروست ببوون دابوو. هیچ ژیارێکی دیکە نەی توانیوە کاریگەرییەکی ئاوا گشتگیر و مەزن لە سەر جیهان دابنێ... لەگەڵ ئەوەی کە بەجیهانیبوون هێشتا لە ژێر کاریگەریی دەسەڵاتی رۆژئاوا دایە، بەڵام ناتوانین لە چوارچێوەی ئیمپریالیسمی یەك لایەنەدا باسی لێوەبکەین... بەجیهانیبوون خاوەنی هیچ ئاراستەکەی راشکاوانە و دیار نیە... کەواتە نابێ بە یەك چاو چاو لە قۆناخی ئێستای بەجیهانیبوون و قۆناخی پێشوو کە پێکهاتەی ئەو لە لایەن قۆناخی ئێستاوە تێك دەرووخێ بکەین (Giddens, 1994: 96).

باومەنیش باس لە خاڵێکی ئەوتۆ دەکا. بە رای ئەو دەبێ لە نێوان بابەتی "یۆنیۆرساڵ"ی پێوەندیدار بە نوێبوونەوە، کولتوور و ژیاری رۆژئاوایی و بابەتی "جیهانی"ی پێوەندیدار بە پرۆسەی بەجیهانیبوون جیاوازی دانێین. نوێبوونەوەی رۆژئاوایی سەردەمێك خۆی بە یونیۆرسال و گشتی دەزانی، بەڵام ئێستا [خۆی] بە "جیهانی" دەزانێ. بابەتی

یونیۆرسال بە واتای دەسەڵاتداری و زاڵێتیی خۆی بوو، بەڵام بەجیهانیبوون[45] بە مانای ئەوەیە کە هەر کەس لە هەر جێگایەك دەتوانێ مەك دۆنالد بخوا. بەجیهانیبوونی سەرەتایی هەڵگری بەرنامەیەکی کولتووریی وشیارانە بوو، لە کاتێك دا کە بەجیهانیبوونی دوایی تەنیا گشتگیرە و کولتوورێك کە لەم رێگایەوە جیهانی دەبێ، پێوەندییەکی لاوازی لەگەڵ رۆژئاوا هەیە (Bauman, 1995: 24).

کەواتە پێوەندی و گونجاوییەکی بەرچاو لە نێوان کولتووری جیهانی و هەست کردن بە هەبوونی شوناسێکی کولتووریی جیاوازی رۆژئاوایی بوونی نیە. رۆژئاواییەکانیش ئیتر زۆر لەو شتانەی لە ژیانی رۆژانەی خۆیان دا کەڵکی لـێوەردەگرن (وەك ریستۆرانەکانی مەك دۆنالد) بە هی خۆیان نازانن و بەو شتانەی کە لە پانتایی جیهانیدا پەرەیان گرتووە شوناس وەدەست ناهێنن. دابەزینی بڕوابەخۆیی کولتوورییە لە رۆژئاوا رەنگە پێوەندیی بە تایبەتمەندییە پێکهاتەییەکانی نوێبوونەوەی بەجیهانیبوونەوە هەبێ و گومان بخاتە سەر لافی بەجیهانیبوونی کولتووری رۆژئاوایی.

لە دنیایەك دا کە ئەزموونی ناوچەیی و ژیانی رۆژانەی مرۆڤەکان بە شێوەیەکی زێدەروو لە ژێر کاریگەریی رووداوەکان و پرسە زۆر دوورەکان دایە، هەبوونی وێنایەکی روون لە شێوەی ژیانی (کولتووری) رۆژئاوایی دژوارە و ناتوانین پێمان وابێ داب و نەریت و هەڵسوکەوتە جیهانگیرەکان پێوەندییەکی دیاریکراویان لەگەڵ مێژوو و نەریتگەلێکی دیاریکراوە و تایبەت دا هەیە. لە جێگای بەجیهانیبوونی کولتووریی بونیادنراو لە سەر کولتوور و ژیاری رۆژئاوا، باشترە باس لە نوێبوونەوەی بێ جیاوازیی بێ شوێن بکەین. لە راستی دا ئەوەی کە لە جیهان دا رووەدە دا، پرۆسەیەك نیە زاڵێتیی کولتووری رۆژئاواییەوە گرێ درابێ و بەم پێیە وا پێش بینی دەکرێ داهاتووی جیهان جیاواز لەوە بـێ کە گوتارەکانی ئیمپریالیسمی کولتووری و هاوچەشنیی کولتووری دەی خوازن (Tomlinson, 1999 a: 28 – 29).

هەر چۆنێك بێ بەجیهانیبوونی کولتووری — هەر چییەك بێ — رووکارێکی پرۆسەی گشتیی بەجیهانیبوونە کە پێشتر دوو رووکاری دیکەیمان شی کردۆتەوە. پرۆسەی جێگای باس هەڵگری هەر چەشنە گۆڕان و رووداوێکە کە سنوورەکانی ئێستا لە جیهان دا ناسك تر و خەڵکی دنیا لە فەزای کۆمەڵایەتیی یەکگرتووی جیهانی دا ئاوێتە دەکا. بەم پێیە بەجیهانیبوون بریتییە لە لێك تەنراویی زێدەرووی بیاڤی کۆمەڵایەتی لە پانتایی جیهانیدا یان

45- globality



لێك تەنراویی زێدەرووی چالاکیی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ و شوێنەوار و دەرکەوتە جیهانداگرەکانی ئەو چالاکییە. ئەم لێك تەنراوییە بەرادەیەکی بەرچاو وێناکان، بەهاکان، چاوەڕوانییەکان و شوناسەکانی تاکەکان و دەستە جۆراوجۆرەکان دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە.

پرۆسەی بەجیهانیبوون پێوەندیی بە گۆڕانی فەزا و زەمەنەوە هەیە. بە هۆی پێشکەوتنە تێکنیکییەکان زەمەن و فەزا بە چەشنێك دەپەستێوترێن کە رووداوە جۆراوجۆرە زۆر دوورەکان، راستەوخۆ و خێراتر لە پێشوو ژیانی مرۆڤەکان دەخەنە ژێر کاریگەرییەوە و ئەو بڕیارانەی هەر تاکێك دەی دا، زۆرجار دەرکەوتە و شوێنەواری جیهانیی هەیە. لە راستی دا فەزا کۆمەڵایەتییە سنووردارو شوێنمەندە نەریتییەکان کەم تا زۆر تێك دەرووخێن و فەزایەکی کۆمەڵایەتیی تاقانە شکڵ دەگرێ کە رایەڵکە و رەوتە جۆراوجۆرە جیهانییەکان دەگرێتە خۆی.

ئەم رەوتە جیهانییانە هەموویان ئەوە دەردەخەن کە بە هۆی پەستێوتراوی فەزا و زەمەن، هەموو ئەو هۆکارانەی فەزای کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی سنوورە سیاسی، کولتووری و سروشتییەکان دا سنووردار دەکەن، پەیتا پەیتا لاواز و بێ توانا دەبن. بەم پێیە فەزایەکی کۆمەڵایەتیی زۆر بەربڵاو شکڵ دەگرێ کە تایبەتمەندییەکەی ئابووریی نێونەتەوەیی، کۆمەڵگەی بان نەتەوەیی و کولتووری جیهانییە. پرۆسەی بەجیهانیبوون گرێدراوی شکڵ گرتن و پەرەگرتنی فەزایەکی ئەوتۆ و وشیاری روو لە زیادبوونە.

لەوەڕا کە پرۆسەی بەجیهانیبوون بە ناسك کردن و تێکدانی ئەو سنوورانەی هەن، پێوەندییە جیهانییەکان زێدەتر دەکا، مرۆڤەکان دەخاتە فەزایەکی کۆمەڵایەتیی یەکگرتووەوە، پەرچەکردارگەلێك دروست دەکا. ئەم پەرچەکردارانە بە شێوەی جۆاروجۆر دەردەکەون و قورسایی و گرنگیی جیاوازیان هەیە. لە بەشی دواتردا پەرچەکردارە کولتوورییە جۆراوجۆرەکان لە ئاست پرۆسەی ئاوێـتەکەر و هاوچەشن سازی بەجیهانیبوون دا و فەزای کۆمەڵایەتیی بەرهەمهاتوو لەو تاو توێ دەکەین.

# تایبەتگەرایی کولتووری

پرۆسەی پڕهەڵپەی بەجیهانیبوون لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا زێدەبوون و پەرەگرتنی تایبەتگەرایی کولتووریی لەگەڵ خۆی هێناوە کە نیشانەگەلی زۆر و پڕ ئەژمار و جۆراوجۆری هەیە. لەم بەشە دا هەوڵ دەدەین وێنایەکی تارادەیەك روون لەم جۆرە تایبەتگەراییانە بخەینە بەرچاو. بەڵام بۆ باشتر تێگەیشتن لەم دیاردەیە و هێماکانی باشترە سەرەتا سەبارەت بە پێگەی کولتوور لە جیهانی هاوچەرخ دا و گشتگەرایی کولتووری قسە بکەین و دواتر لەبارەی تایبەتگەرایی کولتووری بدوێین و شی بکەینەوە.

## کولتووریبوونی جیهان

هەروەك لە بەشی یەکەم دا باس کرا، بەجیهانیبوون دەتوانین بە گرنگترین و زەقترین بابەتی کۆمەڵگەی جیهانی بژمێرین. ئێستاکە بەرپرسە حکوومەتییەکان کێشە ئابوورییەکانی وڵاتەکانیان دەگەڕێننەوە بۆ ئەو فشارانەی لە بەجیهانیبوونەوە سەرچاوەیان گرتووە؛ هەڵسووڕێنەرانی دەزگا ئابوورییە جۆراوجۆرەکان، بچووك کردنەوەی کۆمپانیاکانی خۆیان بۆ درێژەی ژیان لە چوارچێوەی ئابووریی جیهانی دا بە پێویست دەزانن: لایەنگرانی ژینگە سەبارەت بە کارتێکەرییە وێرانکەرەکانی پرۆسەی کۆنترۆڵ نەکراوی بەجیهانیبوون هاوار دەکەن و پشتیوانانی کۆمەڵە خۆجێییە جۆراوجۆرەکان سەبارەت بە لە نێوچوونی وردەکولتوورەکان لە بەردەم شەپۆلی گشتگیری کولتووری جیهانی دا وریاری دەدەن.

سەرەڕای گشتگیربوونی باس کردن سەبارەت بە بەجیهانیبوون، هێشتا کۆدەنگییەکی ئەوتۆ لە سەر نێوەرۆك و چییەتی ئەو نەهاتۆتە ئاراوە و پێناسەکردنی ئەم دیاردەیە هەروا مشتومڕی





جیددی لە سەرە. توێژەران و تیۆریستە جۆراوجۆرەکان پێناسەی جۆراوجۆریان لە پرۆسەی بەجیهانیبوون کردوە و لە سەر چەمکی ئەو دەست دەکەن بە دەمەتەقەی بێکۆتایی. تەنانەت هێندێك لە بیرمەندان، بەجیهانیبوون بە رازە (ئەفسانە)یەك زیاتر نازانن و هەر جۆرە قسەکردنێك سەبارەت بە "بەجیهانیبوون" دەگەڕێننەوە بۆ کاریگەری جۆرێك وەهم یا زێدەگۆیی (Hrist: 1996) لە روانگەی ئەم دەستەیەوە، ئابووری و سیاسەت و کولتووری جیهان بواری گۆڕانکاریی چۆنایەتی نین.

دیارە سەرەڕای ئەم جۆرە جیاوازیی بۆچوونانە لە سەر پێناسەی بەجیهانیبوون و تەنانەت گومان کردن لە راستیی ئەو، نزیکەی هەموو توێژەران و کەسانی ئۆگری ئەم بابەتە. ئەو [(بەجیهانیبووە)] بە دەستەبەرکەری جۆرێك هاوچەشنی و ئاوێتەبوون دەزانن. هەر پێناسەیەکمان لە بەجیهانیبوون هەبێ، ناتوانین گومان بکەین کە جیهانی ئێستا گۆڕەپانی کاری هێزە هاوچەشنکەر و ئاوێتەکارەکانە. ئەم هێزانە لە دەیەکان و تەنانەت سەدەگەلێك لەوە پێشەوە لە ئارادا بوون، بەڵام لە ساڵانی دوایی دا بە شێوەیەکی بێ وێنە بەهێز و گشتگیر بوون و هەموو ئەو سنوور و کۆسپە سروشتی، سیاسی، ئابووری و کولتوورییانەی لە جیهان دا هەن کەم تا زۆر تێك دەدەن و نفووز هەڵگریان دەکەن.

ئابوورییە نەتەوەییەکان لە ژێر کاریگەریی ئەم هێزە جیهانسازانەدا زیاتر لە پێشوو تێك دەڕووخێن و لە ئابووریی جیهانی دا ئاوێتە دەبن: بابەتی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی تەنگەبەری کۆمەڵگەی نەتەوەیی دەرباز دەبێ و کۆمەڵگەی جیهانی شکڵ دەگرێ: و کولتوورێکی یەکگرتووش دروست دەبێ و کۆمەڵگەی جیهانی پەرەدەگرێ. ئەگەرچی باس و دەمەتەقە سەبارەت بەم بابەتە زۆر گەرمە کە ئابووریی جیهانی بەرژەوەندییەکانی کام دەستە و کۆمەڵگە دابین دەکا، چ کەسانێك سوکانداری(کۆنترۆڵکەری) کۆمەڵگەی جیهانین و کولتووری جیهانی لە چ کولتوور و مێژوویەکی تایبەتەوە سەرچاوە دەگرێ، لەم راستییە ناتوانین چاوپۆشین کە هاوچەشنی و ئاوێتە بوون پرۆسەیەکی جیهانییە و هیچ کۆمەڵگەیەك ناتوانێ بە تەواوی لە کاریگەرییە هاوچەشن ساز و ئاوێتە کەرەکانی هێزە جیهانییەکان بە تەواوی پارێزراو بێ.

بەجیهانیبوونی بەرهەمهاتوو لە پەستێوتراویی فەزا و زەمەن کە هەڵگری نزیکی، پێوەندیی روو لە زیاد بوون و بەستراوەیی بەرانبەری نێوان مرۆڤەکان، گرووپەکان و کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانە، دەبێتە بەستێن خۆشکەری کولتوور و شوناسگەلی گشتگیرتر. بە هەر رادەیەك

کە کولتوورەکان پێکەوە وێك دەکەون، دانوستاندن و وتووێژ لە نێوان مرۆڤەکان دا زۆرتر دەبێ، [شتە] هاوبەشەکانی نێوان کولتوورەکان و شوناسەکانیش زیاتر دەبێ. بە دەربڕینێکی روونتر، بە پەستێوترانی جیهان، وشیاریی جیهانیی مرۆڤەکان زیاتر دەبێ و هەرچی مرۆڤەکان سەبارەت بە گرێدراوییان بە جیهانێکی یەکگرتوو و زۆر گەورەترەوە ئاگادار بن، کولتوور و شوناسگەلی گشتگیرتر دروست دەبێ.

بەڵام ئەمە تەنیا بەشێك لە راستیی کولتووریی جیهانی هاوچەرخە. ئەگەرچی زانیاری زۆر هەن کە باس لە شکڵ گرتن و پەرەگرتنی شوناسە گشتگیرترەکان و کولتوورە بان ناوچەیی و بان نەتەوەییەکان دەکەن، بەڵام زانیاریی ئەوتۆش کە باس لە تایبەتگەرایی کولتووری دەکەن یەکجار زۆرن. ئێستاکە بەشە جۆراوجۆرەکانی گۆی زەوی هەڵگری بزووتنەوەگەلی جۆراوجۆرن کە هەوڵدان بۆ پاراستن یان ژیاندنەوەی توخمە شوناسبەخشە تایبەتەکان و بەربەرەکانی لەگەڵ رەوتە جیهانییەکان دا، بە تایبەت کولتووری جیهانی دەتوانین بە تایبەتمەندییە هاوبەشەکانیان دانێین. ئەم بزووتنەوانە کەسان و دەستەگەلێك ئامادە دەکەن کە لە فەزای کۆمەڵایەتی — کولتووریی جیهانیدا بە دوای کولتوور و شوناسێکی نەریتیی رەسەنەوەن و لە بەرانبەر رەوتە نەپساوە جیهانییەکان دا، ئاواتیان دروست کردنەوەی سنوورەکانی فەزای بچووکی کولتوورییە.

بەم پێیە بەجیهانیبوون- کە بەجیهانیبوونی کولتووری بەشێکی سەرەکی و جیانەبۆوەی ئەوە- جۆرێك پرۆسە و گۆڕانی دیالکتیکیی لێدەکەوێتەوە. بە تێك رووخاندنی هەرچی زیاتر سنوورە سیاسی و کولتوورییەکان و ئاوێتە بوونی رۆژ لە رۆژ زیاتری کۆمەڵگەکان لە کۆمەڵگە جیهانی دا، هەر لەو کاتە دا کە کولتوورە تایبەتە جۆراوجۆرەکان لێك نزیك دەبنەوە و کولتوورە گشتییەکان شکڵ دەگرن، دەستەو داوێن بوونی توخمە شوناسبەخشە تایبەتە کولتوورییەکانیش بەگوڕتر دەبێ. بۆ وێنە پرۆسەی بەجیهانیبوون بە دروست کردنی وشیاریی جیهانی- لایەنە گشتییەکانی کولتوورە تایبەتە ئایینییەکان کە گرێدراوی دۆخ و پرسە جیهانییەکانە بەهێز دەکا. بەڵام لە لایەکی دیکەوە جۆرەکانی بناژۆخوازیی کولتووریش بە هێز دەکا کە کەڵکەڵەی چوارچێوە کولتوورییەکان و ژیاندنەوەی سنوور و فەزا کولتوورییە سنووردارە نەریتییەکانیان لەسەر دایە.

بە سەرنج دان بەم خاڵە دەتوانین بڵێین کە بەجیهانیبوون پێگەیەکی بەرز و گرنگییەکی بەرچاوی بە کولتوور بەخشیوە. ئەم پرۆسەیە لە هەمان کات دا کە جۆرێك هاوچەشن سازیی کولتووریی لەگەڵ دایە و کولتوورێکی تاقانە بە سەر کۆمەڵگەی جیهانی دا زاڵ دەکا، بەستێن





و دەرەتانی بەربڵاویش بۆ پێکەوە ژیان، گۆڕینەوە، تێکەڵاوبوون و هەڵدانی کولتووری و هەروەها تایبەتگەراییە جۆراوجۆرەکانیش پێك دێنێ. بە گوتەیەکی دیکە دنیای هاوچەرخ هەم شایەدی بەجیهانیبوونی کولتووری (ئیمپریالیسمی کولتووری، رۆژئاواییبوون، ئەمریکاییبوون و...)و هەم شایەدی کولتوورییبوونی جیهانە.

لە ژێر کاریگەریی ئەم گرنگی پەیدان کردن و زەقبوونەوە زێدرووییەی کولتووری دا، بیاڤە جۆراوجۆرەکانی توێژینەوەش گۆڕانیان بە سەردا هاتووە. ئەگەرچی زانستە مرۆییەکان بەردەوام و کەم تا زۆر سەرنجیان داوەتە دیاردەی کولتوور، بەڵام لە ساڵانی دواییدا لایەنی کولتووریی ژیانی کۆمەڵایەتی تەوەری باسی زۆر لە زنجیرە و لقە لاوەکییەکانی ئەم زانستە بووە و کۆمەڵناسیی کولتوور لە پەراوێزەوە بەرەو ناوەندی بیاڤی کۆمەڵناسی چووە (Featherstone, 1999: 272). لە راستی دا بێتوانایی تیۆرە باوەکان بۆ تێگەیشتن لە پێکهاتە، پرۆسە و کردارە دوو لایەنە ئاڵۆزەکانی موزاییکی کولتووری جیهانی، دروست کردنی تیۆر و نموونەی نوێیان کردۆتە پێویستییەکی بێ ئەملاو ئەولا.

بەشی دووهەمی ئەم توێژینەوەیەش وڵامێکە بەم پێداویستییە. لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین وێنەیەك لە دیمەنی کولتووری جیهانی بخەینە بەرچاو تا راستییە ئاڵۆزەکانی دەرکەون. بەم پێیە دوای باسێکی گشتی لەبارەی کولتوورەوە، باس لە دوو جۆرە پەرچەکرداری سەرەکی لە بەرانبەر پرۆسەی بەجیهانیبوون دا(گشتگەرایی کولتووری و تایبەتگەرایی کولتووری) دەکەین. دیارە لە بیرمان نەچێ تەوەری باسەکە لەم بەشەدا تایبەتگەرایی کولتوورییە و تەنیا بە مەبەستی تێگەیشتنی باشتر لە تایبەتگەرایی کولتووری و هەروەها نیشاندانی ئاڵۆزیی موزاییکی کولتووری جیهانی باس لە گشتگەرایی کولتووری دەکرێ.

کولتوور لە ریزی وشە و چەمکەکانی زانستی کۆمەڵایەتی و مرۆییەکان دایە کە سەرەڕای ئەوەی زۆر بە کار دەهێنرێ، کۆدەنگییەکی ئەوتۆ سەبارەت بە پێناسەی ئەو لە گۆڕێ دا نیە. توێژەرو تیۆریستە جۆراوجۆرەکان پێناسەی جۆراوجۆریان لە کولتوور خستۆتە بەرچاو کە تەنانەت زۆر جار ناتەباییان پێکەوە هەیە. ئەم جۆراوجۆری و جیاوازییە بەربڵاوە ئەگەرچی تارادەیەك لە روانگەکان و تێگەیشتنە جۆراوجۆرەکانی توێژەرانەوە سەرچاوە دەگرێ، بەڵام هەر لەم کاتەش دا نیشانەی پێچەڵاوپێچی و رەوانیی ژیانی کۆمەڵایەتییە کە سنووردارکردن و پێناسەکردن و چەمکبەندیی لایەنە جۆراوجۆرەکانی سانا نیە.

به گشتی هەموو مانا جۆراوجۆرەکانی کولتوور لە وشەی لاتینی Cultivate وەرگیراوە. خودی ئەم وشەیەش مانای جۆراوجۆری هەیە کە چاندن لە سەر زەوی و پەروەردە(هەنگ، ماسی، کرمی هاوریشم و...) لە ریزی ئەوان دان. دیارە لە هەمووی ئەو مانا و پێناسانەدا چەمکی پەروەردە، بە ئاکام گەیاندن و هەوڵدان بەدی دەکرێ و لە راستیدا ئەم لایەنە لە چەمکی کولتوورە کە هاتۆتە بیاڤی مرۆیی و کۆمەڵایەتییەوە. بۆ وێنە لە درێژایی سەدەی حەڤدەهەم دا، وشەی کولتوور بە مانایەکی ناڕاستەوخۆ و بۆ ئاماژەکردن بە هەڵدان و بارهێنانی تاکەکان یان کۆمەڵگەی مرۆیی بە کاردەهێنرا(Skelton, 1999: 2).

بەڵام بە تێپەڕینی کات، مانا و چەمکی کولتوور گۆڕانی بە سەر دا هات و ئەم وشەیە بەکارهێنانی جۆراوجۆر و جیاوازی پەیدا کرد. ئێستا کە مانای بەرینتری کولتوور هەڵگری هەر شتێکە کە مرۆڤ لە ئاژەڵ جیا دەکاتەوە. لەم رووەوە کولتوور دەکەوێتە بەرانبەر سروشت یان بیولۆژییەوە (Worsley, 1999: 13) و هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە بە شێوەی ژێنێتیکی ناگوازرێتەوە. هەڵسوکەوتی کولتووری بە شێوەی ژێنێتیکی ناگوازرێتەوە، بەڵکوو دووبارە بەرهەمهێنانەوە و گوازتنەوەی ئەو لە ئەستۆی کۆمەڵگەیە (Gellner, 1995: 46). کەواتە کولتوور بە مانا بەربلاوەکەی هەمیشە دیاردەیەکی کۆییە.

بۆ باشتر تێگەیشتن لە مانای کولتوور دەبێ ئەو هەم لە سروشت و چیەتی مرۆیی جیابکرێتەوە و هەم لە کەسایەتیی تاکەکەسی، هەرچەند سنوورەکانی نێوان ئەوان ئەوەندە روون نیە. چیەتیی مرۆیی ئەو شتەیە کە هەموو مرۆڤەکان هەیانە و لایەنی گشتیی زەینی مرۆڤ پێك دێنێ. ئەم چیەتییەش لە رێگای ژێنەکانەوە بە میرات بە جێ دەمێنێ کە تایبەتمەندییە فیزیکی و دەروونییەکانی کەس دیاری دەکا. هەستی ترس، تووڕە بوون، ئەوین، شادی و خەم، یاریکردن و وتوویژ لەگەڵ کەسانی دیکە هەموویان سەر بەو لایەنە لە زەینی مرۆڤن. کەواتە سروشتی مرۆڤ، هەروەك لە وشەکەوە دەردەکەوێ، مرۆیی نیە و کۆمەڵە لایەنێکی دیاریکراو لەو لەگەڵ کۆمەڵە بەشێکی دنیای ئاژەڵان هاوبەشە (Hofstede, 1997: 5 -6).

لە لایەکی دیکەوە، کەسایەتیی تاکێك بریتییە لە تایبەتمەندییە بێ هاوتا زەینی و دەروونییەکانی ئەو کە لەو دا لەگەڵ هیچ مرۆڤێکی دیکە هاوبەش نیە. ئەم کەسایەتییە هەڵگری تایبەتمەندیگەلێکە کە بەشێك لەوان وەك میرات بێ جێ دەمێنن و بەشێکی دیکەشیان وەدەست دەخرێن. ئەگەر ئەم دوو رووکارە لە ژیانی مرۆڤەکان جیابکەینەوە، کۆمەڵە رووکارێك کە بە جێ دەمێنن دەتوانین پێیان بڵێین کولتوور. ئەم کولتوورە جۆری مرۆڤ



دەگرێتەوە و تایبەتمەندیبخەشی هەموو کۆمەڵەکانە. کاتێك کە باس لەو نیشانە و دیاردانە دەکەین کە نە گشتین و نە تایبەت بە تاکن، کولتوورمان بەم مانایە بەکار هێناوە(Wallersetin, 1991: 159).

بەڵام لەم توێژینەوەیە دا، مەبەست لە کولتوور شێوە ژیانێك نیە کە مرۆڤ لە ئاژەڵەکانی دیکە جیابکاتەوە، بەڵکوو شێوە ژیانی حەشیمەتێکی دیاریکراو و جیاکەرەوەی گرووپەکان و کۆمەڵە جۆراوجۆرەکان لە یەکترە. بەم پێیە دەتوانین باس لە کولتووری کۆمەڵێك، نەتەوەیەك، هۆزێك، یان گرووپێکی مەزهەبی و یان تەنانەت وشکاییەك(کیشوەرێك) بکەین. لەم روانگەیەوە هەر تاکێکی تایبەت بەرهەمی کولتوورێکی تایبەتە کە لەودا دەژی و کۆمەڵێك بەشێك لە حەشیمەتی جۆرێك (مرۆڤ)ە کە هەرچەند لەگەڵ هاوجۆرەکانی خۆی دا لەو تایبەتمەندییانەدا کە لە رێگای ژێنەوە دەگوازرێنەوە هاوبەشن، بەڵام بە هۆی هێندێك تایبەتمەندیی زیاترەوە لەو حەشیمەتە بەرینترە جیا دەبێتەوە (Gellner, 1995: 45).

بە پێی روانینێکی ئەوتۆ بۆ کولتوور، شایەدی جۆراوجۆرییەکی بەرچاوین لە جیهان دا و یەکە کۆمەڵایەتییە بچووك و گەورەکان، سنوور و فەزای کولتووریی کەم تا زۆر دیاریکراویان هەیە. کولتووری ئەم جۆرە کۆمەڵانە بریتییە لە کۆیەکی ئاڵۆزی لە خۆگری زانست، بڕوا، هونەر، ئاکار، حقووق، داب و نەریت و هەر بەهرە و خدەیەك کە مرۆڤ وەك ئەندامی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو وەدەستی دێنێ (Kelleher, 1999: 18). ئەرکی سەرەکیی ئەم کۆمەڵەیە بریتییە لە دابین کردنی مانا و شوناس بۆ کردارگەران لە رێگای تێکەڵ کردنی توخمەکانی ناسین، مانا، هەست و بایەخەکانەوە (Holton, 1998: 162).

کەواتە کولتوور سندووقە ئامێرێکە هەڵگری کردار و خدەگەلێك کە یارمەتیی ئێمە دەدەن تا لە جیهان بگەین (وەك زانست و ئایین) و لە سەر ئەو کار دەکەین (وەك تێکنۆلۆژی) و هەروەها سەرچاوەیە لە دامەزراوە هەستەکییەکان (وەك شوناسی نەتەوەیی) و بایەخەکان (وەك ئازادی و یەکسانی) کە لە رێگای ئەوانەوە شوناس وەدەست دێنین و، کردارەکانمان ئامانجمەند دەکەین و پاساویان دەدەین (Holton, 1998: 162). بە دەربڕینێکی دیکە هەر کولتوورێك هەڵگری هەزاران نۆرم و بەها (چاوەڕوانییە ئاکارییەکان)، بایەخ (پێوانەی دیاری کردنی پەسند و ناپەسند، باش و خراپ، جوان و ناحەز)، بڕوا (وێناگەلێك سەبارەت بە گەردوون و بەشەکانی ئەو)، دامەزراوە (شتگەلێك، دەنگ یان کردارگەلێك کە لە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە واتایەکی تایبەتیان هەیە)، تێکنۆلۆژی و پێوەندییە مادییەکانە(Peterson, 1999: 6).

بەش و توخمە ئالۆزەکانی کولتوور بە هیچ شێوەیەك هاوسەنگ و جێگیر نین و لە چوارچێوەی فەزا و زەمەن دا دەگۆڕێن. بە تێپەربوونی زەمەن هێندێك لە داب و نەریتەکان لە نێو دەچن، هێندێکیان دەگۆڕێن و هێندێکیش لە کولتووورە گەورەترەکان دا ئاوێتە دەبن. تێك هەڵکشانی فەزا کولتوورییەکانیش کاریگەریی زۆریان لە سەر گۆڕانی توخمە کولتوورییەکان هەیە. هەروەها زۆر جار پێویستییەکانی سەردەم و پێویستییە سیاسییەکان زیندووبوونەوەی هێندێك لە توخمە کولتوورییەکان و سەرکوتی هێندێکی دیکەی لـێدەکەوێـتەوە (Skelton, 1999: 4).

ڕەوان و لەگۆڕاندابوونی کولتوور نیشانەی ئەوەیە کە کولتوورەکان دروست دەکرێن. ئەگەر کولتوور بە کۆمەڵەیەك بریتی لە هونەر، موسیقی، جل و بەرگ، ئایین، نۆرم، بڕوا، دامەزراوە، رازە و داب و نەریت بزانین کە دەیانخەینە سەبەتەیەکەوە، ئەم سەبەتەیە کە هەرگیز بە ئامادەیی و پڕکراوی لە کاڵا کولتووری- مێژووییەکان نادرێتە دەست، بەڵکوو ئێمە کولتوور بە چنین و هەڵبژاردنی شتە جۆراوجۆرەکان لە قەفەسەی رابردوو و ئێستا و دانانیان لەم سەبەتەیەدا دروست دەکەین. بە گوتەیەکی دیکە کولتوورەکان لە ڕێگای قەرز کردن، تێکەڵاوکردن، دووبارە دۆزینەوە و دووبارە خوێندنەوەی ڕەوتی کارو کاردانەوەکانی تاك و گرووپەکانەوە دروست دەبێ (Nagel, 1998: 251).

تایبەتمەندییەکی دیکەی کولتوور ڕێژەیی بوونەکەیەتی: ئەگەرچی ناتوانرێ نکۆڵی لەوە بکرێ کە گرووپە جۆراوجۆرە مرۆییەکان لە لایەنی هزر، هەست و کردەوە جیاوازن، بەڵام ئەوەکە یەکێك لەوان بە بانتر یان نزمتر دانێین ڕێگای پێ نادرێ. کولتوورێك هیچ پێوانەیەکی بێ ئەملاو ئەو لای بۆ دادوەری لەبارەی کولتوورەکانی دیکەوە نیە و بە خراپ یان باش دانانی کولتوورێك هیچ پێوانەیەکی هەست پێ کراو و بان کولتووریی نیە (Hofstede, 1997: 7). ئەمە هەمان ڕێژەییبوونی کولتوورییە کە لە بەشی سێهەم دا بە درێژی باسی دەکەین.

دیارە هێندێك لە تیۆریستەکان بڕوایان وایە کە کولتوور بابەتێکی بە تەواوی ڕێژەیی نیە. لە روانگەی ئەوانەوە ئەم راستییە کە ئێمە دەتوانین تارادەیەك بە شێوەی بان کولتووری پێوەندی دامەزرێنین، هەست بە توانایی بێ وێنەی داهێنەرانەی کولتووریی یەکدی بکەین و دواتر رادەیەك لە هاومەیلی نێوان کولتووورە جۆراوجۆرەکان سەبارەت بە زۆر لە بایەخە بنچینەییەکان بدۆزینەوە، نیشانەی ئەوەیە کە مرۆڤەکان زیاتر لەوە کە وێنا دەکرێ خاوەنی لایەنی هاوبەشن. ئەگەرچی



جیاوازیی قووڵ لە نێوان گرووپ و کۆمەڵە جۆراوجۆرەکان دا لە گۆڕێ دایە، مرۆڤەکان هێشتاش دەتوانن بیرۆکە و بایەخی هاوبەش بدۆزنەوە (Peterson, 1999: 33).

دوای ئەم باسە کورتە سەبارەت بە کولتوور، ئێستا دەبێ بزانین کولتووورە جۆراوجۆرەکان چ پەرچەکردار و هەڵویستێکیان لە بەرانبەر پرۆسەی بەجیهانیبوون دا هەیە. ئەو کولتوورانەی کە ساڵیانی ساڵ تاڕادەیەك جیا و دوور و تەنانەت بێ ئاگا لە کولتوورەکانی دیکە درێژەیان بە ژیانی خۆیان دەدا، لە فەزایەکی بەرهەمهاتوو لە پەستێوترانی فەزا و زەمەن دا چ دۆخێکیان هەیە و وەك توخمە شوناسبەخش و جیاوازی خوڵقێنەکان چۆن خۆیان دووبارە دروست دەکەنەوە. بە دەربڕینێکی دیکە، هەر کولتوورێکی تایبەت چ پەرچەکردارێك لە ئاست کولتووری جیهانی و کولتووورە تایبەتەکانی دیکەدا نیشان دەدا.

هەروەك پێشتر باس کرا، شکڵ گرتنی فەزایەکی جیهانیی بەرهەمهاتوو لە پەستێوتراویی فەزا و زەمەن و تێك ڕمانی سنوورەکان و فەزا سنووردار و نەریتییە تاڕادەیەك داخراوەکان، وێك کەوتنی کولتووورە تایبەتەکان لەگەڵ یەکدی و کولتووری جیهانی دەکاتە شتێکی خۆ لـێ لانەدراو. ئاکامی ئەم وێك کەوتنانە دروست بوونی زۆر جۆرە پێوەندی و پەرچەکرداری کولتوورییە لە پانتایی جیهانی دا کە زۆر پڕ ئەژمارە جۆراوجۆرن. تەنانەت دەتوانین بڵێین کە بە رادەی کولتوورەکان و وردە کولتووورە نەتەوەیی، ئیتنیکی، ئایینی، خێڵەکی و ناوچەییەکان، وێك کەوتن و پێوەندیی کولتووری هەیە.

هێندێك لە کولتوورەکان بە سانایی لە بەرانبەر کولتووری جیهانی یا کولتوورەکانی دیکەدا دەتوێنەوە. هێندێکی دیکە هەڵوێستێکی سەرسەختانە و شەڕانیانە سەبارەت بە کولتووری پەلاماردەر دەگرنەبەر. ژمارەیەك لە کولتوورەکان مل بۆ پێکەوە ژیانی ئاشتییانە رادەکێشن و ژمارەیەکیش وتووێژ و دانوستاندنی کولتووری بە شتێکی بێ ئەملا و ئەو لا دەزانن. دیارە گۆرانکاریی کولتووری و دروست بوونی کولتووری گشتی و ئاوێتەیەکی نوێیش لە بەرهەمەکانی ئەم وێك کەوتن و پەرچەکردارە کلتورییانە لە فەزای جیهانی دان.

ئەم جۆراوجۆرییە بەربڵاوەی پێوەندی و وێك کەوتنە کولتوورییەکان لە ئاستی جیهان دا لە توێژینەوە کولتوورییە جۆراوجۆرەکانیش دا دەرکەوتووە. ئێستاکە لەم توێژینەوانەدا، کە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ ژمارەیان زیاد دەکا، باسی هەموو جۆرە پەرچەکردارەکان و گۆڕانکارییە کولتوورییەکان دەکرێ و توێژەران بۆ باس کردن و روون کردنەوەی ئەوان کەڵك لە پۆلێن کردنی

جۆراوجۆر وەردەگرن. بەڵام لەم توێژینەوەیە دا بە پێڕەوی لە پێتێربێر[46]، جۆرەکانی کردار و پەرچەکردارەکان و گۆڕانکارییە کولتوورییەکان بە دوو دەستەی گشتگەرایی کولتووری و تایبەتگەرایی کولتووری دابەش دەکەین و دەیانخەینە بەرباس و تاوتوێیان دەکەین.

## گشتگەرایی کولتووری

گشتگەرایی لە راستی دا ئەو بنواشە، بایەخ و پێوانانە دەگرێتەوە کە لە پێوەندی لەگەڵ هەموو خەڵك دا لە هەموو جێگایەك شیاوی متمانەبن. متمانەی ئەم بنواشە و بایەخ و پێوانانە بە بەستراوەییە ناوچەیی، ئیتنیکی، زمانی، نژادی و ئایینییەکانی تاکەوە گرێ نەدراوە و مرۆڤ وەك مرۆڤ لە بەرچاو دەگرێ. بۆ وێنە لە روانگەی جیهان نیشتمانییەوە[47]، ئاشتی، تەناهی، ئازادیی تاکەکەسی و باش بژیی تاکەکەسی لە ریزی ئەو بایەخانەدان کە دەبێ هەر کەسێك بە بێ لە بەر چاوگرتنی بەستراوەییە کەسێنییەکان و وەفادارییە کۆمەڵایەتییەکان وەریان گرێ (Thompson, 1998: 191).

بەڵام مانایەکی تارادەیەك جیاواز لە گشتگەرایی تەوەری ئەم توێژینەوەیەیە. لەم رووەوە گشتگەرایی بە مانای بوونی جیهانبینییەکی تەواو گەورە کە هەموو مرۆڤەکان بگرێتەوە نیە، بەڵکوو بە مانای گرتنە بەری هەڵوێستێکی نەرمتر، کراوەتر و میانەرەوانەترە. بە پێی ئەم خوێندنەوەیە، هەر چەشنە هەوڵ و هەڵوێستێك کە دەرەتان بۆ هاوبەشی کردن و گرنگی پێدرانی دەنگە جۆراوجۆرەکان بۆ وێنە دەنگە سەرکوتکراو و لە بەرچاونەگیراوەکان خۆش بکا، بە جۆرێك گشتگەرایی دەژمێردرێ. لە راستی دا تەوەر و جەوهەری گشتگەرایی هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن لە دیتران و تێگەیشتران لە لایەن دیترانەوە لە رێگای بنواشە و پرسە هاوبەشەکانەوە.

گشتگەرایی بە پێچەوانەی تایبەتگەرایی لە سەر پێکەوە گونجان، چەمەڵگری، ئاوێتەبوون و هاوسەنگی و لێك گەیشتن راوەستاو شیاوترین و کردەیی ترین هەڵوێست لە کاتی رووبوونەوە لەگەڵ زانیارییەکان، هزرەکان، بایەخەکان و روانگە نوێیەکان دا پەنا بردن بۆ وتووێژ، لێك گەیشتن و لانیکەم پێکەوە ژیان دەزانێ. لە جیهانێك دا کە وێك کەوتن و رووبەڕووبوونەوە شتێکی خۆ لــێ لانەدراوە و دەرەتانێکی ئەوتۆ بۆ گۆشەگیری و لە پەراوێزدا مانەوە نیە،

46- Beyer, 1994
47- cosmopolitonism



گشتگەرایی کولتووری هەڵگری چەشنە جۆراوجۆرو پڕ ئەژمارەکانی پێوەندی، هەڵوێست و پەرچەکرداوە کۆمەڵایەتییەکانە و گشتگەرایی کولتووری بەشێکی بەرچاو لەوان پێك دێنێ.

کەواتە گشتگەرایی کولتووری بەو دەستەیە لە پەرچەکردار و گۆڕانکارییەکان دەگوترێ کە لە سەر تەوەری دانوستاندن، ئاوێتە بوون، پێکەوەژیان و پێکەوەگونجان شکڵ دەگرن، گشتگەرایی کولتووری روانگەی ئەو کولتوور، تاك و گرووپانەیە کە بە هۆی هێندێك هۆکار ژیاندنەوەی فەزا بەستراوە کولتوورییەکان بە کارێکی نەکراو و تەنانەت زیانبار دەزانن و بە پشت بەستن بە وتووێژ، ئاوێتە بوون و پشوودرێژی خەریکی نوێژەنکردنەوەی خۆیان دەبن. لە چوارچێوەی ئەم روانگەیە دا لەبارترین شێوەی ژیان لە فەزای جیهانیی هەڵگری کولتوور و رەوتە جۆراوجۆرەکان دا، دەستراگەیشتن بە پێکهاتەیەکی ناسك و ئاڵۆز لە کولتووری تایبەت/ گشتی و ناوچەیی/ جیهانییە نەك گەڕان بە دوای کولتوور و شوناسی "رەسەن"دا.

هێما و نیشانەکانی ئەم جۆرە گشتگەراییە کولتووری — کۆمەڵایەتییە زۆرن و لە کۆمەڵگە و ناوچە جۆراوجۆرەکانی جیهان دا تاکەکان و گرووپە کۆمەڵایەتییەکان جۆرێك پەرچەکرداری کەم تا زۆر گشتگەرایانە سەبارەت بە کولتووری جیهانی و کولتوورەکانی دیکە نیشان دەدەن: هێندێك لە گرووپە ناخۆجێیەکانی دانیشتووی شارە گەورەکان وێڕای پێکەوە ژیان لەگەڵ کولتووری باو دا، هێندێك لە توخمەکانی ئەو کولتوورەش وەردەگرن؛ دانیشتووانی شار و گوندە دووردەستەکان، هێندێك بەشی کولتووری جیهانی وەردەگرن و خۆماڵیی دەکەن؛ هێندێك جار کولتوورە جۆراوجۆرەکان پێکەوە وتووێژ دەکەن و جاری واشە بزووتنەوە و کولتوورگەلی نوێ شکڵ دەگرن کە بەستراوەیی جیهانی و گشتگەرایانەیان هەیە. لە دێرەکانی داهاتوودا ئەم جۆرە پەرچەکردارە گشتگەراییە جۆراوجۆرانە بە درێژی تاوتوێ دەکەین.

## پێوەندی و پێکهاتە ئاڵۆزە تایبەتمەندی بەخشەکانی پانتایی کولتووری جیهان

هێندێك لە تیۆریستەکان بە تایبەت تیۆریستەکانی ئیمپریالیسمی کولتووری قسە لەوە دەکەن کە جیهان شایەدی گشتگیربوونی کولتوورێکی تاقانەیە. ئەم کولتوورە جیهانییە کە لایەنە باڵادەستەکەی کولتووری بەرخۆریی سەرمایەداری و کولتووری ئەمریکایی پێکی دێنێ لە سەرانسەری جیهان دا پەرە دەگرێ و ئەم کولتوورانەی کە بوونیان هەیە دەتوێنێتەوە و لە نێویان دەبا. لە جیهانی ئێستادا رەوتی کولتووری یەك لایەنەیە (لە رۆژئاواوە بۆ باقیی جیهانە) و دانوستاندن، وتووێژ، گۆڕان و ئاوێتەبوونی کولتووری رێگای پێ نادرێ. پانتایی



کولتووریی جیهان لە ژێر دەستی هێزەکانی سەرمایەداریی جیهانی دایە کە کاڵا فەرهەنگییەکانیان بۆ هەموو جیهان دەنێرن.

وەك پەرچەکردار لە بەرانبەر پرۆسەیەکی هاوچەشن و یەکدەستکەری کولتووریی ئەوتۆ دا، هێندێك لە کولتوورەکان روویان کردۆتە بەربەرەکانی و خۆڕاگریی پڕ ئاڵۆزی و توندوتیژانە. ئەم جۆرە کولتوورانە بۆ راکردن لە ئاوێتەبوون لە کولتووری جیهانی دا هەوڵ دەدەن فەزایەکی کولتووریی داخراوە و قایم دروست بکەن تا لە چوارچێوەی ئەودا بتوانن رابردووی "رەسەن" و "پاك"ی خۆیان زیندوو بکەنەوە. ئەم کولتوورانە هەر جۆرە رەوتێکی کولتووریی جیهانی بە جۆرێك هێرش و ئیمپریالیسمی کولتووری دادەنێن و دەست دەکەن بە خەباتێکی توندوتیژانە لەگەڵ ئەو. بەم پێیە بەرگریی کولتووریش دەبێتە جۆرێك پەلامار و پاوان کردن.

کەواتە جیهان گۆڕەپانی رمبازێنی کولتوورێکی جیهانی بەکارهێنەکی و پەرچەکرداره شەر ئامێزەکان لە بەرانبەر ئەو دا یان باربێر گوتەنی "مەك ورلد" و "جیهاد"ە. ئەم دوو هێز و رەوتە کە لە پێناوی بەرژوەندەکانی ژمارەیەك لە دەستەبژێرە سیاسی- ئابوورییەکان دا کار دەکەن، رۆژ لەگەڵ رۆژ مەیدان بە دیمۆکراسی و وتوێژ، دانوستاندن، پێکەوەژیان و ئاوێتەبوونی کولتووری تەنگەبەرتر و فەزای جیهانی داگیر دەکەن. ئەو دوو هێزە دنەدەر و بەستێن خۆشکەری شوناسخوازیی خوێناویی خێڵەکین و یان کەس(تاك) دەکەنە بەرخۆرێکی بێ ئەملاو ئەولا (Barber, 2000: 24).

ئەگەرچی بەجیهانیبوونی کولتوور و تایبەتگەرایی سەرچاوەگرتوو لەو رووکاری باڵادەستی راستیی کولتووری جیهانییە، بەڵام هەمووی ئەو نیە. ناتوانین نکۆڵی بکەین کە ئێستا زۆر لە بەرهەمە کولتوورییەکانی رۆژئاوا و بە تایبەت ئەمریکا بەکارهێنانی جیهانییان هەیە و هێماکانی کۆکاکۆلانیزاسیۆن، دیسنی فیکاسیۆن و مەك دۆنالدیزاسیۆن لە سەرانسەری جیهان دا وەبەرچاو دەکەوێ. دژایەتی لەگەڵ ئەم پرۆسەیەش بۆتە شەپۆلێکی جیهانی و [بۆیە] شێوازە جۆراوجۆرەکانی بونیادگەرایی کولتووری لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی جیهان وەبەرچاو دەکەوێ. ئەم جۆرە راستییانە زۆر زەقتر لەوەن کە بتوانرێ نکۆڵییان لـێ بکرێ، بەڵام راستیی دیکەش هەن کە لە چوارچێوەی "مەك ورلد" و "جیهاد"دا ناگونجێن. بەم پێیە تێگەیشتن و روونکردنەوەی دروستی دیاردەکان و پرۆسە کولتوورییەکانی جیهان پێویستی بە دانانی تیۆرێکی گشتگیرتر و ئاڵۆزترە.



بۆ وڵامدانەوە بەم پێداویستییە و نەهێشتنی کەموکووڕییەکانی تیۆری ئیمپریالیسمی کولتووری و تیۆریستەکانی وەك باربێر ژمارەیەك لە توێژەران تیۆرگەلێکیان هێناوەتە گۆڕێ کە هەڵگری کۆمەڵە خاڵێکی نوێ و سرنجڕاکێشن. ئەم خاڵانە نەك هەر سادە بینییەکانی تیۆرەکانی پێشوو سەبارەت بە تایبەتمەندییەکان و کارکردی کولتووری جیهانی و پەرچەکرداره تایبەتگەرایانەکان لە بەرانبەر ئەو کولتوورە دا دەردەخەن، بەڵکوو نیشانەی ئاڵۆزبوون و جۆراوجۆرتربوونی پێوەندییەکان، رەوتەکان و پەرچەکرداره کولتوورییەکان لە پانتایی کولتووری جیهانی دان.

یەکێك لەو خاڵانە، رەخنەگرتنە لەو تێگەیشتنە باوەی ئیمپریالیسمی کولتووری لە کولتووری جیهانی هەیەتی. لەم تیۆرە دا، کولتووری جیهانی لە خۆگری زنجیرەیەك توخم و بەشی کولتوورییە کە سەرمایەداریی جیهانی و هێزە رۆژئاواییەکان لە چوارچێوە جۆراوجۆرەکان دا ئەوان بە کۆمەڵگاکانی دیکە دەدەن یان تەنانەت بە سەریان دا دەسەپێنن و وەرگرتنی ئەوان جۆرێك خۆدۆڕاندن لە بەرانبەر کولتووری بێگانە دا و خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی خاوەنەکانی ئەو کولتوورەیە. بە وتنێکی دیکە پێوەندییەکی کولتووریی ئەوتۆ جۆرێکی دیکە لە پێوەندیی کلۆنیالیستییە کە لە دەیان، بەڵکوو سەدان ساڵ لەوە پێشەوە لە نێوان رۆژئاوا و کۆمەڵگەکانی دیکەی جیهان دا لە گۆڕێ دا بووە.

ئەگەرچی ئەم قسەیە تارادەیەکی زۆر راستە، بەڵام نێوەڕۆك و پێکهاتەی کولتووری جیهانی بە باشی روون ناکاتەوە. ئەگەر کولتووری جیهانی بە کۆمەڵەیەکی پێکهاتوو لەو بایەخ، بڕوا، نۆرم، شێوەی ژیان و داب و نەریتانە بزانین کە زۆربەیان یەکەم جار لە رۆژئاوا دروست بوون، دەبێ بڵێین کە هەڵگری توخمگەلێکی ئەرێنیشە. بۆ وێنە دیمۆکراسی، حکوومەتی یاسا و مافەکانی مرۆڤ کە ئێستاکە بوونەتە بایەخگەلی جیهانی، میراتی پڕ بەهای کولتوور و ژیاری رۆژئاوان. توخمی کولتووریی دیکەش هەن کە تاڕادەیەك گەیشتوونەتە هەموو جیهان، هەرچەند ریشەی رۆژئاواییان هەیە.

لە روانگەیەکی دیکەشەوە تیۆری ئیمپریالیسمی کولتووری ناراستبینانەیە. لەگەڵ ئەوەی کە بەشی بەرچاوی ئەو شتەی کە ئێستاکە بە کولتووری جیهانی ناو دەبرێ ریشەی لە کولتوور و ژیاری رۆژئاوایی (نوێبوونەوە/ مۆدێرنیتە)دا هەیە و ساڵیانی ساڵ جۆرێك رەوتی یەك لایەنەی کولتووری بە سەر جیهان دا زاڵ بوو، ئێستا پێکهاتە و پرۆسەی کولتووری جیهانی زۆر ئاڵۆزتر بووە: یەکەمین قۆناخی بەجیهانیبوون زۆر ئاڵۆزتر بووە... هیچ ژیارێکی دیکە نەی

توانیوە کاریگەرییەکی ئەوەندە مەزن و گشتگیری لە سەر جیهان هەبێ... بەجیهانیبوون ئەگەرچی هێشتا لە ژێر زاڵێتیی هێزی رۆژئاوا دایە و ناتوانرێ لە چوارچێوەی ئێمپریالیسمی یەك لایەنەدا باسی لێوە بکرێ... بەجیهانیبوون هیچ ئاراستەیەکی روون و دیاریکراوی نیە (Giddens, 1994b: 96).

ئێستاکە پێوەندییەکی لاواز لە نێوان "بەکارهێنانی کاڵا کولتوورییەکان" کە زۆرتر بەرهەمی سنعەتی کولتووریی رۆژئاواین و شوناسێکی جیاوازی رۆژئاوایی لە گۆڕێ دایە. رۆژئاواییەکان خواردنی مەك دۆنالد، پۆشینی شەلوارە جیینەکان و تەماشاکردنی بەرهەمەکانی هالیوود زۆر بە مایەی شانازی نازانن، چونکە ئەو بەرهەمانە "بە هی خۆیان" نازانن. بەرهەمە کولتوورییەکانی ئێستاکە بە خێرایی لە بەستێنە ناوچەییەکانی خۆیان دەرباز دەبن و جیهانی دەبن. کەواتە کولتووری جیهانی هەر چییەك بێ، تەنیا هەڵگری شوناسی کولتووری/ جوغرافیایی یان نەتەوەیی تایبەت نابێ (Tomlinson, 1999a: 28).

خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە پرۆسەی بەجیهانیبوون لەگەڵ ئەوەی کە دەستەبەرکەری کولتوورێکی جیهانییە، بەستێن و دەرەتانی بۆ خۆدەرخستنی کولتوورەکانی دیکەش خۆش دەکا. لە فەزای کۆمەڵایەتیی جیهانیی بەرهەمهاتوو لە پەستێوتراویی فەزا و زەمەندا سەرمایەداری جیهانی و تایبەتگەرایی کولتووریی توندوتیژانە، هێزەباڵادەستەکانن بەڵام بڕیاردەری سەرەکی نین. لەم فەزایەدا ماناکان و شکڵە مانادارەکانی سەرچاوەگرتوو لە سەرچاوە مێژووییە جیاوازەکان کە لە راستی دا سەر بە فەزای جیاواز بوون، دەتوانن پێگەیەکیان هەبێ. بە دەربڕینێکی روونتر لە دنیای هاوچەرخ دا هەموو سەرچاوە کولتوورییەکان (ئایین، موسیقی، فیلم و...) لە پانتایی جیهانی دا ئامادە دەبن، هەرچەند کە رەنگە کاریگەری و شوێندانانی یەکێك لەوان زۆرتر بێ (Hannerz, 1992: 96).

دیارە ئامادەیی لە گۆڕەپانێکی ئەوتۆدا پێویستی بە هەوڵ، گۆڕانکاری، بونیادنانەوە و نوێکردنەوەی کولتووری هەیە. لە سەردەمی بەر لە مۆدێرن دا، کولتوورەکان لە چوارچێوەی سنوورەکان و لە نێو فەزا تاڕادەیەك بەستراوەکان دا درێژەیان بە ژیان دەدا و لەگەڵ فشار و رکەبەرایەتییەکی ئەوتۆ بەرەوروو نەبوون. بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون بە تێکدانی ئەم جۆرە سنوورانە و فەزا بەستراو و ئارامەکان، هەموو کولتوورەکان ناچار دەکا بۆ مانەوەی خۆیان هەوڵ بدەن و رکەبەرایەتی بکەن. کەواتە بەجیهانیبوون لەگەڵ ئەوەی کە دەستەبەرکەری جۆرێك هاوچەشنیی کولتوورییە، دەرەتان و بواریش بۆ کولتوورەکانی دیکە پێك دێنێ تا بە شێوەی





جۆراوجۆر خۆیان بونیاد بنێنەوە و بپارێزن. لە دێڕەکانی دواتر دا باس لەم خاڵە دەکەین کە کولتوورەکان چۆن بە شێوەیەکی ناتایبەتگەرایانە خۆیان بونیاد بنێنەوە و دەپارێزن.

## پێکەوەژیان و ئاوێتەبوونی کولتووری

هەروەك پێشتر باس کرا لە رابرووددا پەرچەکردارە کولتوورییەکان لە نێوان گرووپە کۆمەڵایەتییەکان دا زۆر سنوورداربووە. هۆکارە جوغرافیایی و ئیکۆلۆژیکییەکان و بەرگری کولتووری لە بەرانبەر هەر چەشنە پێوەندییەك لەگەڵ بیانەدا پێکەوە پانتایی پێوەندییەکان و پەرچەکردارە کولتوورییەکانیان زۆر بەرتەسك دەکردەوە. تەنیا بازرگان و جیهانگەڕەکان (گرێدەرەکان)دا بوون کە دەرەتانی پەرچەکرداری بچووکی کولتوورییان پێك دێنا و هێندێك جاریش جاڕدەرە مەزهەبییەکان و هێزە سوپاییەکان ئەرکێکی ئەوتۆیان بەڕێوە دەبرد.

بەڵام گۆڕانکارییە تاڕادەیەك سروشتییەکانی قەوارە بەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە ئەمریکا (ئازتك و ئینکا)، ئۆراسیا (ئمپراتۆری مەغوول و عوسمانی) و ئاسیای باشووری رۆژهەڵات و دواتر هێندێك پێشکەوتنی تێکنیکی لە بیاڤی تێکنۆلۆژیی گوازتنەوە و پێوەندییەکان دا کە بەستێن خۆشکەری بەجیهانیبوون بوون، ئەم دۆخەی بە تەواوی تێك دا. هۆکارە جۆراوجۆرە سنووردارەکەرەکانی پێوەندی و پەرچەکردارە کولتوورییەکان وردە وردە لە نێوچوون و رۆژ لەگەڵ رۆژ بە پانتایی پێوەندییە کولتووریەکانەوە زیاد بوو و تەنانەت سنوورەکانی دوورترین یەکە کۆمەڵایەتییەکانیش لە بەردەم چوارچێوەی کولتووری جیهانی دا کرانەوە (Appadurai, 2000: 322).

بەم پێیە دەتوانرێ بگوترێ کە پرۆسەی بەجیهانیبوون تایبەتمەندییەکەی بریتیە لە رەوت، رەوانی و پێوەندی. ئێستاکە رێژەیەکی شایانی سەرنج لە حەشیمەتی جیهان لە گەشتیارەکان، کۆچەرەکان، پەناخوازەکان، دوورخراوەکان، کرێکارە میوانەکان و... پێك دێ و رۆژ بە رۆژ ژمارەیان زیاد دەکا. تێکنۆلۆژییە ساکار و ئاڵۆزە میکانیکی و نەرم ئامێرییەکان بە خێرایی لە سنوورە جۆراوجۆرەکان تێدەپەڕن. سەرمایەی جیهانی بە شێوەیەکی بێ وێنە لە جیهان دا کەوتۆتە بزووتن. توانایییە ئیلکترۆنییەکانی بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی زانیاری بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر زۆرتر دەبن. گرنگتر لە هەمووان ئەوەیە کە هزر و وێنا و توخمە کولتوورییەکانیش هەموو سنوورەکان و کۆسپە نەتەوەییەکان دەبڕن.

کەواتە لە دنیای هاوچەرخدا، کولتووریش وەك ئابووری و سیاسەت دەکەوێتە چوارچێوەی ڕەوتە جیهانییەکانەوە و دەرەتانی هەر چەشنە جێگیربییەکی کولتووری لە نێو دەچێ. لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا، توخمە کولتوورییە جۆراوجۆرەکان لە بەستێن و نیشتمانی دیاریکراو جیا دەبنەوە و لە فەزای جیهانی دا هەڵ دەواسرێن و هەر ئەو فەزا جیهانییە دەبێتە گۆڕەپانی ئامادەیی و وێك کەوتنی کولتوورە جۆراوجۆرەکان. لە ڕاستی دا ئەم کولتوورانە دەربازگەیەکیان بۆ دەربازبوون لەم گۆڕەپانە نیە.

ئەم وێککەوتنانە و لە پەنا یەك هەڵکەوتنانە کێشە خولقێنن و زۆرتر کێشە و تایبەتگەرایی جۆراوجۆری کولتوورییان لـێدەکەوێتەوە کە دواتر شی دەکرێنەوە، بەڵام دەرەتانگەلێکیش بۆ پێکەوەژیان و ئاوێتەبوونی کولتووری پێك دێنن. بە سەرنج دان بەم دەرەتانانەیە کە دەرەنجامە کولتوورییەکانی بەجیهانیبوون ناتوانین لە ئیمپریالیسم و یەك دەست بوونی کولتووری و تایبەتگەرایی کولتووری دا کورت بکەینەوە. ئەم پرۆسەیە ئاسۆیەکی زۆر بەرین لە بەردەم کولتوورە تایبەتەکان دا دەکاتەوە و گەنجینەیەك لە توخمە کولتوورییە پڕ ئەژمارەکان دەخاتە بەر دەست ئەو کولتوورانەوە.

لەم ڕووەوە دەبێ بگوترێ کە پرۆسەی بەجیهانیبوون بەستێن سازی قۆناخێکی نوێیە لە ڕێکخستنی زەمەن و فەزا و سەرزەوی دا و بەم پێیە ڕێکخستنی فەزا کۆمەڵایەتییەکان. ئەم قۆناخە لە لایەنی جۆراوجۆرەوە لەگەڵ قۆناخی ناسیۆنالیسم و قۆناخی بەر لەو جیاوازیی هەیە و دەرەتانگەلی زۆرتر بۆ کولتوورسازی و شوناس سازی پێك دێنێ. ئەم قۆناخە گەرێکی کەم وێنە لە مێژووی کولتووری جیهانی دایە، چونکە سەرەنجام مرۆڤ چۆتە دنیایەکەوە کە موزاییکێکی کولتووری کە لە پارچەگەلی جیاواز پێك هاتووە دەگرێتە خۆی (Hannerz, 2000: 331).

لەو قۆناخانەدا کە ناسیۆنالیسم نەببوو بە گوتاری زاڵ، نموونەی باڵادەست بۆ ڕێکخستنی فەزای کۆمەڵایەتی نموونەیەکی ناوچەیی بوو و هەموو پێوەندییەکان و پەرچەکردارەکان و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان لە فەزایەکی کۆمەڵایەتیی ناوچەیی شوێنمەند دا بەرهەم و دووبارە بەرهەم دەهاتنەوە. بەم پێیە کولتوور و شوناسیش لەگەڵ سەرزەویی ناوچەیی (نیشتمان) پێوەندییەکی توندیان هەبوو و سەرەڕای بوونی کولتوور و ڕێکخستنە سیاسییە بان نەتەوەییەکان وەك ئایینە جیهانییەکان و ئیمپراتۆرییە گەورەکان، مرۆڤەکان زۆرتر بە مێژوو و کولتووری سەرزەویی ناوچەیی خۆیانەوە شوناسیان پەیدا دەکرد.



ئەم دۆخە بە زاڵبوونی ناسیۆنالیسم بە تەواوی گۆڕا. فەزا ناوچەییەکانی کولتوور کەم تا زۆر تێك ڕووخان، کولتوور "نەتەوەیی" بوو و ڕووبەری سەرزەویی کولتوور و شوناس بە ڕادەیەکی زۆر بەرین بۆوە. لە ژێر کاریگەریی زنجیرەیەك گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی- سیاسی دا، کولتوور و شوناسێکی تایبەت بەهێز بوو و چەندین کولتوور و شوناسی تایبەتی دیکەی لە چوارچێوەی سنوورە "نەتەوەیی"یەکانی دا کۆنترۆڵ کرد. لەم چوارچێوەیەدا گرنگترین ئەرك و ئامانجی کولتووری باڵادەست، تێکدان و تێك ڕووخاندنی فەزا و سنوورە کولتوورییە ناوچەییەکان و جێگیر و ئەستوور کردنی سنوور و فەزای کولتووریی نەتەوەیی بوو.

لە هەر دووك قۆناخ لە مێژووی کولتووری جیهانی دا، کولتوور و شوناسی سەرزەوی تەوەر و شوێنمەند بوون و سنووری ناوچەیی و نەتەوەیی دیاریکراویان هەبوو. هەروەها بەهێندەگرتنی پێوەندیی نێوان کولتووری و دزە هەڵ نەگریی ڕێژەیی ئەم سنوورانە گرنگترین هۆکاری بەردەوام بوونی کولتووری ناوچەیی و نەتەوەیی بوون. دیارە بە پێچەوانەی کولتووری ناوچەیی، لە کولتووری نەتەوەییدا لایەنی ئاوێتەکارانە، هاوچەشن سازی و سەپاندن زەقتر بوو و سیاسەت و دەسەڵات ڕۆڵێکی ڕاشکاوانەتر و گرنگتریان هەبوو (Hall, 1996: 296).

بەم پێیە دەتوانین کولتوورە نەتەوەییەکان بە کۆمەڵ گەلێکی دەرهەست دانێین کە بە هۆی ئەو گوتارانەوە دروست کراون کە گرێدراوی دەسەڵاتن. لە درێژایی چەندین دەیەدا گوتارەکانی کولتووری نەتەوەیی بە چەشنێك زاڵ بوون کە شوناسی نەتەوەیی و نەتەوایەتی بە بەشێك لە سروشتی مرۆڤ دەژمێردرا و وا دەهاتە بەرچاو کە مرۆڤێك هەروەك کە دەبێ کەپۆیەك و دوو گوێچکەی هەبێ، دەبێ نەتەوەشی هەبێ (Gellner, 1993: 6). کەواتە لە ڕاستی دا گوتارە نەتەوەییەکان هەم کولتوور و هەم شوناس دروست دەکەن.

بەم چەشنە لە مێژووی مۆدێرن دا، کولتوورە نەتەوەییەکان بە سەر نوێبوونەوەدا زاڵ بوون و سەرچاوە تایبەتگەرایانەترەکانی شوناسخوازیی کولتوورەییان وردە وردە لە گۆڕەپان وەدەرنا. ئەم کولتوورانە کە لە پرۆسەیەکی سەرکوتی توندوتیژانەی جیاوازیی کولتووری دا دروست بوون، هەرگیز بەستێنێکی شیاویان بۆ پێکەوەژیان و ئاوێتەبوونی هێمانەی کولتوور پێك نەهێناوە، بەڵکوو هەمیشە جیاوازییان وەك یەکگرتوویی نیشان داوە و شێوازی یەکگرتووکردنی جیاوازییەکانیان گرتۆتەبەر.

بێ توانایی کولتووری نەتەوەیی لە ئامادەکردنی بەستێنێکی لەبار بۆ فرەیی و پێکەوەژیانی کولتووری لە پلەی یەکەم دا بۆ ناخ باوەڕی و دەروونگەرایی ئەو دەگەڕێتەوە. هەر کولتوورێکی

نەتەوەیی خۆی دەخاتە بەرزترین[شوێنی] پلەبەندییە کولتوورییەکان و هەموو چالاکییەکان بۆ خۆی دادەنێ. لە لایەکی دیکەشەوە کولتوورەکانی دیکە دەخەنە پێگەیەکی نزمەوە و تایبەتمەندیی نەرێنیی پێ دەبەخشن. هەر بەم هۆیەیە وەك بینراوە کولتوور و شوناسە نەتەوەییەکان لە سەر ئۆستوورە زۆر کۆنەکان کە سەر بە قۆناخی رازەکانن و لە سەر نەتەوەیەکی نژاد پاك بونیاد نراون (Hall, 1996: 294 – 95).

روونە کە لە چوارچێوەی ئەم جۆرە گوتارانەدا جێگایەك بۆ پێکەوەژیانی کولتووری بوونی نابێ. کولتووره نەتەوەییەکان نەك هەر لە سەرکوت و سنووردارکردنی کولتووره ژێرنەتەوەییەکان غافڵ نابن، بەڵکوو سەبارەت بە کولتووره بان نەتەوەییەکانیش کە رەنگە یەکگرتوویی و یەکپارچەیی نەتەوەیی بخاتە مەترسییەوە، زۆر هەستیارن. بە پێی گوتاری جێگای باس، باشترین شێوازی لاوازکردن و لە نێوبردنی هۆکار خەوشدارکەر و وەمەترسیخەرەکانی کولتوور و شوناسی نەتەوەیی، بەرگرتن لە ئاوێتەبوون و تێکەڵاویی کولتووری و پاك کردنەوەی هەرچی زیاتری کولتووری نەتەوەیی لە بەش و توخمە نارەسەنەکانە.

زاڵێتیی نموونەیەکی ئەوتۆ بە سەر ژیانی کولتووریی مرۆڤەکان دا و ناخ باوەڕیی کولتووریی سەرچاوەگرتوو لەو، هەر چەشنە دەرەتانێکی ئاوێتەبوون و تێکەڵاویی کولتووری کە لە رێگای پێوەندییە لاوازە کولتوورییە بان نەتەوەیی و بان ناوچەییەکان (ئاوارەبوونی قەومی، کۆچ...)ەوە پێك دێ، لە نێو دەبەن. لە راستی دا بەشێك لە مێژووی کولتووریی جیهان بریتییە لە سەرکوتی پێکەوەژیان و فرەیی کولتووری لەلایەن ناسیۆنالیسمی رۆمانێك، نژادپەرستی، ئێتنیك گەرایی، رابوونی ئایینی و شۆڤێنیسمی ژیاری کە لەگەڵ هیچ جۆرە ژیانێکی چەند کولتووری ناسازێ. (Pieterse, 2000: 104 -105).

پرۆسەی بەجیهانیبوون ئەم دۆخەی گۆڕیوە و بە لێبراوییەوە دەتوانین بڵێین لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم و سەرەتا سەدەی بیست و یەکەم دا، ناسیۆنالیسم بە هیچ روویەك تەنیا سەرچاوەی کولتوورساز و شوناسبەخش نیە. ئێستاکە جیهان ئەوەندە پەستێوتراوە و بچووك بۆتەوە کە دەوڵەتەکان ناتوانن بە پارێزگاری کردن لە سنوورەکان و فەزا نەتەوەییەکان، ئەرکی شوناس سازی جێ بە جێ بکەن. لە راستی دا جیهان چۆتە قۆناخێکی نوێ لە "سیاسەتی جیاوازی" و "سیاسەتی شوناس"ەوە کە لەو دا، دەوڵەتە نەتەوەییەکان پێگەیەکی ئەوتۆیان نیە (Gillo, 1998: 227).



لەم قۆناخە لە مێژووی کولتووریی جیهان دا کە تایبەتمەندیی ئەو لێك تەنراویی و لێك گرێدراویی بەرانبەری پێوەندییە کۆمەڵایەتی، کولتووری، ئابووری و سیاسییەکانە، رێگا بە هیچ جۆرە ناخ گەراییەکی کولتووری- کۆمەڵایەتی نادرێ (Werbner, 1997: 6). تێکچوون و تێك رووخانی شوناسە سانتراڵ و بەستراوەکانی سەر بە کولتووره نەتەوەییەکان، کاریگەریی فرەیی خولقێنانەی لە سەر شوناسەکان دەبێ، چونکە دەرەتان و پێگەی جۆراوجۆر و نوێی شوناس دۆزینەوە بەرهەم دێ و شوناسەکان سیاسی تر، فرەیی تر و جۆراوجۆرتر دەکەن (Hall, 1996: 309).

لە چوارچێوەی ئەم دەرەتان و پێگە نوێیانە دایە کە پێکەوە ژیان و ئاوێتەبوونی کولتووری دروست دەبێ. بە واتایەك، پرۆسەی بەجیهانیبوون زۆر لە کولتوورەکان دەخاتە پەنایەك و ئەوان ناچار دەکا لە هەلومەرجێکی نوێ‌دا کە تایبەتمەندییەکەی چڕی و تێکەڵاوبوونی فەزا کولتوورییەکان و بە تایبەت ئامادەیی بە هێزی کولتوورێکی جیهانییە، درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن. هێندێك جار، کولتوورەکان ئەم دۆخە قەبووڵ ناکەن، بە جۆرێك تایبەتگەرایی سەرسەختانە و توندوتیژانە پەرچەکردار نیشان دەدەن، بەڵام جاری واشە مل بۆ دانوستاندنی هەرچەند دژوار و پڕکێشە لەگەڵ ژینگەی کولتووریی خۆیان رادەکێشن.

دیارە هەروەك پێشتر باس کرا، پێکەوەژیان و ئاوێتەبوونی کولتووری زۆر زیاتر لە چەند ساڵ یان دەیە تەمەنی هەیە و مێژووی کولتووری جیهانی وێنەی جۆراوجۆری لەم چەشنە ژیان و پێوەندییە کولتوورییانە تێدایە. بەڵام زاڵێتیی بەردەوامی ناخ باوەڕیی کولتووری، دەرەتانێکی ئەوتۆی بۆ دەرکەوتنی ئەو نەدەهێشتەوە و پێکەوەژیان و ئاوێتەبوونی کولتووریی وەك جێگرەوەی شیاوی ژیانی کولتووری _ کۆمەڵایەتی سەرکوت دەکرد. لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا زاڵێتیی گوتاری نەتەوەیی لەرزۆك بوو و بەستێنێکی لەبار بۆ گوتارەکانی دیکە لەوانە پێکەوە ژیان و ئاوێتەبوونی کولتووریی ئامادە کرد.

چەمکی ئاوێتەبوون یان پێوەند[48] کە تەوەری باسی هێندێك لە توێژەرانی کولتوورییە، لە بیاڤی میعمارییەوە چۆتە نێو تیۆرە نوێیە پۆست مۆدێرنەکان و لە رێگای ئەویشەوە رێگای کەوتۆتە نێو موتالا کولتوورییەکانەوە. چەمك[49] لە راستی دا سەر بە زانستی ژین ناسییەوە و بە مانای ئاژەڵ یان روەکی دوو تۆرەمە یان پێوەندکراوە. لە بیاڤی زمانناسیش دا ئەم چەمکە

48- hybridization

49- hybird



بە وشەیەك دەگوترێ کە نیوەی لە زمانێك و نیوەکەی دیکە لە زمانێکی دیکەوە وەرگیرابێ (Grillo, 1998: 232). کەواتە هەر جۆرە بەکارهێنانێکی چەمکی پێوەند یان ئاوێتەبوون دەستەبەرکەری جۆرێك ڕەت کردنەوەی بابەتی بێوێنە، پاك، ڕەسەنایەتی و ناخ باوەڕی و پێداگرتن لە سەر تێکەڵاوبوون، هاوسەنگ کردن، دانوستاندن و ئاوێتەبوونە.

ڕێ تێکەوتنی ئەم چەمکە لە بیاڤی توێژینەوە کولتوورییەکان و بەکارهێنانی زۆرتری ئەو لە لایەن کولتووره توێژە جۆراوجۆرەکانیشەوە نیشانەی ئەم ڕاستییە نوێیە لە ژیانی کۆمەڵایەتی — کولتووریی ژیانی ئێستا دایە کە هەمان ژیانی چەند کولتوورییە. ئەم ڕاستییە ئاماژەیە بەوەی کە سەردەمی ژیان لە فەزای داخراو و سنووورداری کولتووری دا تێپەڕیوە و هەوڵ دان بۆ دروست کردنەوەی فەزایەکی ئەوتۆ نەك هەر دژوارە بەڵکوو نالواویشە، بەڵکوو مەترسی و تیچووی قەرەبوو نەکراوی هەیە. بەم پێیە دەبێ لە فەزای کولتووریی ئاوێتەکراوە و چەمهەڵگردا ژیان بکرێ (Lyon, 1999: 96 – 98).

ئەم جۆرە پەرچەکردارە گشتگەرایانە لە بەرانبەر پرۆسەی بەجیهانیبوون دا، دەربڕی چەمهەڵگریی کولتووری و توانایی هێندێك لە کولتوورەکانە بۆ ڕاکێشان و ئاوێتەکردنی توخمەکانی کولتوورەکانی دیکە. پرۆسەی ناوبراو فەزایەك پێك دێنێ کە نیشانە جۆراوجۆرە کولتوورییەکان دەتوانن لە چوارچێوەی ئەو دا پێکەوە بژین و لەگەڵ یەکتری تێکەڵاوبن. لە ڕاستی دا ئەوەی بەهابا پێی دەڵێ "فەزای سێهەم"، گرێدراوی فەزایەکە کە بە گۆڕەپانی پشکوتنی توانای داهێنان، تواناییە هێزەکییەکانی توخمە کولتوورییە جۆراوجۆرەکانی وەك زمان دەژمێردرێ (Bahabha, 1994: 4).

ئەمڕۆکە نیشانە و ئاماژەکانی ئەم جۆرە ئاوێتەبوون و پێکەوەژیانە کولتوورییە پڕئەژمار و جۆراوجۆرانە تەنانەت لە دوورکەوتووترین یەکە کۆمەڵایەتییەکان و یان ئەو کۆمەڵگەیانە دا کە خەبات دژی هێرش و ئاوێتە بوونی کولتووری بە ئەرکی سەرەکیی خۆیان دەزانن و بۆ بووژاندنەوەی کولتووری ڕەسەن تێدەکۆشن، تاکەکان لە چوارچێوەی کولتوورێکی دیاریکراوی پاکژ دا ناژین. ئەگەرچی بەشی بەرچاوی ئاکار و پێوندییە کۆمەڵایەتییەکانی تاك لە ژێر کاریگەریی کولتووری ناوچەیی یان نەتەوەیی دایە، بەڵام بەشێکی هەرچەند کەمیش کاریگەریی لە کولتووره ناخۆجێیەکان وەرگرێ.

لەم ڕوانگەیەوە، ئەو سیستمە واتاییانەی کە هەر تاکێك یا گرووپێك وەردەگرێ و ڕایدەکێشێ، ئاوێتەیەك لە چەندین کولتوور و وردە کولتووری خاوەن سەرچاوە و ژینگەی





جیاوازە. زۆر لە کۆمەڵگەکان لە خۆگری تاك و گرووپ گەلێکن کە هەروا لە سەر ئایینی پێشینیانی خۆیانن، بەڵام بۆ تێپەڕکردنی کاتی بەتاڵی خۆیان بە توندی کاریگەری لە کولتوورێکی دیکە وەردەگرن. بودابیەك ڕەنگە لە بەڕێوەبردنی ڕێورەسمە ئایینییەکانی خۆیدا زۆر سوور بێ، بەڵام موسیقیی پاپی ئەمریکایی دەخاتە سەرووی موسیقیی خۆجێییەوە. ئەم جۆرە بابەتانە کە وێنەیان زۆرە، نیشانەی جۆراوجۆربوون و فرەجۆریی سەرچاوەکانی کولتووریی ژیان و پەرچەکردارە دوو لایەنەکانی تاکەکانە کە بەرهەمی جیابوونەوە و دەربازبوونی کولتوور لە چوارچێوەی نیشتمان و نەتەوەیە (Albrow, 1996: 163 -64).

بە سەرنجدان بەم ڕووکارەی ژیانی کۆمەڵایەتی لە جیهانی هاوچەرخ دا دەتوانین باس لە ئابووریی کولتووری بکەین. ئێستاکە بازاڕێکی جیهانی شکڵی گرتووە کە کاڵای کولتووریی زۆر جۆراوجۆر و پڕ ئەژمار دەخاتە بەرچاو. هەر تاکێك کەم تا زۆر دەستی بەم بازاڕە ڕادەگا و لە هەر جێگایەکی دنیا بێ، دەتوانێ هەر شتێك کە پەسندی دەکا هەڵی بژێرێ. ئەگەرچی زۆر لەو کاڵایانەی کە لەو بازاڕەدا دەخرێنە بەرچاو، بەرهەمی ڕۆژئاواو بە تایبەت ئەمریکان، بەڵام لە نێو ئەوان دا کاڵای نارۆژئاواییش دەست دەکەوێ (Lechner, 2000: 283).

کەواتە دەکرێ بگوترێ لە هەموو کۆمەڵگە و هەموو بیاڤەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دا، ئەو کاڵایانەی تاکەکان بەکاریان دێنن بەرهەمی بەرهەمهێنەرێکی تایبەت نین. ڕەوتە جیهانییەکانی فکر، وێناکان، شێوازەکانی ژیان و بە تایبەت مرۆڤەکانی زۆر لە کۆمەڵگەکانی کەم تا زۆر کردۆتە گۆڕەپانی ئامادەبوونی کولتووره جۆراوجۆرەکان و پێکەوەژیان و ئاوێتەبوونی کولتووری. بەڵام زەقترین هێمای پێکەوە ژیان و ئاوێتەبوونی کولتووری، ژیانی ئەو تاك و گرووپانەیە کە بە هۆکارگەلێك نیشتمان و زێدی خۆیان بە جێ هێشتووە و لە سەرزەوییەکی دیکە نیشتەجێن.

ئەوان مرۆڤگەلێکن کە بۆ هەمیشە لە نیشتمان و سەرزەویی باب و باپیرانیان دوور کەوتوونەتەوە و بێجگە لە سازان و پێکەوە ژیان لەگەڵ کولتووره نوێیەکان چارەیەکیان نیە. بەڵام سەرەڕای ئەوەش لە هەمان کات دا کە تووشی وەهمی گەڕانەوە بۆ ڕابردوو نەبوون و دڵیان لە لای نیشتمانی دایکیانە. بە دەربڕینێکی دیکە ئەوان نە لە کولتووری کۆمەڵگەی خانەخوێ دا بە تەواوی ئاوێتە بوون و نە دژایەتی کولتووری ئەو کۆمەڵگایە دەکەن و نە بۆ بوژاندنەوەی کولتووری یەکەم ڕادەپەڕن. لە ڕاستی دا ئەو مرۆڤانە فێر دەبن کە لانیکەم لەگەڵ کولتوور بژین (Hall, 1996: 310).

جۆرێك ئاڵۆزی، فرەیی و ڕەوانیی کولتووری، تایبەتکەری ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەو مرۆڤانەیە کە لە فەزایەکی کولتووری- کۆمەڵایەتیی ئەوتۆدا دەژین. لە هێندێك لە بوارەکانی ژیان دا، بە تایبەتی بوارە گشتی ترەکان دا، کۆچەرە میوانەکان زۆرتر لە چوارچێوەی کولتووری خانەخوێ دا کار دەکەن و بە کەم ڕەنگتر بوونی توخمەکانی کولتووری یەکەم ڕازی دەبن، بەڵام کولتووری زاڵ بە سەر بیاڤە تایبەتی ترەکانی ژیان دا، کەم تا زۆر کولتووری کۆچەرە کە لە بوارەکانی وەك وتووێژ کردن بە زمانی دایك، بەڕێوەبردنی جێژنە نەریتییەکان و سووربوون لەسەر هێندێك ڕێوشوێن و ڕێورەسمی ئایینی دا دەردەکەوێ.

دیارە نموونەی ژیانی چەند کولتووری بە پێی هەڵکەوتن و دۆخی کۆچەرەکان جیاوازیی هەیە. زۆرتر بەرەی کۆنتر لە کۆچەران کە بۆخۆیان بەرهەمی ڕاستەوخۆی کلتوری سەرزەویی سەرەکین، بە بەراورد لەگەڵ بەرەی نوێ کە بە بێ گرێدەر (ڕاستەوخۆ) کولتووری یەکەمیان ئەزموون نەکردوە، بە پارێزێکی زۆرترەوە مل بۆ پێکەوە ژیان و ئاوێتە بوونی کولتوور(بێگانە) ڕادەکێشن. لەم جۆرە کۆمەڵگەیانەدا زۆرتر باوك و دایك سەبارەت بەوە کە ڕۆڵەکانیان ڕۆژ بە ڕۆژ — تەنانەت لە ماڵیش دا — بە زمانێکی دیکە قسە دەکەن و چێژ لە موسیقیی ئاڵۆزتر و قەرەباڵغتر وەردەگرن و زیاتر ڕابردووی خۆیان لە بیر دەکەن، هەست بە ڕەزامەندی ناکەن (Parekh, 1996: 323).

هەروەها ئەو کەسانەی کە کۆچی ئەوان کەمتر لە ژێر فشار و زۆر دابووە، لەگەڵ کولتوور یان کولتوورە خانەخوێییەکان ساناتر هەڵ دەکەن. بەڵام بۆ پەنابەران، دوورخراوەکان و تەنانەت کرێکارە کۆچەرەکان، مل ڕاکێشان بۆ ژیانی چەند کولتووری دژوارترە. ئەوان هەوڵ دەدەن بە پێك هێنانی کەمترین ئاڵۆزی و ناکۆکی، لانی زۆری پێبەندبوون بە کولتووری نیشتمانی سەرەکیی خۆیان بپارێزن. بەم حاڵەش، دژایەتی کردن لەگەڵ کولتووری خانەخوێ و هەوڵ دان بۆ بوژاندنەوەی تەواوی کولتووری یەکەم، بە هیچ شێوەیەك لایەنی باڵادەستی ژیانی کۆمەڵایەتی — کولتووریی ئەم جۆرە مرۆڤانە پێك نایەنێ.

زیاتر لەمانە، نموونەی دیکەش لە ژیانی چەند کولتووری و ئاوێتەبوونی کولتووری دەتوانین دەس نیشان بکەین کە نیشانەی دەرەتانە جۆراوجۆرەکانی پلۆرالیسمی کولتوورین. ئەمرۆکە بێبەستێن بوونی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان و نیشانە کولتوورییەکان، زۆر لە یەکە کۆمەڵایەتییە شاری، خۆجێیی، نەتەوەیی و ناوچەییەکانی کردۆتە گۆڕەپانی ئامادەیی کولتوورە جۆراوجۆرەکان و کۆچی ڕوولە زیادبوونی بان نەتەوەیی و بان ناوچەییش پێکەوەژیان و





ئاوێتەبوونی کولتووریی بۆ وێنە لە شارە گەورەکانی وەك لەندەن، نیۆیۆرك، پاریس و لوس ئانجلێس کردۆتە شتێکی بێ ئەملا و ئەولا (Albrow, 2000: 119 – 122).

بە کارهێنانی وشە و چەمکە جیاوازەکان لە توێژینەوە کولتوورییەکانیش دا دەربڕی فرەیی و جۆراوجۆریی پێکەوە ژیان و ئاوێتەبوونی کولتوورییە. زۆر لە کولتوورتوێژەکان جگە لە چەمکی پێوەند و ئاوێتەبوون لە چەمکگەلێکی دیکەش بۆ باس لەم لایەنەی ژیانی کۆمەڵایەتی — کولتووری کەڵك وەردەگرن. ستوارت هال وشەی "translation" بە کار دەبا تا نیشان بدا لە سەردەمی بەجیهانیبوون دا، بێجگە لە بونیادگەرایی کولتووری و توانەوەی کولتووری، دەرەتانێکی دیکە بۆ کولتوورەکان هەیە (Hall, 1996: 310).

هۆڵتۆن بۆ ڕەخنەگرتن و کەمتەرخەمییەی تیۆریستەکانی وەك ئانتۆنی سمیت سەبارەت بە "شێوە لواوەکانی پێکەوەژیان" و شکڵ گرتنی کولتوورێکی جیهانی باس لە syncretization دەکا. بە ڕای ئەو چەمکی ناوبراو بریتییە لە دەرەتانی کۆکردنەوەی توخمە جۆراوجۆرە کولتوورییە بێ بەستێن کراو و هەڵواسراوەکانی لە فەزای کولتووریی جیهان دا و دووبارە بونیادنانەوەی ئەوان لە چوارچێوەیەکی کولتووری نوێ دا کە واتا بە ژیانی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەی جیهانی دا دەبەخشێ. ئەم کولتوورە نوێیانە پێوەندییان بە ڕیشەگەلی کولتووریی تایبەتەوە هەیە، بەڵام لە فەزا و زەمەنێکی زۆر بەرین دا پەرەیان ئەستاندوە و دەرەتانی پێکەوەژیان و ئاوێتەبوونی کولتووریی پێك هێناوە (Holton, 1998: 160).

هانێرزیش کە قسە لە زێدەبوونی بەرچاوی ترافیکی کولتووری و ڕاگوازتن و گواستەوەی بەربڵاوی سیستمە واتایی و شکڵە هێماییەکان وەك تایبەتمەندیی زەقی ژیانی کولتووریی جیهانی هاوچەرخ دەکا، شیاوترین وشە بۆ وەسف کردنی پێوەندیی زێدەرووی کولتووری بە crealization دەزانێ. ئەو لەم ڕووەوە ئەم وشەیە بە شیاو دەزانێ کە دەربڕی ڕاستیی گرنگی کولتوورە: کولتوورەکانیش وەك زمانەکان لە ناخیان دا ڕیشەیەکی تێکەڵاویان هەیە و لە لایەنی مێژووییەوە ڕەسەن و هاوچەشن نین (Hanners, 2000: 331 – 337).

ئەم پێکەوە ژیان و ئاوێتەبوونانە لەگەڵ ئەوەی وەك یەك نین، هەموویان تایبەتمەندییەکی هاوبەشیان هەیە کە ئەویش پەرچەکرداری ناتایبەتگەرایانە و نابونیادگەرایانەی کولتوورییە لە بەرانبەر پرۆسەی بەجیهانیبوون دا. هەموو ئەو مرۆڤ و گرووپانەی کە ژیان و هەڵسوکەوتیان دەکەوێتە چوارچێوەی ئەم پەرچەکردارەوە، ئەگەرچی فەزای داخراوی کولتووری و جێگیری و دڵنیایی پێوەندیدار بەم فەزایەیان لە دەست داوە، بەڵام بۆ ژیاندنەوەی ئەم فەزایە وەخۆ ناکەون،

بەڵکوو هەوڵ دەدەن لەو فەزا جیهانییە دا کە تایبەتمەندییەکەی ڕەوتە گشتگیرەکانی هێما کولتوورییەکانە، لەگەڵ کولتوورەکانی دیکە دا بژین و ئاوێتە بن (Waters, 1995: 137).

دیارە ئەم پێکەوە ژیان و ئاوێتەبوونە دژوارە لەو فەزایانە دا کە تایبەتمەندییەکەیان چڕیی کولتووری و ئامادەیی زیاتر لە یەك کولتوورە، خۆلادان لە ڕووبەڕووبوونەوە و ناسینی توخمە کولتوورییە نوێیەکان، هەڵبژاردن و وەرگرتنی هێندێك لەو توخمانە و دەست هەڵگرتن لە هێندێك توخمی کولتووریی خۆیی کارێکی نەکراوە. بە دەربڕینێکی دیکە لەو فەزایانە دا، جێگایەك بۆ ئاسوودەیی، تەناهی و ناچالاکبوونی کولتووری- کە فەزای داخراوی کولتووری پێکی دێنا — نیە و مرۆڤەکان دەبێ ئامادەییەکی چالاکیان لە بواری کولتووری دا هەبێ. لەو ڕووەوە ئەو مرۆڤانەی کە مل بۆ پێکەوە ژیان و ئاوێتەبوونی کولتووری رادەکێشن، دەبنە جۆرێك قارەمان (Grillo, 1998: 230).

گیدێنز ئەم کۆمەڵگایانە بەو کۆمەڵگایانە دەزانێ کە خاوەنی ڕێفلێکسیویتیی کۆمەڵایەتین . بە رای ئەو لەم کۆمەڵگایانەدا کە نەریت و سروشت (دوو هۆکاری خولقێنەری بڕوا و جێگیری لە کۆمەڵگە نەریتییەکان) جێگایەکیان نیە، تاکەکان دەبێ هەموو ئەو زانیاریانەی پێوەندییان بە شوێنی ژیانی خۆیانەوە هەیە، بەش بەش و شیبکەنەوە و بە پێی ئەوان بڕیار بدەن. تاکەکانی ئەندامی ئەو کۆمەڵگایانە ڕووبەڕووی جیهانێکی بەرینتر دەبنەوە و دەبێ رادەیەك لە سەربەخۆیی کردەوەیان کە مەرجی مانەوە و ژیانە، هەبێ (Giddens, 1994: 6 – 7, 13).

هەر چۆنێك بێ چ ئەو کەسانە بە قارەمان بزانین چ بە مرۆڤگەلی ڕێفلێکسیو، ژمارەیان لە جیهانی هاوچەرخ دا کەم نیە. هەروەك پێشتر گوتمان، بێجگە لە کۆچەرە جۆراوجۆرەکان، کە ڕووخسارە دیارەکانی پانتایی ژیانی چەند کولتوورین و هێندێك لە شارە کۆچەرخوازەکانی جیهان کە فەزای کولتووریی چڕ و فرەییان هەیە، لە ناوچەکانی دیکەی جیهانیش مرۆڤەکان کەم تا زۆر لەگەڵ کولتوورەکانی دیکە ناسیاوییان هەیە، پێکەوە دەژین و تەنانەت هێندێك لە توخمەکانی کولتوورەکانی دیکەش وەردەگرن. بەڵام زۆربەی جارەکان وەرگرتن و ڕاکێشانی توخمەکانی کولتوورەکانی دیکە و بە تایبەت کولتووری جیهانی بە سانایی ڕوو نادا و جۆرێك دابەزاندن و گۆڕین و خۆماڵی کردنی لەگەڵە کە ئێستا باسی لێوە دەکەین.



## دیالیتکی گشتی/ تایبەت

پێشتر باس کرا کە هێندێك لە تیۆریستەکان، بە تایبەت کولتوورتوێژەکانی پێبەندی تیۆری ئیمپریالیسمی کولتووری، وێنایەکی ساکار لە دۆخی کولتوور لە جیهانی هاوچەرخ دا دەخەنە بەرچاو. لە ڕوانگەی ئەوانەوە هەموو کۆمەڵگەکان کەم تا زۆر لە ژێر کاریگەریی بەجیهانیبوون دان و زیاتر لە پێشوو لە چوارچێوەی سیستمێکی جیهانی دا کە لە ژێر هێژمونیی سەرمایەداریی ڕۆژئاوا دایە ئاوێتە دەبن. بە گوتەیەکی دیکە ئەم پرۆسەیە وەك دێوەزمەیەك هەموو ئەو سنوورە سروشتی و ناسروشتیانەی لە جیهان دا هەن دەبڕێ و هەموو شتێك قووت دەدا. سنوورەکان و بەش و توخمەکانی کولتوورێك تایبەتەکانیش لەم ڕێسایە ڕێزپەڕ نین. بەجیهانیبوون بەستێنی شکڵ گرتن و پەرەگرتنی کولتوورێك پێك دێنێ کە هیچ سنوورێك پێشی پێ ناگرێ. ئەم کولتوورەش وەك تێکەڵاوێك لە کولتووری ڕۆژئاوایی، کولتووری بەرخۆری (بەکارهێنەکی)ی سەرمایەداری و کولتووری ئەمریکایی، کولتوورێکی زۆر پڕ توانایە و لە ئاستی جیهانیدا پەرە دەگرێ. لە ڕاستی دا کولتووری جیهانیی جێگای باس لە پانتایی جیهانیدا خەریکی بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی کاڵاکانی خۆی دەبێ و ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی بەکارهێنەرەکانی ئەو کاڵایانە لە سەرانسەری جیهان دا زیاد دەبێ.

ئەم شەپۆلە کولتوورییە ئەوەندە مەزن و بەهێزە کە وەك دەبینرێ لەگەڵ بەربەرەکانییەکی مکوم بەرەوروو نابێ. بەرگریی کولتوور و وردە کولتوورەکانی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان زۆرتر لەگەڵ شکست بەرەوروو دەبێ و هێندێك جاریش کولتوورە جۆراوجۆرەکان بە بێ هیچ بەرگرییەك لە بەرانبەر کولتووری جیهانیدا دەست بەردەدەنەوە. تەنانەت دژە کولتوورەکان و کولتوورە بەرگریکارەکانیش توانای بەرەنگارییەکی کاریگەر و شوێندانەریان لە بەرانبەر ئیمپریالیسمی کولتووری دا نیە و درەنگ یان زوو لە کولتووری جیهانی دا ئاوێتە دەبن یان دەخرێنە پەراوێزەوە (Sklair, 1998: 302).

بەم پێیە یەکێك لە دەرکەوتە گرنگەکانی پرۆسەی بەجیهانیبوون بریتییە لە هاوچەشن و یەکدەست بوونی کولتووری کۆمەڵگە مرۆییە جۆراوجۆرەکان لە ڕێگای بەجیهانیبوونی کولتوورێکی تایبەتەوە. لەم پرۆسەیەدا هەر جۆرە جیاوازی و جۆراوجۆرییەك کەمڕەنگتر دەبێ و لە نێو دەچێ و نیشانەگەلێکی هاوچەشنی کولتووری بە سەر ژیانی مرۆڤەکان دا زاڵ دەبێ. بە درێژە کێشانی ئەم دۆخە زۆر ناخایەنێ کە بیرکردنەوە، گوتار و کردارێکی تاقانە زاڵ دەبێ و هیچ جۆرە جیاوازی و بابەتێکی تایبەت لە جیهان دا نامێنێ.

قسەیەکی ئەوتۆ بە هیچ شێوەیەك لە حەقیقەت بێ بەری نیە و لە راستییەکی کولتووریی گرنگی جیهانی هاوچەرخ نزیکە، بەڵام تەواوی راستییەکە دەرنابڕێ. ئەگەرچی ناتوانین حاشا لە بەکارهێنانی زێدەرووی کالاّ کولتوورییەکانی رۆژئاوا و پرۆسەی مەکدۆنالدیزاسیۆن، کۆکاکۆلانیزاسیۆن و دیسنی فیکاسیۆن بکەین، دەبێ بڵێین کە ئەوانە وێنەیەکی روون بەڵام ناتەواوی بواری کولتووریی جیهانن. پرۆسەی بەجیهانیبوون هاوچەشنی و یەکدەستبوونی کولتوور و جیاوازی و فرەیی سڕینەوەی لـێدەکەوێتەوە، بەڵام جۆرێکی دیکە لە پێکەوەژیانەکان، ئاوێتەبوونەکان، جیاوازییەکان و جۆراوجۆرییەکان و تایبەتەکانیش بەدی دێنێ.

بە پێی ئەم لایەنە لە دەرکەوتەکانی بەجیهانیبوون و بۆ رەخنەگرتن لە تیۆری ئیمپریالیسم و هاوچەشنیی کولتووری، ژمارەیەك لە تیۆریست و توێژەرەکان قسە لەوە دەکەن کە پرۆسەی بەجیهانیبوون پێوەندییەکی نوێ لە نێوان بابەتی گشتی و تایبەت دا دادەمەزرێنێ. لە روانگەی ئەوانەوە پانتایی کولتووریی جیهانی هاوچەرخ هەم لە خۆگری گشتێتی و هاوچەشنییە و هەم لە خۆگری تایبەتێتی و ناهاوچەشنی. پرۆسەی بەجیهانیبوون لە هەمان کات دا کە هەموو فەزا داخراوە کولتوورییەکان تێك دەدا و تایبەتەکان لە نێو دەبا، بەستێنێکی لەباریش بۆ بونیادنانەوە و ژیاندنەوەی تایبەتەکان و فرەییە جۆراوجۆرەکان پێك دێنێ. بەم پێیە دەبێ باس لە دامەزرانی پێوەندییەکی دیالیتکی لە نێوان تایبەت/ گشتی و جیهانی/ ناوچەیی بکەین و تەنیا باس لە بەجیهانیبوونی کولتوور و هاوچەشنیی کولتووری ساکار و بێ ئەم لاو ئەولا بکەین.

هێماکانی نوێژەنکردنەوەی کولتووره تایبەتەکان لە بەستێنی جیهانی دا کە بە جۆرێکی دیکە لە گشتگەرایی کولتووری دەژمێردرێن، پڕ ئەژمار و جۆراوجۆرن. هەر کولتوورێك، بە پێی پێگەی خۆی لە سیستمی جیهانی دا و تایبەتمەندییەکانی خۆی، بە شێوەیەکی جیاواز لە کولتووری جیهانی تێ دەگا و وەری دەگرێ و نیشانەکانی کولتووری جیهانییش لە بەستێنە جۆراوجۆرەکان دا بە چەشنی جیاواز دەردەکەون. بەڵام دەس نیشان کردن و وەسفی هەمووان دژوارە و لە چوارچێوەی ئەم توێژینەوەیەدا ناگونجێ. بەم پێیە ناچارین لە چوارچێوەی پۆلێن کردنێکی گشتی دا، باس لەم راستییە کولتوورییە بکەین.

رۆلێن رابێرتسۆن، دیارترین تیۆریستی بەجیهانیبوون، سەرچاوەی بەشی زۆری پەرچەکردار و کارتێکەرییە دوولایەنە کولتوورییەکان لە جیهانی هاوچەرخ دا دەگەڕێنێتەوە بۆ دیالیتکی تایبەت و گشتی. بە رای ئەو هێزە ئاوێتەکەر و هاوچەشنی خولقێنەکان، تەواوکەری هێزە



جیاوازی خولقێنەکانن و لێك جیا ناکرێنەوە (Robertson, 1992: 174). بەجیهانیبوون لە پلەی یەکەم دا دیاردەیەکی کولتوورییە، چونکە بەستێنێك بۆ بەجیهانیبوونی کولتووره تایبەتی و خۆجێیەکان و ناوچەیی بوونی توخمەکانی کولتووری جیهانی پێك دێنێ. لەم رووەوەیە کە رابێرتسۆن قسە لە گشتی بوونی بابەتی تایبەت و تایبەتیبوونی بابەتی گشتی دەکا (Beyer, 1994: 28). لەو بەشەش دا دەستەیەك لە هێماکانی گشتگەرایی کولتووری لە چوارچێوەی پۆلێن کردنەکەی رابێرتسۆن دا تاوتوێ دەکەین.

دیارە بەر لە خەریکبوون بەم بابەتەوە باشترە دوو خاڵ وەبیر بێنینەوە: یەکەم، ئەم دەستەیە لە کارتێکەرییە دوولایەنە کولتوورییەکان لەم رووەوە بە جۆرێك گشتگەرایی کولتووری دەژمێرێن کە پەرچەکرداری توندوتیژانە لە بەرانبەر پرۆسەی بەجیهانیبوون دا و هەوڵدان بۆ بوژاندنەوەی فەزا داخراوە کولتوورییەکان تایبەتمەندیبەخشی ئەوان نیە؛ دووهەم، ئەم جۆرە گشتگەراییە کولتوورییە لەگەڵ جۆرێکی دیکەی گشتگەرایی کە باسی کرا (ئاوێتە بوون و پێکەوە ژیانی کولتووری) هێندێك لایەنی هاوبەشی هەیە، بەڵام بە هۆی هەبوونی تایبەتمەندی و جیاوازیی بەرچاو وەك جۆرێك گشتگەرایی کولتووری تاوتوێی دەکەین.

مەبەست لە گشتی کردنی بابەتی تایبەت پەرەپێدانی جۆرەکانی جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکانە لە رێگای کەڵك وەرگرتن لە بایەخە گشتییەکانەوە. لەم چوارچێوەیەدا بنواشە (اصول) و بایەخە گشتی و جیهانییەکان بە مەبەستی پاساودان و رەوایی دان بە جیاوازییەکان و بابەتی تایبەت بە کار دەهێنرێ و بەم پێیە ژمارەیەکی یەکجار زۆر و تەنانەت بێ سنوور ئیددیعای بێ هاوتابوون و تایبەتبوون شکڵ دەگرێ. لە راستی دا کولتووریبوونی جیهان نیشانەی ئەم رووکارەی ژیانی کۆمەڵایەتیی جیهانی هاوچەرخە و بیرمەندانێکی وەك ئالێن تۆرێن لایەنی جیاکەرەوەی کۆمەڵگەی بان سنعەتی لە پێگەی زەقی کولتوور لە جیاتی پرسی بڵاوکردنەوە لە ژیانی خەڵك دا دەبینن (Foweraker, 1995: 13).

ئەو کەمایەتییانەی کە بەبێ گرێدەریی بەرپرسانی دەوڵەتی خۆیان هانا دەبنە بەر مافە جیهانییەکانی مرۆڤ تا دۆخی خۆیان باش بکەن، خەڵکی ئەو ناوچانە کە هەوڵ دەدەن بە پشت بەستن بە بایەخە جیهانییەکان لە رێگای رایەڵکە بان نەتەوەییەکان، پشتیوانیی جیهانی بۆ داواکانیان وەدەست بێنن و ئەو ژنانەی کە کێشەکانی ژیانی خۆیان لە چوارچێوەی بنواشەکانی فمینیسم دا دێننە گۆڕێ، لە راستیدا لە هەوڵی گشتی کردنی بابەتی تایبەت دان (Albrow, 1996: 142). هەروەها ئەو کۆمەڵگایانەی کە هەوڵ دەدەن کالاّ تایبەتە کولتوورییەکانی

خۆیان بە چەشنێك نوێژەن بکەنەوە کە وێڕای تایبەتبوون، بەکارهێنانی جیهانیان هەبێ، لەم پێناوە دا کار دەکەن. لە فەزایەکی ئەوتۆدا، وەك رابێرتسۆن دەڵێ، تایبەتبوون بایەخێکی جیهانییە (Pieterse, 2000: 10).

جۆرێکی دیکە لە دیالیتکی گشتی/ تایبەت یان جیهانی/ ناوچەیی تایبەت کردنی بابەتی گشتی یان تایبەت کردنی گشتگەراییە. تایبەت کردنی بابەتی گشتی نیشانەی ئەوەیە کە بە پێچەوانەی رای توێژەرانێك کە بڕوایان بە ئیمپریالیمسی کولتووری هەیە، نیشانە و توخمە کولتوورییەکان بە سانایی راناگوێزرێن و کاڵا کولتوورییەکانی کولتووری جیهانی زۆرتر رەنگ و بۆنی ئەو بەستێنە کولتوورییانە بە خۆیانەوە دەگرن کە لەوان دا بەکار دەبردرێن. تێگەیشتن و وەرگرتنی کولتووری جیهانی بەستێنمەندە و لە چوارچێوەی کولتووری تایبەتی وەرگرەکان دا هاوسەنگ دەبێ و گۆڕانی بە سەر دا دێ. لە راستی دا هێماکانی کولتووری گشتی بە هۆی مێژووە ناوچەییەکان و بەستێنە کولتوورییە تایبەتەکانەوە دەپاڵێورێن (Dalby, 1999: 147).

خەڵك نەك تەنیا تایبەتێتیی خۆیان لە بەرگێکی گشتی دا دەخەنە بەرچاو و پاساوی دەدەن، بەڵکوو لێکدانەوەی تایبەت لە پرنسیپە گشتییەکانیش دروست دەکەن. بە واتایەکی دیکە، کولتوورە تایبەتەکان لەگەڵ کولتووری گشتیی جیهانی خەریکی دانوستاندنێکی ئاڵۆز دەبن تا وێڕای پاراستنی تایبەتێتیی خۆیان، لە سەرەتییەکانی کولتووری جیهانیش بەهرەمەند بن. پانتایی کولتووریی جیهان تەنیا پانتایی داسەپاندن و دەست بەردانەوە و هاوچەشنی و یان هێندێك جار بەرەنگاریی شەڕخوازانە نیە، بەڵکوو پانتایی دانوستاندن، جیاکردنەوە و پێکەوەلکاندنەوە و هاوچەشنیشە (Lechner, 2000: 320).

کەواتە پرۆسەی بەجیهانیبوون نابێ تەنیا هەڵگری ئەو هێزانە بزانین کە هیچ جۆرە فرەیی و جیاوازییەکی کولتووری لە خۆ ناگرن. ئەم پرۆسەیە جۆرێکی نوێی بابەتی ناوچەیی پێك دێنێ و پێوەندییەکی ئاڵۆز لە نێوان گشتی و تایبەت دا دادەمەزرێنێ. لە رێگای ئەم پرۆسەیەوەیە کە تاکەکان وێڕای بەراورد کردنی خۆیان لەگەڵ "ئەویتر"ە هاوشێوەکان، لە تایبەتمەندێتی و بێ هاوتایی خۆیان ئاگادار دەبن و دەگەنە جۆرێك پلۆرالیسمی وشیارانە (Beyer, 1998: 306). پرۆسەی بەجیهانیبوون لە هەمان کات دا کە کولتوور و شوناس لە بەستێن و سەرزەوی دەسڕێتەوە، شوێن، ناوچە و سەرزەوییش دووبارە دەخاتە ناوەندی ژیانی کۆمەڵایەتی-کولتوورییەوە (Morley and Robisn, 1996: 115 – 16).



دیارە ژیاندنەوەی بابەتی ناوچەیی و تایبەت و دروست کردنەوەی جیاوازی و فرەیی، بە هیچ روویەك تەنیا بە مانای بوژاندنەوەی کولتوورە ناوچەییەکان و فەزا داخراوە کولتوورییەکان نیە. لەم پرۆسەیەدا، کولتوورگەلێکی دیاریکراو تایبەتبوونی خۆیان بە خۆجێی و ناوچەییکردنی شکڵە کولتوورییە بان نەتەوەیی و جیهانییەکان دووبارە بەرهەم دێننەوە(Smart, 1993: 140). ئەم بابەتە ناوچەییە لەگەڵ ئەو شوناسە کۆنانەی گرێدراوی ناوچە بە تەواوی دیاریکراو و سنووردارەکانن وەك یەك نیە، بەڵکوو لە چوارچێوەی لۆژیکی بەجیهانیبوون دا کار دەکا. ئۆگریی نوێ بە تایبەتمەندێتی وشیاری سەبارەت بە کاریگەریی بێ ئەملاو ئەولای فەزای جیهانیی لەگەڵ دایە و لەگەڵ ئیدەئالیزەکردنی بابەتی ناوچەیی مەودای زۆری هەیە (Hall, 1996: 301 – 319).

بۆ وێنە چەمکی بازرگانیی ژاپۆنی dochakuka، نێوەڕۆکی نوێی بونیادنانەوەی بابەتی ناوچەیی بە باشی دەردەخا. بە بۆچوونی رابێرتسۆن ئەم چەمکە سەلمێنەری ئەوەیە کە بابەتی ناوچەیی و بابەتی جیهانی پێوەندییەکی پتەویان پێکەوە هەیە. چەمکی جێگای باس بە لای پێکەوە گونجاندنی روانگە و کردارە جیهانییەکان لەگەڵ دۆخی ناوچەیی لە بەستێنێکی بازرگانی دا شکاوەتەوە و یارمەتیی کۆمپانیەکان دەدا تا نەك تەنیا لە بەرانبەر هەلومەرجی ناوچەییدا وڵامدەرتر بن، بەڵکوو شکڵ گەلێکی نوێی بەکارهێنانیش دروست بکەن، بە چەشنێك کە بابەتی ناوچەیی و بابەتی جیهانی پێوەندییەکی دیالێکتیکیان پێکەوە هەبێ (Lyon, 1999: 64).

وشەی ئینگلیزی glocalization یان وشەی relocalization یش جیاوازیی ناوچەگەراییە نوێیەکان لەگەڵ ناوچەگەراییە کۆنەکان دەردەخەن. ئەم وشەیە لە پلەی یەکەم دا یە واتای دەرەتانی پێکەوە ژیان و دانوستاندنی کولتوورییە کە پرۆسەی بەجیهانیبوون دەستەبەری دەکا. دیالیتکی جیهانی/ ناوچەیی دەربڕی ئەوەیە کە تاك لە جیهانی هاوچەرخدا دەتوانێ لە ریستورانێك لە موسکۆ یان تۆکیۆ مەك دۆنالد بخوا، بە بێ ئەوەی ببێتە ئەمریکاییەك (Kumar, 1995: 194). گلۆکالیزاسیۆن یانی جیهانی بیرکردنەوە و ناوچەیی ژیان.

ئەم پێوەندییە ئاڵۆزەی نێوان تایبەت و گشتی یان جیهانی و ناوچەیی لە تیۆرەکەی ئاپادورای دا بە باشی رەنگی داوەتەوە. بە رای ئەو لە سەردەمەکانی رابردوودا کارتێکەرییە دوو لایەنە کولتوورییەکانی نێوان گرووپە کۆمەڵایەتییەکان زۆرتر بە هۆی هۆکارە جوغرافیایی و تێکنۆلۆژییەکان و هێندێك جار بە هۆی بەرگریی چالاکانە لە بەرانبەر پێوەندی لەگەڵ

"بیانە"دا زۆر سنووردار بووە. بەڵام گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان و دواتر هێندێك لە پێشکەوتنە تیکنیکیییەکانی بیاڤی گوازتنەوە و پێوەندییەکان ئەم دۆخەی تێك دا و ئابوورییەکی کولتووریی جیهانیی ئاڵۆز، ڕەوان و هاوبەشی خوڵقاند کە لە ڕێگای تیۆرە کلاسیکە مارکسیستی یان نامارکسیستییەکانەوە شیاوی تێگەیشتن و ڕوون کردنەوە نیە (Appadarai, 2000: 322 – 23).

بەم پێیە بۆ ڕوون کردنەوەی کارتێکەرییە دوو لایەنە کولتوورییە ئاڵۆزە چڕە جیهانییەکان دەبێ سەرنج بدەینە پێوەندیی نێوان پێنج ڕەهەندی ڕەوتە کولتوورییە جیهانییەکان: ethnoscapes یان ڕوانگەکانی کەسانێکی وەك گەشتیارەکان، کۆچەرەکان، پەنابەرەکان، دوورخراوەکان و کرێکارە کۆچەرەکان؛ etchnoscapes یان ڕەوتی جیهانیی مەزن و پڕ هەڵپەی تێکنۆلۆژییە جۆراوجۆرەکان؛ financescapes یان تەنینەوەی بێوێنە و ڕەوتی بەگوڕی سەرمایەی جیهانی؛ mediacapes یان دابەش کردنی توانایییە ئێلکترۆنیکیەکان بە مەبەستی بەرهەمهێنان و بڵاوکرانەوەی زانیاری (ڕۆژنامە، گۆڤار، کاناڵە تلویزیۆنییەکان و ستۆدیۆکانی بەرهەمهێنانی فیلم)؛ ideoscapes یان زنجیرەی وێناکردنەکان و هزرە کەم تا زۆر سیاسی و ئایدیۆلۆژیکەکانی وەك ئازادی، خۆش بژی، حوقووق، دەسەڵاتداریێتی، نوێنەرایەتی و دیمۆکراسی (Appadurai, 2000: 324 – 26).

بە ڕای ئاپادورای کارتێکەرییە دوولایەنە کولتوورییەکانی سەرچاوەگرتوو لە پرۆسەی بەجیهانیبوون، ئاڵۆزی و دانوستاندنی پێچەڵاوپێچی نێوان هاوچەشنی و ناهاوچەشنین کە لە چوارچێوەی ئەم پێنج ڕەهەندەدا بەڕێوەدەچن. بۆ وێنە لە کاتێك دا کە ڕەنگە technoscapes ژێر بینای هاوبەش بخوڵقێنن، mediascapes گەنجینەیەك لە هێماکان دەخاتە بەرچاو و ideoscapes وێناگەلی جیاواز لە تەکووزیی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی جیهانی دەخاتە بەردەست. کەواتە تایبەتمەندیی سەرەکیی گۆڕەپانی جیهانی بریتییە لە هەوڵی دوو لایەنەی وەك یەکی(هاوچەشنی) و جیاوازی بۆ لەبەریەك هەڵوەشاندنی یەکتر و دروست کردنی بابەتی گشتی و بابەتی تایبەت (Appadurai, 2000: 330).

بە هەر حاڵ خاڵی سەرەکیی تیۆرەکەی ئاپادورای ئەمەیە کە پرۆسەی بەجیهانیبوون تەنیا بەستێن ساز و خوڵقێنەری هاوچەشنیی کولتووری لە جیهان دا نیە. ئەگەرچی ئەم پرۆسەیە کولتوورێك کە لە ڕۆژئاواوە سەرچاوەی گرتوە بە جیهانی دەکا و سنوور و فەزا داخراوە کولتورییەکان کەم تا زۆر خاپوور دەکا، بەڵام دەست بەردانەوەی ڕووت یان بەرگریی پڕ لە پێك





هەڵپرژان و توندوتیژانە تاقە پەرچەکردار و وڵامی کولتوورە تایبەتەکان نیە. بەڵکوو دەرەتانگەلێك و بەستێن گەلێکیش بۆ دروست کردنەوە و پاراستنی کولتوور و شوناسە جۆراوجۆرەکان پێك دێنێ. تا ئێستا دوو جۆر لە جۆرەکانی بونیادنانەوەی کولتووری-شوناسیمان تاوتوێ کردوە و ئێستا باس لە جۆرێکی دیکەی ئەوان دەکەین.

## گۆڕانکاری و پێشکەوتنی کولتووری

بەجیهانیبوونمان وەك پرۆسەی پەستێوتراویی زێدەرووی زەمەن و فەزا واتا کردوە؛ پرۆسەیەك کە بە هۆی ئەوەوە خەڵکی دنیا کەم تا زۆر لە کۆمەڵگەی جیهانی دا ئاوێتە دەبن. بە هەر ڕادەیەك کە زەمەن و فەزا، لە ئاکامی پێشکەوتنە سەرسووڕهێنەرەکانی تێکنۆلۆژی و ئامرازەکانی پێوەندیدا پەستێوتراوتر دەبن، جیهانیش پەستێوتراوتر دەبێ و بە شێوەیەکی دیاردەناسانە بچووك دەبێتەوە. لە ئاکامی ئەم گۆڕانکارییانە دا، ئەوە کارتێکەرییە دوو لایەنە و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانن وەك گیدێنز دەڵێ، لە بەستێن دەسڕێنەوە و لە چوارچێوەی فەزا و زەمەنی زۆر بەرینی جیهانیدا نوێژەن دەبنەوە و تاك بۆ یەکەمین جار لە پانتایی جیهانی دا لەگەڵ کۆمەڵگە دا پێوەندی دادەمەزرێنێ (Giddens, 1991: 32).

لە جیهانێکی ئاوا پەستێوتراو و چڕکراودا، بێ گومان هەموو مرۆڤەکان کەم تا زۆر بەستراوەی یەکدی دەبن و ژینگەی کۆمەڵایەتی و ناکۆمەڵایەتیی هەر تاکێك پانتاییەکی جیهانی بە خۆیەوە دەگرێ. لە ڕاستی دا بەرهەمی پرۆسەی بەجیهانیبوون جۆرێك لێك تەنراویی زێدەرووی جیهانییە کە هیچ تاکێك ناتوانێ لە شوێنەوار و دەرکەوتەکانی بە دوور بێ و ژیانی کۆمەڵایەتیی خۆی لە دەوروبەری داخراوی ناوچەیی یان نەتەوەیی دا سنووردار بکا. لە "کۆمەڵگەی ریسك"ی ئێستا دا هەر جۆرە هەڵسوکەوت، ڕووداو یان گۆڕانکارییەك زۆرتر لە دەوروبەری جیهانی کاریگەری وەردەگرێ و کاریگەریی لە سەر دادەنێ. دیارە پێش بینی کردنی پانتایی و نێوەڕۆك (ئەرێنی— نەرێنی)ی ئەم کاریگەری وەرگرتن و کاریگەری دانانە زۆر دژوارە و ناکرێ بە سانایی کۆنترۆڵ بکرێ.

ئەم پەستێوتراوی و لێك تەنراوییە جیهانییە ڕووکارێکی پرۆسەی بەجیهانیبوونە کە ڕابردوویەکی لانیکەم چەندین دە ساڵەی هەیە و لە ساڵانی دوایی دا زۆر پڕ هەڵپەتر و بەگوڕتر بووە. ڕابێرتسۆن ئەم ڕووکارەی پرۆسەی بەجیهانیبوون ناو دەنێ "پەستێوتراویی جیهان" یان "لێك گرێدراویی جیهانیی ڕاستەقینە" و هێندێك لە کۆمەڵناسانیش لە ژێر ناوی

"بەجیهانیبوونی بینراو"دا ئەم رووکارەی پرۆسەی بەجیهانیبوون تاو توێ دەکەن. بەڵام ئەوان باس لە رووکارێکی دیکەی ئەم پرۆسەیە دەکەن کە ناوی "زیادبوونی وشیاری سەبارەت بە جیهان وەك گشتێك" یان "وشیاری لە تەواوێتیی جیهانی" و "بەجیهانیبوونی زەینی"یان لـێناوە (Peterson, 1999: 16: Robertson, 1992: 8).

رووکاری دووهەمی بەجیهانیبوون لە راستیدا پێوەندیی بە وشیاری سەبارەت بە بابەتی جیهانی یان وشیاریی تاکەکان سەبارەت بە هەڵکەوتوویی جیهانییەوە هەیە. پەستێوتراویی و لێك تەنراویی جیهان، کەم تا زۆر ئەم وشیارییە لە تاکەکان دا دەخولقێنێ کە هەمووی ئەوان بەشێك لە گشتێکی گەورەتر (دنیای مرۆیی)ن. لە دۆخێکی ئەوتۆ دا، ئەگەری وەرچەرخانی دیاردەناسییە تاکەکەسییەکان بە لای تەواوی جیهانە دا، لە جێگای پانتاییە ناوچەیی و نەتەوەییەکان زۆرتر دەبێ و مرۆڤەکان بەم ئاکامە دەگەن کە هەموویان لە پانتاییەکی تاقانەی بەرین دا بە ناوی جیهان پشك و دەوریان هەیە(Friedman, 1994: 196).

وشیاریی زێدەروو لەم راستییە کە چارەنووس و ژیانی مرۆڤەکان بە شێوەی جۆراوجۆر لە پانتایی جیهانیدا لێك گرێدراوە، تێگەیشتنی ئەوان لە پرسە جۆراوجۆرەکانی شوێنی ژیانیان دەگۆڕێ. ئەم وشیارییە سەبارەت بە "گوندی جیهانی" دەبێتە هۆی ئەوەی تاکەکان هەموو بابەتەکان و کێشەکانی خۆیان لە سەر بنەمای جیهانی دووبارە واتا و پێناسە بکەنەوە: دووبارە واتا کردنەوەی پرسەکانی سیستمی سیاسی بە پێی" تەکووزی و تەناهیی جیهانی"، پرسە ئابوورییەکان بە پێی "دابەزینی نێونەتەوەیی"؛ پرسەکانی بازاڕ بە پێی "بەرهەمە جیهانییەکان"؛ و پرسەکانی پیس بوونی ژینگە بەپێی "رزگارکردنی گۆی زەوی" (Waters, 1996: 42).

ئەم زێدەبوونەی وشیاریی جیهانی دیاردەیەکی کولتوور سازە. بە هەر رادەیەك کە وشیاری مرۆڤەکان سەبارەت بە لێك تەنراویی جیهانی زیاتر بێ، بەستێنێکی لەبارتر بۆ وتوویژ و دانوستاندنی کولتووریی ئامادە دەبێ. وشیاری سەبارەت بە لێك تەنراویی جیهانی، وشیارییە سەبارەت بە پرسە جیهانییەکان کە کولتوورەکان ناچار دەکا بە سەرنج دان بەم پرسانە، لە رەوتی وتوویژ و دانوستاندنێکی بەردەوام دا ریفۆرم لە خۆیان دا پێك بێنن. بە گوتنێکی دیکە وشیاری سەبارەت بە شکڵ گرتن و پەرەگرتنی کۆمەڵگەی جیهانیی یەکگرتوو کە پرس و گیرو گرفتی تایبەت بە خۆی هەیە، بوارێکی لەبار و مەیلێکی بەهێز بۆ بەرەو یەکچوون و جیهانگەرایی کولتووری پێك دێنێ.



ئەم گۆڕانکارییە کولتوورییە لە پلەی یەکەم دا گرێدراوی گەشە، زەقبوونەوە و پەرەگرتنی لایەن و رووکارە گشتگەرایانەکانی کولتووره دیاریکراوەکانە (Beyer, 1994: 94). لە حاڵەتێکی ئەوتۆ دا پەرچەکرداری کولتوورە دیاریکراوەکان لە ئاست پرۆسەی بەجیهانیبوون دا پەرچە کردارێکی نەرێنی و شەڕانیانە نیە، بەڵکوو هاوسەنگ کردن و چاك کردن و نوێژەن کردنەوەی ئەویان لە بەرچاوە بۆ ئەوەی کەمترین خەسار بە مرۆڤ و سروشت بگا. لەم رووەوە کولتوورەکان خوازیاری دنیایەکی بە دوور لە توندڕۆیی نوێخوازانە و زێدەڕۆیی دژە نوێخوازییەکانە.

بە پێی ئەوەی کە ئایینەکان زۆرتر لە کولتوورەکانی دیکە هەڵگری هەر دووك توخمی گشتگەرایانە و تایبەتگەرایانەن، دەرکەوتنی گۆڕانکاریی کولتووریی لەم بیاڤە دا زەقتر و راشکاوانەترە. بۆ وێنە لە ساڵی ١٩٩٣دا شاری شیکاگۆی ئەمریکا شاهیدی بەڕێوەچوونی گەورەترنی کۆبوونەوەی ئایینی لە جیهان دا بوو. لەم کۆبوونەوەیە دا ئایین و مەزهەبە جۆراوجۆرەکان نزیکەی ٨٧٠٠ نوێنەریان هەبوو کە سەبارەت بە پرسە جۆراوجۆرەکانی ئایین، فەلسەفە، کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسی پێکەوە وتووێژیان دەکرد. بێ گومان ئەو وتووێژانە نیشانەی لایەنی هاوبەشی نێوان ئایین و مەزهەبە جۆراوجۆرەکان، وشیاری سەبارەت بەم لایەنە هاوبەشانە و بوونی پاڵنەری بەهێزە بۆ بەهێزکردن و بەتەوەرکردنی ئەوانە (Peterson, 1999: 83 – 4).

وێنەیەکی دیکەی گۆڕانی کولتووری کە بە جۆرێك پەرچەکرداری گشتگەرایانە لە بەرانبەر پرۆسەی بەجیهانیبوون دا دەژمێردرێ، شکڵ گرتن و پەرەگرتنی ئیلاهیاتی رزگاریدەرە. ئەم گۆڕانکاری و بزووتنەوە کولتوورییە بە باشی دەری دەخا کە کولتووره تایبەتەکان دەتوانن بە بەهێزکردنی تایبەتمەندی و رووکارە گشتگەرایانەکانی خۆیان، لەگەڵ فەزای جیهانی دا بگونجێن و بە بێ پەنابردن بۆ بونیادگەرایی کولتووری، خۆیان لە بەستێنی جیهانیدا نوێژەن بکەنەوە. ئەم جۆرە کولتوورانە زیاتر کەڵکەڵەی بان ناوچەیی و بان نەتەوەییان هەیە و لەگەڵ ئەوەی تایبەتمەندێتیی خۆیان دەپارێزن لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی جیهانی دا مرۆڤ وەك ئەندامێکی ئەم کۆمەڵگەیە و تەنانەت هەروەك مرۆڤ چاو لـێدەکە.

بەستێنی شکڵ گرتنی ئیلاهیاتی رزگاریدەر، ئەمریکای لاتینە. ئەم بزووتنەوەیە کە دابین کردنی پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان و زاڵبوون و بە سەر نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان بە ئامانجی خۆی دەزانێ، ریشەکانی پێکهاتەی نایەکسان و نالەباری ئابووری– کۆمەڵایەتی دەگەڕێنێتەوە بۆ پێوەندییە نایەکسانەکانی دەسەلات و تەکەزی لە سەر پێویستیی گۆڕینی

هاوسەنگیی هێز بە مەبەستی گەیشتن بە پەرەگرتوویی دەکا. بەم پێیە کەسانی پێڕەوی بنواشەکان و چوارچێوەی ئیلاهیاتی رزگاریدەر پێ لە سەر نایەکسانییە پێکهاتەییەکان دادەگرن و داکۆکیکاری پەرەگرتنی مەیلە و یەکسانین، نەك پەرەگرتن بە مانای گەشە (Raghuram, 1999: 237).

دیارە زێدەبوونی وشیاری جیهانیی بەرهەمهاتوو لە پرۆسەی بەجیهانیبوون، تەنیا گۆڕانکاری و هەڵدانی کولتوورەکانی ئێستای بەدواوە نیە، بەڵکوو هێندێك جار شکڵ گرتنی بزووتنەوەی کولتووری— کۆمەڵایەتیی نوێشی لێ‌دەکەوێتەوە. پرۆسەی بەجیهانیبوون نەك تەنیا بەهێزبوون و پەرەگرتنی بنواشە و لایەنە گشتگەرایانەکانی کولتوورەکانی لێ‌دەکەێتەوە، بەڵکوو بەستێنێکی لەباریش بۆ نوێژەن کردنەوەی ئەم بنواشە و رووکارانە لە چوارچێوەی کولتوور و بزووتنەوەیەکی نوێدا دابین دەکا. وەك ئالبرۆ دەڵێ ئەم بزووتنەوە کۆمەڵایەتی— کولتوورییانە بەڵێنداریێتیی ئازاد و وزەی زیادیی خەڵکی ئاسایی جیهان ئامادە دەکا تا لەگەڵ پێکهاتە ئابووری— سیاسییەکان و پرسەکانی کۆمەڵگەی جیهانی دا بکەنە بەربەرەکانییەوە (Albrow, 1996: 142).

ئەم بزووتنەوانە، لە ژێر گوشاری بەجیهانیبوون دا، مەیلی جیهانی بە خۆیانەوە دەگرن. ئەوان جۆرێك شێوە کاری سیاسی لە سەر بنەمای خۆپیشاندان و دەربڕینی سیاسین لە دەرەوەی چوارچێوەی باوەکانی دەوڵەت— نەتەوە دا کە بە لێك بەستنی کرداری ناوچەییەکان بە پێداویستییە جیهانییەکان رەوایی بە کردارە ناوچەییەکان دەبەخشن. لەم بزووتنەوانەدا تەنانەت لە بەرکردنی جل و بەرگ، خۆراك و خواردن یان پێوەندییە سێکسییەکان، جۆرێك نارەزایەتییە لە پێکهاتەکانی دەسەڵات. بەڵام پەنا بردن بۆ بۆنیادگەرایی کولتووری یا هەوڵدان بۆ بوژاندنەوەی فەزای داخراوی کولتووری لەم کولتوورانە دا جێگایەکی نیە. بۆ وێنە فمینیسم بە یەکێك لەو جۆرە بزووتنەوانە دەژمێردرێ کە تایبەتگەرایی و کۆمەڵەگەرایی لەودا زۆر کەمڕەنگە (Bussemaker, 1998: 219).

بەڵام لەم روانگەیەوە، زەقترین هێمای گشتگەرایی کولتووری بزووتنەوەی لایەنگرانی ژینگەیە. پیس بوونی هەوا ئەگەرچی وەك پرسەکانی دیکە زیاتر لە چەند دەیە تەمەنی هەیە، بەڵام دەتوانین دەیەی شەست بە دەستپێکی مێژوویی ئەم بزووتنەوەیە لەقەڵەم بدەین. لە راستیدا لە ماوەی چوار دەیەی رابردوودا، پەستێوتراویی جیهان و وشیاری جیهانی بە چەشنێك بەگوڕ بووە کە بیرکردنەوە سەبارەت بە زۆر لە پرسەکان، بۆ وێنە ژینگە، وەك



پرسێکی جیهانی بۆتە شتێکی ئاسایی. ئێستاکە کۆمەڵگەیەکی مەدەنیی جیهانی دروست بووە کە لە چوارچێوەی پرسە جیهانییەکان دا لە پرسە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکان تێ دەگا (Lechner, 2000: 27).

بە گشتی بزووتنەوەی لایەنگری لە ژینگە دەبێ بە بەرهەمی کەڵکەڵەی پاراستنی دنیای سروشتی بە مەبەستی مانەوەی مرۆڤ و سروشت بزانین کە بۆخۆی لە گۆڕانی روانین سەبارەت بە پێوەندیی نێوان ئابووری، کۆمەڵگە و سروشتەوە سەرچاوە دەگرێ. بە گوتنێکی دیکە سەرهەڵدان و پەرەگرتنی ئەم بزووتنەوەیە پێوەندیی بە تێگەیشتنی زێدەروو لە قەیرانی نێوان کۆمەڵگە مۆدێڕنەکان و ژینگەی سروشتییەوە هەیە و؛ لە مەترسیی سەرچاوەگرتوو لە گەرم بوونی زەوی دا، کەم بوونەوەی جۆراوجۆرەکانی گیانلەبەران لە ئاکامی کشتوکاڵی سنعەتی و ماسی گرتنی مۆدێڕن، دارستان سڕینەوە، بیابان سڕینەوە، داروخانی خاك، پیس بوونی ئاو و هەوا و مەترسییەکانی سەرچاوەگرتوو لە زبڵە ژەهری و سنعەتییەکاندا رەنگی داوەتەوە(Narthcott, 1998: 235).

لە سەر ئەم بنەمایە دەتوانین بزووتنەوەی لایەنگرانی ژینگە یان ژینگەگەرایی بەم شێوەیە پێناسە بکەین: "هەر چەشنە هەڵسوکەوتێك کە لە گوتار و کرداردا گرێدراوی چاك کردنی شکڵە وێرانکەرەکانی پێوەندیی نێوان کرداریی مرۆیی و ژینگەی سروشتیی ئەو بێ" (Castells, 1997: 112). لە روانگەی ئەندام و لایەنگرانی ئەم بزووتنەوەیەوە، هەر ئەو پێوەندییە نالەبار و وێرانکەرەی نێوان مرۆڤ و سروشتە کە سەرچاوە ژیانەکییەکان (هەوا، ئاو، زەوی، روەکەکان و گیانلەبەران) لە رێگای هۆکاری جۆراوجۆرەوە وەمەترسی دەخا. ئەم هۆکارانە و پرس گەلی سەرچاوە گرتوو لەوان بە هیچ شێوەیەك لە چوارچێوەی سنوورە نەتەوەییەکان دا کورت ناکرێنەوە و کەم تا زۆر جیهانین (Kelleher, 1999: 116 – 18).

ئەگەرچی لایەنگران و داکۆکیکارانی ژینگە لە تیۆر و کرداردا تارادەیەك هاوئاهەنگن، بەڵام ژینگەگەرایی فرەیی تر لەوەیە کە بتوانین پێی بڵێین بزووتنەوە. لە هێندێك لە سەرچاوەکان دا باس لە چوار دەستەی سەرەکیی بزووتنەوەی ژینگەگەرایانە کراوە: ئیکۆلۆژیی رادیکاڵ؛ ئێکۆلۆژیی مەعنەوی: ئیکۆلۆژیی قووڵ؛ و ئیکۆلۆژیی کۆمەڵایەتی. ئیکۆلۆژیی رادیکاڵ کە لە دەیەکانی دواییدا پێك هاتوە، بە سنووری نێوان سروشت (شوێن) و مرۆڤ رازی نیە، ئەم بزووتنەوەیە لەم رووەوە بە رادیکاڵ دادەنرێ کە گریمانە سەرەکییەکانی کولتووری مۆدێڕن دەخاتە بەرپرسیار و لەم بڕوایە دایە کە دامەزراوە جێگیربووەکان و بایەخەکانی

کۆمەڵگەی مۆدێرن دەبێ بە قازانجی هەموو شتە زیندووەکان بگۆڕێن. لەم روانگەیە دا جیهانبینی ئۆرگانێکی (گەردوون وەك بوونەوەرەکان) جێگای جیهانیبنیی میکانیکی(گەردوون بە واتای ماشین) دەگرێتەوە (Peterson, 1999: 84).

"ئێکۆلۆژیی مەعنەوی" لەو روانگەیەوە سەرچاوە دەگرێ کە بۆ چارەسەرکردنی قەیرانە ئێکۆلۆژیکەکانی ئێستا دەبێ وشیاریی و کولتووری زاڵ و باڵادەست بگۆدرێ. "ئیکۆلۆژیی قووڵ"یش لە راستی دا بزووتنەوەیەکی مەعنەوییە. بە پێی پرنسیپەکانی ئەم بزووتنەوەیە، سنووری نێوان مرۆڤ و سروشت دەستکرد و زیانبارە و ئەو دووانە لە یەکدی جیانەکراوەن. بەم پێیە ئەم بزووتنەوەیە لەگەڵ زۆربەی هزرە مۆدێرنەکانی پێوەندیدار بە گەردوون و مرۆڤەوە بەربەرەکانی دەکەن. "ئیکۆلۆژیی کۆمەڵایەتی"یش بزووتنەوەیەکە کە تەوەرە سەرەکییەکەی لەو رەنج و نایەکسانییە مرۆیی کۆمەڵایەتییەکانی سەرچاوە گرتوو لە قەیرانی ئیکۆلۆژیك پێك دێ (Peterson, 1999: 84 – 5).

بزووتنەوە جۆراوجۆرە ژینگەگەراکان سەرەڕای ناکۆکی لە سەر تاکتیك، پلەبەندی و زمان، هەموویان بۆ بەرگری کردن لە شوێن گەلێکی تایبەت لە رێگای برەودان بە کولتوور و بایەخە مرۆییە نوێیەکانەوە هەوڵ دەدەن. دیارە ئەم تایبەتگەراییە لەگەڵ تایبەتگەرایی نەریتیی دەرکەوتوو لە بونیادگەرایی کولتووری دا هیچ جۆرە وێکچوونێکیان نیە. ژینگەگەراکان لە چوارچێوەی بەستێن و فەزای جیهانی دا لە بابەتی تایبەت و ناوچەیی دەگەن. لەم رووەوە ئەوان هەم ناوچەگەران، هەم جیهانگەرا: "جیهانگەرا لە بەڕێوبەرێتیی زەمەن دا، ناوچەگەرا لە بەرگری کردن لە فەزا" (Castells, 1997: 127).

کولتووری نوێی بونیادنراو لە سەر ژینگەگەرایی، کولتوورێکی سۆسیۆبیۆلۆژیکە کە بە سانایی دەتوانێ بچێتە سەرووی نەریتە مێژوورییەکان، زمانەکان و هێما کولتوورییەکانەوە، بەڵام تێکەڵاوبوونی ئەو لەگەڵ شوناسی دەوڵەت — نەتەوە زۆر دژوارە. شوناسی سەرچاوەگرتوو لەم کولتوورە تەنیا شوناسێکە بە قازانجی هەموو بوونەوەرە مرۆییەکانە، بە بێ سەرنجدان بە پێوەندییە کۆمەڵایەتی، مێژوویی و سیستمە تایبەتەکان یا بڕوا مەزهەبییەکانی ئەوان. بە پێی ئەم کولتوور و شوناسە، زانستی ژیان خراوەتە سەرووی ژیانی کۆنترۆڵکراو بە هۆی زانست و کۆنترۆڵی ناوچەیی شوێنەکان بە سەر فەزای کۆنترۆڵ نەکراوی رەوتەکانەوە.

هەر چۆنێك بێ ژینگەگەرایی ئێستا بەدیهێنەری کولتوورێکی نوێیە. ئەم کولتوورە نوێیە کە بە پەرچەکردارێك لە ئاست پرۆسەی بەجیهانیبوون دەژمێردرێ، لە خۆگری وێنەیەکی



تاڕادەیەك راستی بینانە لە جیهانی هاوچەرخە و هەر بەم هۆیە بونیادگەرایی کولتووری و هەوڵدان بۆ بوژاندنەوەی فەزا داخراوە کولتوورییەکان بە شێوازێکی لەبار بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ دەرکەوتە نەرێنی و نالەبارەکانی ئەم پرۆسەیە نازانێ. کەڵکەڵەی سەرەکیی ئەم کولتوورە ئەوەیە کە چۆن دەکرێ بە نوێژەن کردنەوەی فەزا و زەمەن، جیهانی بیر بکرێتەوە، بەڵام ناوچەیی کار بکرێ.

بە سەرنجدان بەم تایبەتمەندییە نابونیادگەرایانە و ناکۆمەڵگەرایانەیەی کولتوور و شوناسی بونیادنراو لە سەر ژینگەگەراییە کە ئەومان بە جۆرێك پەرچەکرداری گشتگەرایانەی دیکە لە بەرانبەر پرۆسەی بەجیهانیبوون دا لە قەڵەم دا. ئەم جۆرە پەرچەکردارە و پەرچەکردارە گشتگەرایانەکانی دیکە ئەگەرچی جیاوازیگەلێکیان هەیە، بەڵام کەم تا زۆر هاندەری پێکەوەژیان، ئاوێتە بوون، دانوستاندن، وتووێژ و گۆڕانکاریی کولتوورین. گشتگەراییە کولتوورییەکان هەڵوێستێکی رەخنەگرانەیان سەبارەت بە پرۆسەی بەجیهانیبوون و کۆمەڵگەی جیهانیی سەرچاوەگرتوو لەو هەیە، بەڵام دۆخی دڵخواز لە ژیاندنەوەی نەریت و چوارچێوەی کولتووریدا نابینن. ئەوان قسە لەوە دەکەن و نیشانیان داوە کە لە فەزای جیهانیی پێکهاتوو لە رەوت، رەوانی و لێك تەنراویش دا دەتوانرێ فرەیی و تایبەتمەندێتیی بپارێزێ.

## تایبەتگەرایی کولتووری

زۆر لە توێژەرانی ئۆگری بەجیهانیبوون ئەو بە پرۆسەیەکی ئاڵۆز دەزانن کە شوێنەوار و دەرکەوتەی دژوازی هەیە و زەقترین نیشانەی ئەم دژوازی و ئاڵۆزییەش لە بواری کولتووردا دەردەکەوێ. پرۆسەی بەجیهانیبوون نەك تەنیا جۆریك هاوچەشنی و ئاوێتەبوونی کولتووریی بەداوەوەیە، بەڵکوو پێداویستییەکانی فرەیی، تەکینەوە و رابوونی کولتوورییش دابین دەکا. دیاردەی یەکەممان لە ژێر ناوی "بەجیهانیبوونی کولتووری"دا تاوتوێ کرد و سەبارەت بە دیاردەی دووهەم یان "کولتووریبوون"یش تاڕادەیەك دواین. ئێستا دەمانهەوێ باسی "کولتووریبوونی جیهان" تەواو بکەین.

هەروەك پێشتر باس کرا، "کولتووریبوونی جیهان" گرێدراوی چەشنە جۆراوجۆرەکانی پەرچەکردارەکان، گۆڕانکارییەکان و مەیلە کولتوورییەکان لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانە کە لە ژێر کاریگەریی پرۆسەی بەجیهانیبوون و وەك پەرچەکردار لە ئاست ئەودا دروست دەبن. هێندێك لەو پەرچەکردارانە سەرەڕای فرەیی و جیاوازیی زۆر، کەم تا زۆر هەڵگری جۆرێك

پێکەوەژیان، دانوستاندن، وتووێژ و ئاوێتەبوونی کولتوورین. ئەگەرچی ئەم جۆرە کارتێکەرییە دوو لایەنە و گۆڕانکارییە کولتوورییانە کە لە ژێر ناوی "گشتگەرایی کولتووری"دا تاوتوێمان کردن، زۆرن، بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە پەرچەکردارەکانی جیهانی هاوچەرخ ناتوانین بە گشتگەرایانە دانێین. ژمارەیەك لە کولتوورتوێژەکان ئەم پەرچەکردارانە ناو دەنێن "تایبەتگەرایی کولتووری"[50].

دیارە دیاریکردنی سنوورێکی ورد لە نێوان ئەم دوو جۆرە پەرچەکردارە و جیاکردنەوەی ئەوان لە یەکدی دژوارە. هەر بەم هۆیە، وەك گشتگەرایی کولتووری، چەمکبەندیی وردی تایبەتگەرایی کولتووریش سانا نیە و دەکرێ بڵێین خستنە رووی پێناسەیەکی هەمە لایەنەی ئەو نەلواو دێتە بەرچاو. بەڵام هەر چۆنێك بێ دەتوانین تایبەتگەرایی کولتووری بە پەنا بردن بۆ توخمە شوناسبەخشە کولتوورییە تایبەتەکان بزانین کە لەودا لە سەر بێ هاوتایی شێوازەکان، کردارەکان و بیرۆکەکانی دەستەیەك یان کۆمەڵێکی دیاریکراو پێ دادەگیرێ.

ئەم پێناسەیە زۆر گشتی و گشتگیرە. لە بەر ئەوە بۆ نەهێشتنی کەموکوڕی و ناڕوونی لە پێناسەکەدا، باس لە هێندێك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی تایبەتگەرایی کولتووری بە بەراورد لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی گشتگەرایی کولتووری دەکەین. دیارە لە پێش دا دەبێ ئەم خاڵە وەبیر بێنینەوە کە ئەم تایبەتمەندییانە بە هیچ شێوەیەك تەنیا هی ئەم کارتێکەرییە دوو لایەنەیە یان هەڵسوکەوتە کولتوورییە نیە و لە گشتگەراییە کولتوورییەکانیش دا بەرچاو دەکەون، بەڵام لە تایبەتگەرایی کولتووری دا ئەم تایبەتمەندییانە زۆر زەق و پڕرەنگن.

لە جۆرەکانی گشتگەراییە کولتوورییەکانی پرۆسەی بەجیهانیبوون دا و دەرکەوتەکان ئەو دا ئەوە وەك ڕاستییەکی بێ ئەملاو ئەولا قەبووڵ کراوە و گومانێك سەبارەت بە نەلوان و تەنانەت ناپەسندبوونی گەڕانەوە بۆ ڕابردوو و بوژاندنەوەی ئەو نیە. گشتگەرایانی کولتووری ڕوانگەیەکی ڕەخنەگرانەیان لە دۆخی هەبوو هەیە و لەگەڵ ئەوەش دا دەرەتانە کولتوورییەکانی سەرچاوەگرتوو لە پرۆسەی بەجیهانیبوونیش بە باش دەزانن. بەڵام زۆر لە گرووپە تایبەتگەراکان تەواوی پرۆسەی بەجیهانیبوون یان بەشێك لەو لە ژێر واتا و ناوی جۆراوجۆردا ڕەت دەکەنەوە. لە ڕوانگەی ئەوانەوە بەجیهانیبوون نەك تەنیا بە مەترسییەکی مکوم دەژمێردرێ، بەڵکوو ڕەوتێکی خۆ لــێنەدراو و بێگەڕانەوەش نیە(Peterson, 1999: 86).

50- cultural perticularism





ناخ باوەڕی بە تایبەتمەندییەکی دیکەی تایبەتگەرایی کولتووری دەژمێردرێ. بە پێچەوانەی گشتگەرایی کولتووری کە کەم تا زۆر تایبەتمەندییەکەی ڕیژەباوەڕیی کولتوورییە و لە سەر تێگەیشتنی بەرانبەر و هەڵکردن لەگەڵ یەکدی بونیادنراوە، تایبەتگەرایی کولتووری هیچ جۆرە هەڵکردن و پێکەوەژیانێك وەخۆناگرێ و پلۆرالیسمی کولتووری لەودا جێگایەکی نیە. دیارە هەر ئەم تایبەتمەندییە لە پێوەندی لەگەڵ تایبەتگەراییە کولتوورییە جۆراوجۆرەکان دا ڕێژەییە و لە گرووپ و بەستێنێکەوە بۆ گرووپ و بەستێنێکی دیکە جیاوازیی هەیە. لە سەر ئەم بنەمایە سێ جۆرە تایبەتگەرایی کولتووری دەتوانین دەس نیشان بکەین.

"تایبەتگەرایی دابڕاو" بە ڕوانگەی کولتووریی ئەو گرووپانە دادەنرێ کە هەوڵ دەدەن بە شێوەگەلی جۆراوجۆر، گرووپی خۆیان لە دەوروبەری کۆمەڵایەتی و گرووپەکانی دیکە جیابکەنەوە. داکۆکیکارانی ئەم جۆرە تایبەتگەراییە لە هەمان کاتدا کە بڕوایان بە بانتربوونی کولتووری خۆیان هەیە، ناچالاکیی کولتووری هەڵ دەبژێرن. ئەوان دەڵێن ڕێوشوێنی ژیان و داب و نەریتەکانی ئێمە پێوەندیی بە خۆمانەوە هەیە نەك کەسێکی دیکە و دیتران دەبێ واز لە ئێمە بێنن. ئەم جۆرە تایبەتگەراییانە زۆر کەم و ڕووەو کەمبوونەوەن. خەڵکی ڕەسەنی ئۆسترالیا دەتوانین بە وێنەی زەقی ئەم چەشنە تایبەتگەراییانە لەقەڵەم بدەین (Peterson, 1999: 80).

"تایبەتگەرایی سەرسەخت و شەڕخواز"یش دۆگمە و قسە لە باڵادەستیی کولتوورێکی تایبەت دەکا، بەم جیاوازییە کە لەم تایبەتگەراییەدا جیهانگیرکردنی کولتووری جێگای مەبەست بە ئەرکێکی چاوپۆشی لــێنەکراو دەژمێردرێ. شوێنکەوتووانی ئەم جۆرە تایبەتگەراییە، نەك تەنیا کولتووری خۆیان بە بێ وێنە و بانتر دەزانن، بەڵکوو هەوڵ دەدەن بە گۆڕینی مەزهەب، ئامرازە سیاسییەکان و یان زۆر و ناچارکردن، ئەو بە سەر تاك و گرووپەکانی دیکە دا بسەپێنن. بۆ وێنە ڕێبەرانی ڕاستی مەسیحی لە ئەمریکا بڕوایەکی ئەوتۆیان هەیە. ئەوان ڕووداوەکان بە چەشنێك لێك دەدەنەوە کە وەك نیشانەی دەرکەوتنی دووبارەی عیسا مەسیح بنوێنن؛ ئەو ڕووداوانەی کە بەزوویی ڕوو دەدەن و ئەوان وەك شوێنکەوتووە ڕاستەقینەکانی عیسا، ڕۆڵێکی گرنگیان تێیان دا دەبێ (Peterson, 1999: 80).

سێهەمین جۆری تایبەتگەرایی کولتووری، تایبەتگەرایی ڕیشەدارە کە هەوڵ دەدا جیاوازیی ئەو گرووپانەی بەجیهانیبوون کاریگەری لە سەریان بووە بیارێزێ. ئەم تایبەتگەرایانە ئاگایان لە مەیلە ئاوێتەکەرەکانی ئەم پرۆسەیە هەیە، بەڵام لە سەر پاراستنی فرەیی لە بەرانبەر ئاوێتەکردن

و بەرەو یەك چوون پێ دادەگرن. ئەوان تەنانەت رەنگە لەو بڕوایە دابن کە توانایی و شیاوێتیی تایبەتیان بۆ یاری کردن لە کۆمەڵگەی جیهانی“ هەیە. بۆ وێنە زۆر لە دانیشتووانە رەسەنەکان کولتووری خۆیان بە خاوەنی توخم گەلێك دەزانن کە شیاوی ئەوەن بخرێنە بەرچاوی کۆمەڵگەی جیهانی؛ وەك ئاوەزی خێڵەکی، هەستی هاوپێوەندی، توانایی پێکەوەژیان لەگەڵ سروشت و... ئەگەرچی شوێنکەوتووانی ئەم جۆرە تایبەتگەراییە توخم گەلێك لە کولتووری خۆیان دەخە بەرچاوی کۆمەڵگەی جیهانی، بەڵام نایانهەوێ ئەوان بسەپێنن (Peterson, 1990: 80).

ناخ باوەڕی لەگەڵ تایبەتمەندییەکەی دیکەی تایبەتگەرایی کولتووری پێوەندی هەیە کە بریتییە لە دوورکەوتنەوە لە وتووێژ و دانوستاندنی کولتووری. بە پێچەوانەی گشتگەرایی کولتووریی بونیادنراو لە سەر وتووێژ، ئاوێتە بوون و دانوستاندنی کولتووری، تایبەتگەرایی کولتووری زۆرتر لە هەوڵی پێك هێنانی فەزایەکی داخراوی کولتووری دایە، چونکە رێژەیەتیی کولتووری وەخۆ ناگرێ. بێ گومان لە فەزایەك دا کە کولتوورێك خۆی بە باڵاتر لە کولتوورەکانی دیکە بزانێ، جێگایەك بۆ وتووێژ و دانوستاندن نامێنێتەوە. تیۆریستەکانی وەك گیدێنز هەوڵی تایبەتگەراکان و بونیادگەرا کولتوورییەکان بۆ دروست کردنەوەی فەزا داخراوە کولتوورییەکان و خۆبواردن لە چوونە نێو فەزای گشتی و وتووێژ و پێکەوەژیان بە مەترسیدار دادەنێ (Giddens, 1994:6).

بوژاندنەوەی فەزای داخراوی کولتووری بۆ تایبەتگەراکان لەم رووەوە گرنگیی هەیە کە دەیانهەوێ نێوەوەی ئەو فەزایە لە نەریت و کولتووری تایبەتی خۆی جیا بکەنەوە. ئەم تایبەتمەندییەی تایبەتگەراییش لە خاڵی بەرانبەری دا گشتگەرایی هەڵ کەوتووە. ئەگەرچی تاکەکان و گرووپە گشتگەراکانییەکی سەبارەت بە پاراستنی کولتوور و نەریتە تایبەتەکانی خۆیان لە فەزای بەرین و رەوانی جیهانی دا پەرۆشن، لە چوارچێوەی جیهانی دا و بە دروست کردنی لە پێوەندییەکی کەم تا زۆر هێمنانە لەگەڵ کولتوورەکانی دیکە بۆ بە جێ گەیاندنی ئەم گرنگە هەڵ دەدەن. بەڵام تایبەتگەراییە کولتوورییەکان مانەوەی خۆیان بێجگە لە داخستنی سنوورەکان بەرووی کولتوورەکانی دیکە دا، بەرەنگاربوونەوە لە گەڵ هێرشی کولتووری و لە حاڵەتی لوانیش دا داسەپاندنی کولتووری خۆیان بە سەر باقیی تاك و گرووپەکانی دیکە دا نابینن.

ئەوەی باسی لێوەکرا گرنگترین تایبەتمەندییەکانی تایبەتگەرایی کولتووری پێك دێنێ و ئەمرۆکە دەتوانرێ لە تایبەتگەراییە کولتوورییە جۆراوجۆرەکان دا ئەم تایبەتمەندییەی ناوی برا کەم تا زۆر دەس نیشان بکرێ. ئەم تایبەتگەراییانە زۆر جۆراوجۆرن و لە بیاڤە جۆراوجۆرەکانی



ئایینی، زمانی و ئیتنیکی دا و کۆمەڵگە پەرەگرتوو و پەرەنەگرتووکان دا دروست دەبن. ژمارەی تایبەتگەراییە کولتوورییەکانیش روو لە زیادبوونە و هەموو ساڵێك گرووپ و کۆمەڵگەی زۆرتر لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی جیهان ئەم کارتێکەرییە دوولایەنە و هەڵسوکەوتە کولتوورییانە تاقی دەکەنەوە. لە روانگەی زۆر لە تیۆریستەکان و کولتوورتوێژەکانەوە زێدەبوونی ژمارەی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان دەبێ بە یەکێك لە تایبەتمەندییە زەقەکانی جیهانی هاوچەرخ بژمێردرێ.

ژمارەیەك لە تیۆریستەکان ئەم مەیل و گۆڕانکارییە بە نیشانەی قەیرانی لیبرالیسم و ئایدیالی جیهان نیشتمانی لە قەڵەم دەدەن. لە روانگەی ئەوانەوە، لۆژیکی دێتە بەرچاو کە بە کۆتایی شەڕی سارد، حکوومەتەکان، کۆمەڵەکان، ئەنجوومەنە نێونەتەوەییەکان، هاووڵاتیان و دەوڵەتەکان، بیر لە چارەسەرکردنی گرفتە جیهانییەکان بکەنەوە، مافەکان و بەرپرسایەتییەکانی هاووڵاتیی جیهانی پێناسە و ئامرازە سیاسییەکانی دەس نیشان بکەن و باشتر و تەواوتر ئەو مافانە رەچاو بکەن. بەڵام گۆڕانکارییەکان لەوە دەدوێن کە کۆمەڵگەی جیهانی بەرەو جۆرێك هۆزگەرایی و کۆمەڵ تەوەری دەڕوا (Thompson, 1998: 179).

گیدێنز باس لە بەردەوامی و بوژانەوەی نەریتەکان لە جیهان دا دەکا. بە رای ئەو بۆ وێنە نەریتەکانی وەك ناسیۆنالیسم، ئایین، بنەماڵە و رەگەز و تەنانەت خودی زانستیش دەبوژێندرێتەوە و دووبارە بونیاد دەنرێتەوە بۆ ئەوەی ژنان لە ماڵەوە راگرن، دابەش کردنی کار لە نێوان رەگەزەکان بەهێز بکەن و بڕوا باو و دیاریکراوەکان سەبارەت بە هەڵسوکەوتی سێکسی جێگیر بکەن (Giddens, 1994: 5).یۆرگێن هابرماسیش باس لە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە کۆنەپەرستانە، بەرگریکارانە و تایبەتگەرایانەکان دەکا کە لە خاڵی پێك گەیشتنی "جیهان ژیان" و "سیستم"دا دروست دەبن (Foweraker, 1995: 9 – 10).

پەرەگرتنی بونیادگەرایی ئایینی، ناسیۆنالیسم، شوناسی نەتەوەیی و شوناسی نیشتمانی وەك گرنگترین پەرچەرکردارە تایبەتگەرایانەکان لە بەرانبەر پرۆسەی بەجیهانیبوون دا، تەوەری باسی مانوئێل کاستێلە سەبارەت بە نێوەڕۆك و کارکردی "کۆمەڵگەی رایەڵکە بونیاد" (Castells, 1997: 12). فریدمەن "تەقینەوەی بزووتنەوە کولتوورییە نوێیەکان، لە رابوونی فیرقەیی و مەزهەبییەوە تا سەرەتاییخوازی" تاوتوێ دەکا و ناوی دەنێ "نەریتگەرایی نوێ" (Friedman, 1994: 78). هێندێك لە تیۆریست و توێژەرەکانیش باس لە نژادپەرستیی

تایبەتگەرایانەی نوێ دەکەن کە لە سەر ناخ باوەڕیی کولتووری و دەرکردنی بیانە بونیادنراوە (Silverman, 1999: 40 – 45).

زێدەتر لەمانە، کۆمەڵناس و توێژەری واش هەن کە باس لە "هۆزگەراییە نوێیەکان" دەکەن. لە روانگەی ئەوانەوە ئەم هۆزگەراییانە لە نەتەوەگەراییە شۆڤینستییەکان، شەڕە پڕنەهامەتییە نێوخۆییەکان، پاکتاوکردنی نەتەوەیی و شۆڕشە نژادییەکان دا دەردەکەون (Hughey, 1998: 1). هەروەها ژمارەیەك لە توێژەران قسە لە پەرەگرتنی کۆمەڵگەرایی لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان دا دەکەن کە بۆ سنووردارکردن و راگرتنی رەوانی و رەوتی سەرچاوەگرتوو لە پرۆسەی بەجیهانیبوون بە کار دەبرێن (Meyer, 1999: 5 – 6).

هەر چۆنێك بێ لە هەموو ئەو بەرهەمانە دا کە ناویان هێنرا و ژمارەیان زیادتریشە، بە شێوەگەل و بە ناوی جۆراوجۆرە باس لە جۆرەکانی تایبەتگەرایی کولتووری کراوە و لە سەر ژمارە و فرەیی روو لە زیادبوونی ئەوان پێ داگیراوە. لە راستی دا بابەتی باسی ئەم دەستەیە لە بەرهەمەکان، کولتووریبوونی جیهانە کە لەو هەولانە دا کە بە مەبەستیان پاراستن، بوژاندنەوە و بەهێزکردنی جیاوازی، جۆراوجۆری و تایبەتێتیی لە چوارچێوەی فەزا داخراوە کولتوورییەکانە دەردەکەوێ و دانانی تیۆرێکی کولتووری بۆ تاوتوێ کردنی پرۆسەی بەجیهانیبوون دەکەنە پێویستییەك.

بەڵام پڕ ئەژمار و جۆراوجۆربوونی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان لە لایەك و رەوانی، نارووونی و ئاڵۆزیی ئەوان کە تایبەتمەندیی هەر دیاردەیەکی کولتوورییە، دەستەبەندیی تایبەتگەراییەکانی دژوار کردوە. هەر پێوانە و تەوەرێك بۆ دەستەبەندیی تایبەتگەراییەکان بە کار بهێنین هەمەلایەنە نابێ و چونکە لە هێندێك لایەن و رووکار دا هاوبەشن یان تێك ئاڵاون. لە زۆربەی بەرهەم و توێژینەوەکانیش دا سەرەرای جۆرناسییە جۆراوجۆرەکان، گرفتێکی ئەوتۆ بەدی دەکرێ.

بەم پێیە کە هیچ توێژینەوەیەك بە بێ پۆلێن کردنی زانیارییەکان و دیاردە تاوتوێ کراوەکان، سەر ناگرێ، لەم توێژینەوەیەدا بە پێڕەوی کردن لە ژمارەیەك لە کۆمەڵناسان کولتوورتوێژە ناسراوەکان، تایبەتگەراییە کولتووری کۆمەڵایەتییەکان، لە سێ دەستە دا تاوتوێ دەکەین. سەرەتا باس لە تایبەتگەرایی نەتەوەیی کە بزووتنەوە و شەڕە ناسیۆنالیستی و نەتەوەییە جۆراوجۆرەکان دەگرێتەوە، دواتر تایبەتگەرایی کولتووری ئایینی یان هەمان بونیادگەرایی ئایینی دەخەینە بەر باس و پاژی کۆتایی ئەم بەشەش بۆ تایبەتگەراییە کولتوورییە جۆراوجۆرەکانی دیکە تەرخان دەکەین.



## تایبەتگەرایی ئیتنیکی (قەومی)

هەروەك پێشتر ئاماژەی پێ کرا تایبەتگەرایی ئیتنیکی لەخۆگری دوو جۆرە تایبەتگەرایی کولتوورییە کە بریتین لە راپەڕینەکان، ئاڵۆزییەکان و شەڕە ئیتنیکییەکان و بزووتنەوە نەتەوایەتییەکان لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی جیهان دا. ئەگەرچی ئەم دوو جۆرە تایبەتگەراییە زۆر لایەنی هاوبەشیان هەیە و جیاکردنەوەی ئەوان کارێکی دژوار و تەنانەت رەنگە نادروست بێ، بەڵام لە هێندێك لە توێژینەوە کولتوورییەکان دا ئەم جۆرە هەڵاواردن و جیاکردنەوانە ئەنجام دەدرێن. لەم توێژینەوەیەش دا سەرەتا باس لە بەردەوامی و بوژاندنەوەی ئیتنیکی دەکەین و دواتر بزووتنەوە ناسیۆنالیستییەکانی ئەم دواییانە تاوتوێ دەکەن.

## بوژانەوەی ئیتنیکی و گۆڕانکاری لە تیۆرداڕێژی دا

توێژەرانی کۆمەڵایەتیی سەدەی بیستەم زۆرتر سەرنجیان دابووە پرسە پێوەندیدارەکانی چینی ئابووری. ئەوان بەردەوام بیریان لەم بابەتە دەکردەوە کە چۆن دەتوانن گرفتە سەرچاوەگرتووەکان لە نایەکسانیی کۆمەڵایەتی بە کەم کردنەوەی نایەکسانییەکان یان هەوڵ دان بۆ لە نێو بردنی چین چارەسەر بکەن. بەم پێیە ئۆگری و شوناسە نژادی و ئیتنیکییەکانیان بە کۆنەپەرستیی و لارێیی مێژوویی لە قەڵەم دەدا کە لە بەرانبەر کۆمۆنیسم دا بە چۆك دادێن و لە نێو دەچن یان لە چوارچێوەی دامەزراوە لیبراڵ دیمۆکراتیکەکان دا ئاوێتە دەبن و دەتوێنەوە. لە چوارچێوەی ئەم تیۆرییە دا، ئیتنیسیتە بە پاشماوەی قۆناخە سەرەتاییەکانی گۆڕانی کۆمەڵگەی مرۆیی دادەنا کە درەنگ یان زوو لە نێو دەچێ (Esman, 1999: 260).

بیرمەندە مارکسیست و نامارکسیستەکان سەرەڕای جیاوازی بیروڕا، لە سەر ئەم بابەتە کۆك بوون کە ئیتنیسیتە نیشاندەری هەلومەرج و دۆخی کۆمەڵگەی نەریتییە کە خەڵك لە کۆمەڵە بچووکەکان دا جیاواز لە یەکدی دەژین و پێوەندییەکان و راگوازتن سنووردارن. بەم پێیە زۆرێك لە بیرمەندان چاوەڕوانیان هەبوو لە ئاکامی سنعەتیبوون، شارنشینی و پەرەگرتنی فێرکردن و خوێندەواری دا، وشیاری ئیتنیکی کەم بێتەوە و گشتگەرایی جێگای تایبەتگەرایی بگرێتەوە. کەواتە لە روانگەی هەردووك دەستەوە، ئاوێتەبوونی کەمایەتییە ئیتنیکییەکانی لە کۆمەڵە گەورەترەکان دا شتێکی خۆ لـێنەدراو بوو.

بەڵام گۆڕانکاری و رووداوەکانی دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم کە شکستی کومۆنیسم و دارمانی لیبرالیسمی لەگەڵ خۆی هێنا، نادروست بوونی ئەو پێش بینییانەی دەرخست.

کۆمەڵگەی جیهانی لە هەلومەرجێك دا دوایینساڵەکانی هەزارەی دووهەمی بەجێ هێشت کە گرفتاری بزووتنەوەکان و شەڕە ئیتنیکیە زێدەروویەکان بوو. ئێستاکە جگە لە کۆمەڵگا پەرەنەگرتووە ئەفریقایی و ئاسیاییەکان، ناوچە پەرەگرتووەکانی جیهانیش کە وادیار بوو کێشەی "نەتەوایەتی و ئیتنیکی" یان چارەسەرکردوە، گرفتاری ئاڵۆزی و توندوتیژییە ئیتنیکییەکانن.

بەردەوامی و زەقبوونەوەی پرسی ئیتنیکی لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا، پێداچوونەوە لەو تیۆرانە دا کە هەن و جێ کەوتوون کردە پێویستییەکی بێ ئەملاوئەولا و بیرمەندانی هێنایە سەر ئەوەی کە بە وردی و پارێزێکی زیاترەوە ئەم دیاردەیە تاوتوێ و روون بکەنەوە. بۆ وڵامدانەوەی ئەم پێداویستییە شەپۆلێکی نوێی تیۆردانان و توێژینەوە دەستی پێ کرد کە بەرهەمەکەی شکڵ گرتنی چەمکبەندی و مۆدێلێکی نوێی ئیتنیسیتە بوو. لەم چەمکبەندی و مۆدێلە گۆڕدراوە نوێیەدا لە سەر تایبەتمەندیی رەوانی، بەستێنمەندبوون، خوازراوبوون و بزۆك بوونی شوناسخوازی، و هەروەها رێکخراو و کرداری ئیتنیکی پێ دادەگێرێ (Nagel, 1998: 237).

ئیتنیسیتە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی و دەروونناسانەیە کە لە رێگای ئەوەوە تاکەکان بە هۆی گرووپێك و هێندێك لە لایەنەکانی کولتووری ئەو گرووپەوە شوناس وەدەست دێنن و پێیەوە دەبەسترێنەوە. ئیتنسیتە بریتییە لە وشیاری سەبارەت بە جیاوازی، زەقبوونەوەی زەینیی ئەم جیاوازییە و هەروەها کۆبوونەوە لە سەر بنەمای جیاوازی. ئیتنیسیتە کاتێك شکڵ دەگرێ کە کەسێك ئەم رستەیە تەواو بکا: "من... یکم، چونکە لە ... دا لەگەڵ گرووپی خۆم هاوپشکم". کەواتە ئیتنیسیتە دیاردەیەکی زەینییە، تەنانەت ئەگەر لە سەر توخم گەلی "بینراو" یان کولتووری و مێژوویی هاوبەشیش بونیاد نرابێ (Eller, 1999: 8 – 9).

لەباری تیۆرییەوە سێ تیۆری سەرەکی بۆ تاوتوێ کردنی ئیتنیسیتە و شەڕی ئیتنیکی هەن. تیۆری مێژینەگەرا ئیتنیسیتە بە تایبەتمەندییەکی ئاڵۆزی تاکەکان و کۆمەڵەکان دادەنێ. لەم روانگەیەوە، دابەش کردنەکان و ئاڵۆزییە ئیتنیکییەکان "سروشتی"ن، چ ئەم سروشتی بوونە میراتی بێ یان بەرهەمی چەند سەدە. مێژینەگەراکان ئەگەرچی شەڕ و توندوتیژیی ئیتنیکی بە دیاردەیەکی هەمیشەیی نازانن، بەڵام بڕوایان وایە کە ئەم شەڕ و توندوتیژییە لە جیاوازییە ئیتنیکییەکانەوە سەرچاوە دەگرێ و بەم پێیە پێویستیەك بە روون بوونەوەی ئەو نیە. بۆ وێنە ئانتۆنی سمیت یەکێك لە تیۆریستە دیارەکانی ناسیۆنالیسم و ئیتنیسیتە دەڵێ کە شەڕی ئیتنیکی بە چەشنێکی بێئەملاوئەولا لە ئینتیسیتەوە سەرچاوە دەگرێ (Smith, 1993: 40).



لە لایەکی دیکەوە بە پێی تیۆری ئامرازگەرا، ئیتنیك وەك ئامرازێك وایە کە تاکەکان و گرووپەکان یان دەستەبژێرەکان بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی خۆیان کەڵکی لــێوەردەگرن. بەم پێیە ئیتنیسیتە پێوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ سیاسەت هەیە و لە پرۆسەی هەوڵدان بۆ گەیشتن بە ئامانجە (سیاسی)یەکان کەڵکی لــێوەدەرگیرێ. ئەم کەڵك لــێوەرگرتنە چ لە چوارچێوەی بەرگری (خۆڕاگری لە بەرانبەر زێدەخوازییەکانی دیتران) و چ لە چوارچێوەی پەلاماردەرانە (گەیشتن بە مەبەستەکان)دا بێ، ئیتنیسیتە مارك یان دەستەیەك لە نیشانە هێماییەکانە کە بۆ گەیشتن بە سەرەتییە (امتیاز) سیاسییەکان بە کار دەبرێ (Lake, 1998: 6).

سێهەمین تیۆری سەرەکیی ئیتنیسیتە — کە کەم تا زۆر توخم گەلێك لە دوو تیۆرەکەی باسیان کراو روانگەکانی دیکە لە خۆ دەگرێ — تیۆری پێکهاتەگەراکانە. لە چوارچێوەی ئەم تیۆرەدا لە سەر ریشەکان و نێوەڕۆکی کۆمەڵایەتیی ئیتنیستیە پێ دادەگیرێ. بە گوتنێکی دیکە پێکهاتەگەراکان پێیان وایە ئیتنیسیتە نە شتێکی نەگۆڕە و نە بەتەواوی کراوە و رەوان، بەڵکوو[51] لە بەستێنە پەستێوتراوەکانی کارتێکەرییە دوو لایەنە کۆمەڵایەتییەکان دا دروست دەبێ. لە روانگەی ئەوانەوە ئیتنیسیتە تایبەتمەندییەکی تاکەکەسی نیە، بەڵکوو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و شوناسی تاك وەك باوە لە دەسەڵات و کۆنتڕۆڵی ئەو دا نیە. کەواتە بە گۆڕانی کارتێکەرییە دوولایەنە کۆمەڵایەتییەکان، تێگەیشتن لە ئیتنیسیتەش دەگۆڕێ (Lake, 1998: 6).

بە پێی تیۆری پێکهاتەگەرا، بەو پێیە کە ئیتنیستیە بە شێوەی کۆمەڵایەتی دروست دەبێ، سنوورەکان و شوناسە ئیتنیکییەکان بەردەوام لە رێگای کارتێکەرییە دوولایەنە کۆمەڵایەتییەکانی دەرەوە و ژوورەوەی ئیتنیکییەکان پێناسە و سنووردار دەکرێن و بەرهەم دێن. لە راستیدا ریشە، نێوەڕۆك و شکڵی ئیتینیکی رەنگدانەوەی هەڵبژاردنە داهێنەرانەکانی ئەو تاك و گرووپانەیە کە خۆیان و ئەوانی دیکە (دیتران) لە چوارچێوەی شێوازە ئیتنیکییەکان دا پێناسە دەکەن. ئەم پرۆسەیە جۆرێك چوارچێوە و سنوور دروست کردنی ئیتنیکییە کە مرۆڤەکان لە یەکتر جیا دەکاتەوە یان پێکەوە یەکگرتوویان دەکا.

51- ئەو سەوەتە(سەبەتە) چەرخدارەی لە فرۆشگاکان دا کڕیار ئەو کاڵایانەی هەڵیان دەبژێری دەی خاتە نێویەوە - و کوردی.

بەش و توخمە پێویستەکان بۆ دروست کردنی شوناس و سنووری ئیتنیکی بە هۆی کولتوورەوە دیاری دەکرێ. بە دەربڕینێکی دیکە دروست کردنی سنووری ئیتنیکی وەك دیاریکردنی شکڵی داشقەی دەستیی کڕین[52] (دەفرایەتی، ژمارەی چەرخەکان و...)ە و کولتووری ئیتنیکی تێکەڵاوێکە لەو شتانەی دەیخەنە نێو داشقەکەوە (هونەر، موسیقی، جل و بەرگ، ئایین، خدەکان، بڕواکان و هێماکان). سنوورە ئیتنیکییەکانی بژاردە شوناسییەکان، پێکهاتەی ئەندامان، رادەی ئەندامەتی و شکڵی رێکخراوی ئیتنیکی دیاری دەکەن و وڵامی ئەم پرسیارە دەدەنەوە کە ئێمە کێین؟ کولتووریش هەم نێوەڕۆك و مانای ئیتنیسیتە داپێن دەکا و وڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە کە ئێمە چین؟ (Nagel, 1998: 251).

ئەگەرچی ئیتنیسیتە بە هۆی دروست کردنی کولتوورە دروست دەبێ، بەڵام ئیتنیسیتە بە هیچ شێوەیەك پێڕەو و رەنگدانەوەی رووتی کولتوور نیە. ئەوەی لەم پرۆسەیەدا روو دەدا، نوێژەن کردنەوە و تەنانەت ساختەکاریی بەردەوامی کولتوورە بە پێی[دۆخی] ئێستا و بە سەرنج دان بە تێبینییەکانی داهاتوو. لەم روانگەیەوە گرووپی ئیتنیکی دیاردەیەکی کۆیی کۆنەپەرستی پاشکەوتخواز، بینراو و یەکگرتوو نیە، بەڵکوو بەرهەمی ئێستایە. ئەم دیاردەیە بە مانای ئامادەیی رابردوو لە دۆخی نوێ و ئێستا دایە و تاکەکان و گرووپەکان لە روانگەی ئێستاوە رابردوو وەبیر دێننەوە (Eller, 1999: 47).

دوای ئەم باسە کورتە سەبارەت بە ئیتنیسیتە و شەڕی ئیتنیکی و پێوەندیی ئەوان بە کولتوورە، ئێستا باشترە وێنەیەکی کورت لە دۆخی ئیتنیکی و بزووتنەوە ئیتنیکییەکان لە جیهان دا بخەینە بەرچاو و ئاماژە بە نموونە بەرچاوەکانی ئەم جۆرە تایبەتگەراییە بکەین. ئەگەرچی ئەم تایبەتگەرایییانە لە چوارچێوەگەلی جۆراوجۆری وەك رکەبەرایەتی، ئاڵۆزی و شەڕ دا دەردەکەون، لە باس کردنی ئەوان دا لە جیاکردنەوە و دابەش کردنی وردیان خۆمان بواردووە، دوای چاوخشاندنێکی کورت بە نەخشە و ئاماری تایبەتگەراییە ئیتنیکییەکان لە جیهان دا، باس لەم تایبەتگەرایییانە لە ناوچە و کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی جیهان دەکەین.

52- ئەو سەوەتە(سەبەتە) چەرخدارەی لە فرۆشگاکان دا کڕیار ئەو کاڵایانەی هەڵیان دەبژێری دەی خاتە نێیەوە – و کوردی.





## ئاڵۆزی و شەڕی ئیتنیکی لە جیهان دا

بێ گومان لە لایەنی جۆراوجۆرەوە دەبێ ئیتنیسیتە بە یەکێك لە زەقترین پرسەکانی جیهان لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم و ساڵەکانی سەرەتای سەدەی بیست و یەکەم بژمێرین. سەرچاوە ئامارییە جۆراوجۆرەکان دەری دەخەن کە ئێستاکە زیاتر لە سەدا هەشتای وڵاتانی ئەندامی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان خاوەنی فرەیی و جۆراوجۆریی ئیتنیکین و زیاتر لە دوو یان چەند کۆمەڵگەی ئیتنیکی لە خۆ دەگرن. ئەم کۆمەڵانە بەردەوام و بە شێوەی ئاشتیخوازانە یان توندوتیژانە بۆ باڵادەست بوون (بەدەستەوەگرتنی دەزگای حکوومەت)، گەیشتن بە سەربەخۆیی و خودموختاری(ئۆتۆنۆمی) یان ئاوێتەبوون لە کۆمەڵگە دا بۆ دەسڕاگەیشتن بەهەڵکەوتەیی باشتر لەگەڵ یەکدی رکەبەرایەتی دەکەن (Esmsn, 1999: 259).

ئەگەر شەڕە بچووکەکان لە بەرچاو نەگرین، نزیکەی ٣٧ شەڕی نێوخۆیی گەورە دەتوانین لە جیهان دا دەس نیشان بکەین کە نزیکەی هەموویان خاوەنی لایەنێکی گرنگی ئیتنیکین و لە هەر کام لەوان دا زیاتر لە هەزار کەس کوژراون. بەگشتی، ئەم شەڕانە نزیکەی ٣٨ میلیۆن بێ ماڵ و حاڵ و حەوت میلیۆن کوژراوی لــێکەوتۆتەوە و ئەگەر ئاماری شەڕە ئیتنیکییە بچووکەکانیش (ئەو شەڕانەی کەمتر لە هەزار کوژراویان بووە) کە زۆر زیاترن، بخەینە سەر ئەوان، ژمارەی بێ ماڵ و حاڵەکان و کوژراوەکان زیاتر دەبێ (Lake, 1998: 339).

نزیکەی نیوەی شەڕە ئیتنیکییەکان لە ساڵی ١٩٨٩ بەم لاوە کە کۆتایی شەڕی سارد و سەرەتای بە ناو "تەکووزیی نوێی جیهانی" بوو دەستیان پێ کردوە. لەم رووەوە زۆر لە بیرمەندان و توێژەران بڕوایان وایە کە مرۆڤەکان ئێستا لەگەڵ بێسەرەوبەرەییەکی جیهانی نوێ کە لە سەر شەڕە ئیتنیکییەکان بونیاد نراوە بەرەوروون. لەم شێواوییە جیهانییە نوێیە دا، زۆر لە خەڵك پەرۆشی تەنینەوەی شەڕی ئیتنیکین و دڵەڕاوکێی ئەوەیانە کە شەڕی ئیتنیکی لە شوێنێك رەنگە ناوچەکانی دیکەش بگرێتەوە.

دیارە ئەم پەرۆشی و ترسە نالۆژیکی نایەتە بەچاو، چونکە بزووتنەوە و شەڕە ئیتنیکییەکان لە بەستێن و هەلومەرجی جۆراوجۆردا دروست دەبن و جۆراوجۆرن. هێندێك جار بەستێنی شکڵ گرتنی ئەم بزووتنەوە و شەڕانە کەمایەتییە گەورەکانن (وەك کبێك و پاکستانی رۆژهەڵات) و هێندێك جاریش کەمایەتییە بچووکەکان (وەك فریسیانەکان لە هولەند، ژوراسیانەکان لە سویس و گورکانەکان لە هیند). بەم پێیە پڕئەژمار یان کەم

ئەژمار بوونی گرووپە ئیتنیکییەکان نابێتە کۆسپ لە بەردەم شەڕ و ئالۆزیی ئیتنیکی دا (Jalali, 1998: 317).

چیەتی و نێوەرۆکی شەڕەکان و بزووتنەوە ئیتنیکییەکان هەم کولتوورییە، هەم ئابووری. بۆ وێنە لە وێلز و سکاتلەند پرسە ئیتنیکییەکان نێوەرۆکێکی ئابووریی پڕ رەنگتریان هەیە، لە کاتێك دا کە لە پێوەندی لەگەڵ باسکی ئیسپانیا و کبێکی کانادا دا رووکاری کولتووری زەقترە. جگە لەمە لە وڵاتێکی وەك هیندا، هەم ناوچە دواکەوتوو و هەژارەکانی وەك ناگالاند نارەزایەتیی ئیتنیکییان تێدایە و هەم هەرێمێکی گەشەکردووی وەك پەنجاب (Jalali, 1998: 318).

بەستێنی سیاسیی پرسە ئیتنیکییەکانیش جۆراجۆرە و شوناس، ئالۆزی و شەڕی ئیتنیکی لە چوارچێوەی سیستەمە سیاسییە جۆراوجۆرەکان دا دروست دەبێ: لە سیستەمێکی دیمۆکراتیکی وەك هیند و بێلژیك دا یەکگرتنی ئیتنیکیی گەورە دروست دەبێ؛ سیستەمە سەرەڕۆیەکانی وەك ئیسپانیای فرانکۆ و ئۆگاندا کێشەی ئیتنیکیی گەورەیان هەبووە و هەیە؛ دەوڵەتە ناوەندگەراکانی وەك فەڕانسە و سینگاڵ هێشتا نەیان توانیوە کێشە ئیتنیکییەکانی خۆیان چارەسەر بکەن؛ لە سیستەمە فیدراڵەکانی وەك یۆگۆسلاوی و هێندیش دا ئیتنیکەکان زۆر چالاکن (Jalali, 1998: 318).

جۆراوجۆریی نیشانە کولتوورییەکان جیاوازیی ئامانجەکان لە جاڕدان و ئامادەکردنی ئیتنیکی دا، تایبەتمەندییەکی دیکەی ئەم جۆرە تایبەتگەراییەیە. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کانادا، بەشێکی بەرچاو لە ئەفریقا، ئیرلەندی باکوور، بە شوێن یەك دا لە نیشانەکانی وەك رەنگی پێست، زمان، وەفاداریی خێڵەکی و ئایین کەڵك وەردەگیرێ. هێندێك لە بزووتنەوەکان سەربەخۆیی کولتوورییان دەوێ و هێندێکی دیکە لە هەوڵی وەدەست هێنانی مافی یەکسان لە نێو سیستەمی باڵادەست دان. هەر چۆنێك بێ لە هەمووی ئەم نموونانە دا بزووتنەوەکان نیشانەی زەقی شوناسی گرووپی و ویستی دابەش کردنی دادوەرانەی سەرچاوە سیاسی و ئابوورییەکانن (Jalali, 1998: 318).

**ئافریقا:** وشکایی ئەفریقا دەبێ بە وشکایی فرەیی ئیتنیکی دابنرێ کە لە چوارچێوەی سەدان خێڵ و هۆزدا دەرکەوتووە. زۆربەی وڵاتانی هەڵکەوتوو لەم وشکاییە کۆمەڵگەگەلی چەند ئیتنیکین و لە زۆربەی ئەوان دا تەنانەت گرووپێکی ئیتنیکی کە زۆرینە بێ بوونی نیە. بۆ وێنە لە سەرانسەری جیهان دا ٢٣٠ کەمایەتی کە لە دۆخێکی قەیرانی و مەترسیدار دان



٧٢ گرووپیان لە باشووری بیابانی ناوەندیی ئەفریقا دەژین (Jalali, 1998: 320). هەر کام لەم کەمایەتییە ئیتنیکییانەش لە کەمایەتیی بچووکتر پێك هاتوون.

هەروەها ئەم دۆخە بە هۆی سیاسەتە کلۆنیالیییەکانەوە ئالۆزتر بووە. نزیکەی سەد ساڵ لەوە پێش کە ئەورووپاییەکان سنوورە سیاسییەکانی نێوان کۆمەڵگە ئەفریقاییەکانیان کێشایەوە، لە راستی دا بەستێنی شکڵ گرتن، بەردەوامی و یان توندتربوونی ئالۆزیی و شەڕە ئیتنیکییەکانیش پێك هات. ئەوان زۆربەی جارەکان سنوورە سیاسییەکانیان بە جۆرێك دەکێشا کە گونجاوییەکی ئەوتۆی لەگەڵ سنوورە ئیتنیکییەکان نەبوو. بە هۆی ئەم کارەوەیە کە ئەمڕۆکە ژمارەیەك لە هۆزەکان و کەمایەتییە ئیتنیکییەکان لە زیاتر لە وڵاتێك دا بڵاوبوونەتەوە و هێندێك جاریش چەند ئیتنیکی لێك جیاواز لە پانتایی دەوڵەتێك دا نیشتەجێن.

ئەم دۆخە، وشکایی بەرینی ئافریقای کردۆتە بەستێنی زەقترین تایبەتگەراییە ئیتنیکییەکان. ئەم تایبەتگەراییانە کە لە ساڵانی رابردوودا توندتر بووە، کەم تا زۆر لە زۆربەی کۆمەڵگە ئەفریقاییەکان دا دەرکەوتووە. لە راستی دا ئێستاکە کەم وڵاتی ئەفریقایی هەیە کە بە شێوەیەك لە شێوەکان تووشی ناکۆکی، رکەبەرایەتی، ئالۆزی و شەڕی ئیتنیکی نەبێ. هێندێك جار تایبەتگەراییە ئیتنیکییەکان زۆر توندوتیژانەن و ژیانی میلیۆنان مرۆڤ لە مەترسی دەخەن، بۆ وێنە لە شاخی ئەفریقا.

شاخی ئەفریقا چوار دەوڵەتی جیبوتی، ئیتیۆپی، ئێریترە و سۆمالی دەگرێتە خۆی و لە لایەنی تایبەتگەرایی ئیتنیکییەوە بە قەیرانیترین ناوچەیی وشکایی ئەفریقا دەژمێردرێ. ئێریترە لە ساڵی ١٨٩٠دا کلۆنی ئیتالیا و دوای شەڕی جیهانی دووهەم لە لایەن رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە درا بە ئیتیۆپی، بەو مەرجەی دەوڵەتی ئیتیۆپی بەڕێوەبردنی بەشی بەرچاوی کاروبارەکانی ئێریترە بە خۆیان بسپێرێ، بەڵام دەوڵەتی ئیتیۆپی هەر لە سەرەتاوە ئەم مەرجەی لە ژێر پێ نا و سیاسەت گەلێکی چەوسێنەرانەی دژی ئێریترە گرتەبەر.

زۆری نەخایاند کە ئێریترەییەکان دژکردەوەیان نیشان دا و کەوتنە بەربەرەکانی لەگەڵ دەوڵەتی ئیتیۆپی. رووبەڕووبوونەوەی دوو گرووپی ئیتنیکی گەورە شەڕێکی نێوخۆیی لێکەوتەوە کە نزیکەی ٣٠ ساڵ (٩١ — ١٩٦٠)ی خایاند. ئەم شەڕ و توندوتیژییە ئیتنیکییە درێژماوەیە شوێنەواری زیانباری بەربڵاوی لێکەوتەوە و بووتە هۆی ئەوە کە نزیکەی ٦٦٥ هەزار ئێریترەیی پەنا بۆ سودان بەرن. سەرەنجام لە ساڵی ١٩٩١دا ئیتیۆپییەکان شکان و لە ساڵی ١٩٩٣ ئێریترە سەربەخۆ بوو (Rubenstein, 1999: 249).

بەڵام ئیتیۆپی هەروا وەك وڵاتێکی چەند ئیتنیکی مایەوە و لەگەڵ کێشەی ئیتنیکیی جۆراوجۆر بەرەوروو بوو کە تێکهەڵچوونە توندوتیژانەکان لەگەڵ سۆمالی لە ریزی ئەوان دایە. لە درێژایی دەیەی نەوەددا ئیتیۆپی زۆرجار لە سەر ئۆگاندا لەگەڵ سۆمالی کەوتە شەڕەوە و هەنگاوگەلێکی بەربڵاوی بۆ پاکتاوکردنی ئەم ناوچەیە لە سۆمالیاییەکان هەڵێنایەوە. بە پێی ئاماری ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان لە رەوتی ئەم پاکتاوکردنە ئیتنیکییەدا نزیکەی ٣٦٥ هەزار ئیتیۆپیایی پەنایان بردە بەر سۆمالی (Rubenstein, 1999: 249).

سۆمالی، وڵاتێکی دیکەی هەڵکەوتوو لە شاخی ئەفریقا، لە ساڵانی دوایی دا تووشی شەڕ و توندوتیژیی زۆر بووە. ئەم وڵاتە خاوەنی شەش گرووپی ئیتنیکیی سەرەکییە کە هەر کام لەوان بە شێوەیەکی نەریتی لە بەش و ناوچەی جیاواز جێگیرن. لە دەیەی نەوەددا ناکۆکی و ئاڵۆزییە باوەکانی نێوان گرووپە ئیتنیکییەکان زۆر توند بوو و شەڕی خوێناویی لـێکەوتەوە. ئیتنیکە بەهێزەکان دەستیان بە سەر خواردەمەنی و سامان و چەك داگرت و ئیتنیکە لاوازترەکانیش پەنایان بردە بەر ئۆردوگاکان (Rubenstein, 1999: 250).

سودانیش لە دەیەی هەشتاوە تووشی شەڕێکی نێوخۆیی بووە کە لە لایەنە پێك هەڵپرژاوەکانی ئەو رەش پێستە مەسیحییەکانی دانیشتووی پارێزگاکانی باشوور و عەرەبە موسوڵمانەکانی نیشتەجێی باکووری وڵاتن. رەش پێستەکان بۆیە دەستیان کردوە بە شەڕ لەگەڵ عەرەبەکانی باکوور بۆ ئەوەی بەر بە هەوڵەکانی ئەوان بۆ گۆڕینی کۆمەڵگەی چەند ئیتنیکی بە کۆمەڵگەیەکی هاوشێوە(یەکدەست)ی بونیادنراو لە سەر نەریتی ئیسلامی بگرن. لە رەوتی شەڕدا زیاتر لە میلیۆنێك سوودانی ناچاربوون لە باشوورەوە بۆ باکوور و ٣٥٠ هەزاری دیکە بۆ ئیتیۆپی کۆچ بکەن (Rubenstein, 1999: 250).

بەڵام توندترین شەڕ و توندوتیژیی ئیتنیکی لە وشکایی ئەفریقا لە ئەفریقای ناوەندی و دوو وڵاتی برۆندی و رواندا رووی دا. لە هاوینی ١٩٩٤دا وێنەگەلێکی ورووژێنەر لە توندوتیژی و بێ رەحمی کەوتە سەر رووبەری (مانیتۆر)تلویزیۆنەکانی زۆر لە خەڵکی جیهان؛ وێنەگەلێك لە لاشەی زۆری ژنان و پیاوان و منداڵان، گوندە سووتاو و خاپوورکراوەکان و کۆمەڵە مرۆڤێك کە یەخسیری شەپۆلە بەلرفەکانی رووبارە ناوچەییەکان بوون. ئەم کارەساتە مرۆییە لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا دەرەنجامی هەڵسوکەوتێکی سەرەتایی نێوان دوو کۆمەڵگەی جیاوازبوو کە هەبوونی کولتووری جیاواز، ئەوانی کردبووە دوژمنی سەرەکیی یەکتر (Eller, 1999: 195).



لە ساڵی ١٩٥٩دا تووتسییە خاوەن رەوەکان(مێگەل) کە نزیکەی چوار سەد ساڵ لەوە پێش کۆچیان بۆ ناوچەی رواندا و برۆندیی ئێستا کردبوو، دەستیان بە پاکتاوکردنێکی ئیتنیکی بەربڵاو کرد. ئەوان لەو ساڵەدا زۆربەی هوتۆ وەرزێرەکانیان کوشت یان ناچار کرد کۆچ بکەن. لەو کاتەوە توتسییەکان کۆنترۆڵی وڵاتیان بە دەستەوە گرت و سەرەڕای ئەوەی کە تەنیا پازدە لە سەدەی کۆی حەشیمەتیان پێك دێنا، بە سەر هوتۆکان دا زاڵ بوون. چەند ساڵ دوای ئەم پاکتاوکردنە ئیتنیکییە، رواندا سەربەخۆ بوو و زاڵێتیی هوتووەکان بە سەر تووتسییەکان دا تا ساڵی ١٩٩٤ی خایاند.

لە ساڵی ١٩٩٤دا ئاگری شەڕ و توندوتیژیی ئیتنیکی دووبارە و تەنانەت زۆر توندتر لە پێشوو کلپەی ئەستاند. بەرەی نوێی توتسییە راکردوو و کۆچکردووەکان— کە سەبارەت بە پاکتاوکردنی ئیتنیکی ساڵی ١٩٥٩ و چەندین ساڵ جیاوازیدانانی ئیتنیکی وشیار ببوونەوە— بە مەبەستی تۆڵە ئەستاندنەوە هێرشیان بردە سەر رواندا. بەم چەشنە جارێکی دیکە شەڕ و پاکتاوکردنی ئیتنیکی دروست بوو و لە رەوتی ئەوەدا نزیکەی ٨/٥ میلیۆن رواندایی کە چل لە سەدی کۆی حەشیمەتیان پێك دێنا کوژران یان پاکتاوکران (Rubenstein, 1999: 261 – 62).

دیارە تایبەتگەراییە ئیتنیکییەکانی ئەفریقا لەم نموونانەی سەرەوە دا کورت نابنەوە. لەم وشکاییە دا بێجگە لە چەند وڵاتی وەك: نیجریە، هەموو وڵاتەکان کەم تا زۆر دوچاری جۆرێك، کەڵێن، ئاڵۆزی و شەڕی ئیتنیکین کە لە ساڵانی دوایی دا توندتر بووە. لە دەیەکانی ١٩٨٠ و ١٩٩٠دا، بێجگە لە شاخی ئەفریقا و ئەفریقای ناوەندی، باشوور و رۆژهەڵاتی ئەفریقاش مەیدانی شەڕە ئیتنیکییە زێدرووەیەکان بووە. توندترین شەڕەکان ئەو کاتانە رووی دەدا کە ناکۆکییە ئایینییەکان لەگەڵ ناکۆکییە ئیتنیکییەکان دەکەوتنە سەر یەك (Curr, 1993: 89).

*ئاسیا:* ٢١ وڵاتی رۆژهەڵات، باشووری رۆژهەڵات و باشووری ئاسیا خاوەنی کەمایەتیی ئیتنیکیی بەرچاون کە بە گشتی ٤٣ گرووپی ئیتنیکی پێك دێنن. لە ساڵانی دوایی دا ژمارەیەك لەم گرووپانە سەبارەت بە زیادبونی کۆنترۆڵی سیاسی و زۆربوونی حەشیمەتی بنگالییەکان، بیرمەییەکان، چینییەکان، هیندووەکان و جاوەییەکان هەستیارتر بوون و دەستیان کردوە بە بەرەنگاریی سیاسیی رێکخراو. ئاراکانەکان، دایاکەکان، میزۆکان، موونەکان، پاپوانەکان، تبتییەکان و گرووپە ئیتنیکییەکانی دیکە دەتوانین بخەینە ئەم دەستەیەوە (Gurr, 1993: 25).

لەم ٤٣ گرووپە، سێزدە گرووپی ئیتنیکیش نارەزایەتیی ناچالاکانە و شۆڕشی پەرچەکردرانەیان وەلا ناوە، بزووتنەوەی جیاوازیخوازانەی چالاکانە و ڕێکخراویان پێك هێناوە. هێندێك لە کەمایەتییە ئیتنیکی — ئایینییەکانیش لە دەیەکانی دوایی دا سیاسی بوون بۆ ئەوەی لە باوەڕ، شێوەی ژیان و نیشتمانی خۆیان بەرگری بکەن: کەمایەتییە موسوڵمانەکانی ئەو کۆمەڵگایانەی زۆرینەیان هیندوو، بودایی و مەسیحییە (موسوڵمانانی هیند و باشووری تایلەند)، سیکەکانی هیند، گرووپی چام لە کامبوج و مورۆکانی فیلیپین (Gurr, 1993: 25).

بەڵام گرنگترین تایبەتگەرایی ئیتنیکی لە سریلانکا دروست بووە. ئەم وڵاتە بە نزیکەی ١٨/٣ میلیۆن کەس حەشیمەتەوە (لە ساڵی ١٩٩٣دا) خاوەنی دوو گروووپی ئیتنیکیی گەورەیە: سینهالەکان و تامیلەکان. سینهالەکان ٧٤ لە سەدی حەشیمەت پێك دێنن، زمانی تایبەت بە خۆیان هەیە و زۆربەیان بوودایین. تامیلەکانیش هەژدە لە سەدی حەشیمەت دەگرنەوە، بە زمانێکی جیاواز دەئاخاوێن و زۆربەیان هیندوو مەزهەبن. کەمایەتیی دیکەش وەك موسوڵمانەکان و مالاییەکان لەم وڵاتەدا دەژین (Rubenstein, 1999: 251).

خەڵکی سریلانکا باس لە ٢٥٠٠ساڵ شەڕی نێوان دوژمنە کۆنەکان دەکەن، بەڵام مێژووی نوێی ئالۆزی و شەڕی ئیتنیکیی نێوان ئەم دوو گرووپە لە پەنجا ساڵ لەوە پێشەوە دەستی پێ کردوە. یەکەمین تێکهەڵچوونە توندەکانی نێوان سینهالەکان و تامیلەکان لە ساڵی ١٩٥٦ و ساڵی ١٩٥٨ دا رووی دا. لە ساڵی ١٩٧٤دا جارێکی دیکە شەڕی ئیتنیکی توند بوو و کوژران و بێ ماڵ و حاڵ بوونی هەزاران کەسی لـــێکەوتەوە. نۆ ساڵ دواتر (١٩٨٣) شار و گوندەکانی سریلانکا دووبارە بوونەوە بە گۆڕەپانی پێکدادانی توندوتیژانەی دوو گرووپی ئیتنیکی کە ئەمڕۆکە بە توندترین شەڕی ئتنیکی لەم وڵاتەدا دەژمێردرێن (Eller, 1999: 95).

دیارە ناوهێنانی سێ قۆناخ لە مێژووی پێوەندییە پڕ کێشە و ئالۆزییەکانی نێوان سینهالەکان و تامیلەکان بەو مانایە نیە کە لە مەودای نێوان ئەو قۆناخانەدا، شەڕ و ئالۆزیی ئیتنیکی لە نێوان ئەوان دا راوەستاوە. تامیلەکان لە درێژایی چەند دەیەی رابردوودا بەردەوام بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆیی شەڕیان کردوە و لەم پێناوەدا تەنانەت سەرۆك کۆماری کۆماری سریلانکاشیان لە ساڵی ١٩٩٣دا کوشتوە (Rubenstein, 1999: 251). بەم پێیە دەتوانرێ بگوترێ کە تایبەتگەرایی ئیتنیکی لەم وڵاتەدا توندتر و بەربڵاو دەبێ و ئەم ڕەوتە بەرزەروویە لە قۆناخگەلێکی تایبەت دا و لە چوارچێوەی رووداوگەلێکی دیاریکراودا بە راشکاوانە دەردەکەوێ.





ئەم تایبەتگەراییە ئیتنیکییە زۆر پڕ تێچوو بووە. بە پێی راپۆرتە نارەسمییەکان لە توندترین توندوتیژیی ئیتنیکی دا کە ساڵی ١٩٨٣ روویدا نزیکەی دوو هەزار کەس گیانیان لە دەست دا و سەدان هەزار کەس ئاوارە بوون. لە رەوتی ئەم شەڕە نێوخۆییەدا تەنیا لە نێوان سەد تا سێسەد هەزار کەس لە دانیشتووانی پێتەخت (کلمبۆ)، بۆ دۆزینەوەی پەناگە لە ماڵ و هێلانەی خۆیان هەڵاتن. لە تێکهەڵچوونەکانی دیکەش دا ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانی شار و گوندە جۆراوجۆرەکانی سریلانکا کوژران یان ئاوارە و دەربەدەر بوون. لە زۆر لە سەرچاوەکان دا گوتراوە کە لە ساڵی ١٩٧٤ دا زیاتر لە سی هەزار کەس لە شەڕ و توندوتیژییە ئیتنیکییە جۆراوجۆرەکان دا گیانیان لە دەست داوە و نیو میلیۆن کەس ئاوارە و بێ ماڵ و حاڵ بوون (Eller, 1999: 95).

لە ناوچەکانی دیکەی ئاسیاش دا تایبەتگەرایی ئیتنیکیی جۆراوجۆر هەیە کە لە دەیەکانی دواییدا توندتر و بەرینتر بوون. وڵاتە تازە بە سەربەخۆیی گەیشتووەکانی ئەوپەڕی قەفقاز گۆڕەپانی ئالۆزی و شەڕی ئیتنیکیی روو لە زیادبوونن کە تا ئێستا سەرکوتکراو و شاراوە بوون، وڵاتانی ئاسیایی رۆژهەڵاتی نێوەڕاستیش کە بەردەوام یەکێك لە ناوەندە سەرەکییەکانی قەیرانی کولتووری — ئیتنیکی بوون، دەستەویەخەی چەشنی جۆراوجۆری ئالۆزی، شەڕ و توندوتیژیی ئیتنیکین. ئەم ئالۆزی و شەڕانە نەك هەر بەرینتر و توندتر دەبن، بەڵکوو بە تێکەڵاوبوون لەگەڵ کەلێن و ناکۆکییە کولتوورییەکانی دیکە (وەك ناکۆکیی ئایینی) ژیانی کۆمەڵایەتی ئالۆزتر دەکەن (Harff, 1994: 217).

فلستینییەکانی دانیشتووی سەرزەوییە داگیرکراوەکان و وڵاتانی دیکە ساڵیانێکە بۆ گەیشتن بە دەوڵەت و وڵاتی سەربەخۆ خەبات دەکەن. نزیکەی بیست میلیۆن کوردی ناعەڕەبی سوننی مەزهەبی دانیشتووی تورکیە، عیراق، ئێران، سوریە و سۆڤیەتی پێشوو، زیاتر لە رابردوو بۆ بەهێز کردنی کولتوور و زمانی خۆیان هەوڵ دەدەن و، لە سەر بڕیار و ئامانجی خۆیان واتە پێك هێنانی کوردستانێکی لانیکەم خودموختار سوورتر بوون. هاووڵاتیانی عەرەبی دەوڵەتی ئیسرائیلیش کە حەڤدە لە سەدی کۆی حەشیمەتی ئەم وڵاتە پێك دێنن، لە سەر بنەمای کولتوور و شوناس ئیتنیکی خەریکی خۆڕێکخستن و چالاکیی سیاسیین (Harff, 1994: 233).

لە وڵاتانی دیکەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاستیش دا وەك پاکستان، ئێران، عێراق و عەرەبستانی سعوودی، تایبەتگەراییگەلێك هەیە، بەڵام توندترین و زەقترین تایبەتگەرایی ئیتنیکی لە وڵاتانی لوبنان شکڵی دا گرتووە. ئێستاکە زۆربەی نزیك بە تەواوی حەشیمەتی لوبنان لە ٥٥

لە سەد موسوڵمان، ٣٨ لە سەد مەسیحی و حەوت لە سەد دەروزی پێك دێ کە هەر کام لەوان فیرقە و ئیتنیکی بچووکتر لە خۆ دەگرن. لەم رووەوە کۆمەڵگەی لوبنان خاوەنی فرەیی ئیتنیکیی زۆرە و بەستێنێکی لەبار بۆ پێکەوەژیان و تایبەتگەراییە ئیتنیکییە جۆراوجۆرەکان ئامادە دەکا (Rubenstein, 1999: 253).

*ئەمریکا:* توێژەران و خاوەنڕایانی ئەمریکای لاتین قسە لەوە دەکەن کە کۆمەڵگەکانی ئەو وشکاییە نژادپەرست نین و کەلەبەرە چینایەتییەکان زیاتر لە کەلەبەرە (ناکۆکی) ئیتنیکییەکان ئەم کۆمەڵگایانەی خستۆتە ژێر کاریگەرییەوە، بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە فرەیی ئیتنیکی بە بەراورد لەگەڵ فرەیی و شەڕی ئیتنیکی لە ئاسیا و ئەفریقا کەمترە، دەکرێ بڵێین لە هەموو وڵاتانی ئەم وشکاییە تایبەتگەرایی ئیتنیکی زێدەروو هەیە. رەش پێستەکانی دانیشتووی وڵاتە جۆراجۆرەکان پێوەندییەکی پڕ لە ئاڵۆزییان لەگەڵ سپی پێستە بە رەسەن ئەورووپاییەکان دا هەیە و پێوەندییەکی ئەوتۆ، شوناس و تایبەتگەرایی ئیتنیکیی ئەوان بەهێز دەکا. نزیکەی ٢٩ گرووپی ئیتنیکیی دانیشتووی ئەمریکای لاتین، هەموویان کەم تا زۆر لە دۆخێکی ئەوتۆ دان. دیارە تایبەتگەرایی ئیتنیکی لە وڵاتانی وەك بۆلیوی، برازیل، ئیکوادۆر، گواتمالا، میکزیك و پرۆ زەقترە (Jalali, 1998: 320).

لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، زنجیرەیەك پرۆسەی حەشیمەتی، سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووری یارمەتی بە دروست کردنەوەی سنوورە ئیتنیکییەکان و توندترکردنی ئاڵۆزی و شەڕە ئیتنیکییەکان دەکەن. ئەم گۆڕانکارییانە دابڕانە ئیتنیکییەکان زەقتر دەکەن و ئاڵۆزییەکانی نێوان ئیتنیکییەکان زیاتر دەکەن و بزووتنەوە ئیتنیکییەکانی نێوان رەش پێستەکان و سپی پێستەکان بەهێز دەکەن. بە دەربڕینێکی دیکە لە دەیەکانی دوایی دا شوناس و تایبەتگەرایی ئیتنیکی لە نێو زۆر لە گرووپە ئیتنیکییە پڕ ئەژمارەکانی ئەم وڵاتە دا بەهێز بووە، هەرچەند هێزە هاوچەشنکەر و ئاوێتەکەرەکانیش چالاك و کاریگەرن.

لەم رووەوە لە هێندێك لە توێژینەوەکانی ئەم دواییانە دا ئاماژە بە پاڕادۆکسێکی ئیتنیکیی سەرنجڕاکێش لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کراوە. سەرەڕای بوونی زۆر نیشانەی کەم بوونەوە و لاوازبوونی سنووربەندییە ئیتنیکییەکانی نێوان سپی پێستەکانی ئەمریکا، بە هۆی هاوسەرێتی، کارپێ نەکرانی زمان، گۆڕینی ئایین، کۆمەڵێك نیشانەی سەلمێنەری زیادبوونی شوناشخوازیی ئیتنیکی لە گۆڕێ دایە". ئەم دووانەییە دژ بە یەکە، رادەیەك بەرهەمی... (ئیتنیسیتەی هێمایی)یە کە تایبەتمەندییەکەی دەستەوداوێن بوونی



نوستالۆژیکی کولتووری بەرەی کۆچەر، یان کولتووری وڵاتی سەرەکییە...". ئەم راستییە نیشانەی خۆشەویستی نواندن بۆ نەریتێك و هەستی سەربەرزی سەبارەت بەوە (Nagel, 1998: 239).

لە نێو خەڵکی رەسەنی ئەمریکاش دا دەتوانین نموونەکانی شوناس سازیی ئیتنیکی کە لە ئاستە شوناسییە جۆراوجۆرەکان دا شکڵ دەگرێ، دەس نیشان بکەین. هێندێك جار، شوناس دۆزینەوە، لە دەستەوداوێن بوونی خێڵ یان نەریتێکی دیاریکراوەوە شکڵ دەگرێ. هێندێك جار شایەدی شوناس سازیی خێڵەکین کە توخمە حەشیمەتی و زمانییەکان رۆڵێکی کاریگەریان تێیدا هەیە. جۆر و ئاستێکی دیکەی شوناس دۆزینەوەی ناوچەییە و لە هەستی گرێدراوی بە ناوچەیەکی دیاریکراو وەك ئۆکلاهوما، کالیفۆرنیا و ئالاسکاوە سەرچاوە دەگرێ. هەروەها دەبێ باس لە شوناس سازیی بان نەتەوەیی بکرێ کە سەبارەت بە سنووربەندیی دانیشتووانە رەسەنەکانی ئەمریکا بە بەراورد لەگەڵ حەشیمەتی نارەسەنی ئەم وڵاتە دەگونجێ (Nagel, 1998: 241).

تایبەتگەراییە ئیتنیکییەکانی ئەمریکاییە بە رەچەڵەك ئاسیاییەکان ئاڵۆزترە. بە رەچەڵەك ئاسیاییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە نزیکەی سێ لە سەدی حەشیمەتی ئەم وڵاتە پێك دێنن و زۆربەیان لە رۆژئاوای ئەم وڵاتە نیشتەجێن، لە بەرانبەر نائاسیاییەکان دا خۆیان بە خاوەنی شوناسێکی ئیتنیکیی یەکگرتوو دەزانن. بەڵام لە نێو ئاسیاییەکان دا و لە بەستێنی گشتیی کۆمەڵگەی ئەمریکادا، بە نیشتمان و نەتەوەی سەرەکیی خۆیانەوە (ژاپۆنی، چینی، ویتنامی و...) دەبنە خاوەن شوناس. شوناسی رەشە ئەمریکاییە بە رەچەڵەك ئەفریقاییەکانیش رۆژ بە رۆژ زەقتر دەبێ و وشیاریی سەرچاوەگرتوو لە رەنگی پێست جار لەگەڵ جار زیاتر دەبێتە تەوەری شوناس دۆزینەوە و سنووربەندیی ئیتنیکی (Rubenstein, 1999: 231; Nagel, 1998: 241 -42).

نموونەیەکی زەقی دیکەی تایبەتگەرایی ئیتنیکی لە وشکایی ئەمریکادا، فەڕانسەیی زمانەکانی کانادان. ئەم فەڕانسەیی زمانانە لە رەچەڵەکە سەرەتاییە ئەورووپاییەکانن کە لە کانادا جێگیر بوون. ئەگەرچی کۆمەڵگەی فەڕانسەیی زمانەکانی کانادا لە پاراستنی زمان، ئایین و داب و نەریتی خۆیان دا چالاك و سوور بوون و یاسا و رێوشوێنەکانی کاناداش راستیی ئەوەی سەلماند بوو، بەڵام بە کردەوە کەوتوونەتە ژێر زاڵێتیی کاناداییە بە رەچەڵەك

ئینگلیسییەکانەوە کە لایەنی سیاسییەوە زاڵ بوون. ئەم جیاوایدانان و نایەکسانییە سیاسییە زۆرتر جۆرێك نزمنوارِیی کولتووری— ئیتنیکیی فەرِانسەیی زمانەکانی لەگەڵ دا بووە.

ئەم هۆکارانە کۆمەڵگەی فەرِانسەیی زمانەکانی کانادای کە نزیکەی ٢٧ لە سەدی کۆی حەشیمەتی ئەم وڵاتە پێك دێنن و بە گەورەترین گرووپی نەتەوەگەرای ئیتنیکی لە کۆمەڵگەیەکی دیمۆکرات دا دەژمێردرێن، بەرەو تایبەتگەرایی کولتووریی بەردەوام و زێدەروو پاڵ پێوەناوە. لە نیوەی دووهەمی دەیەی شەست دا بزووتنەوە نەتەوەگەرایانەکانی وەك "حیزبی کبێك" دروست بوو. زۆری نەخایاند کە رێبازی ئاشتیخوازانە و پارێزگارانەی ئەم جۆرە بزووتنەوانە، کبێکە توندرِۆیەکانی ناچار کرد رێکخراوگەلی رادیکاڵ و دژایەتیخواز دامەزرێنن و رێکخراوەکانی وەك "بەرەی رزگاریدەری کبێك" لە گۆرِپانی سیاسیی کانادا دا دەرکەوتن.

بەم پێیە شەپۆلێك لە کردەوەی توندوتیژانە، وەك تیرۆری کاربەدەستە پایە بەرزەکان، بۆمب دانانەوە و شەرِ سەر شەقامەکان، ناوچە جۆراوجۆرەکانی کانادای گرتەوە(Gurr, 1993: 160 – 61).

لە کۆتاییەکانی دەیەی هەشتادا، بە هۆی هێندێك هەنگاو و چاکسازیی سیاسی و یاساییەوە، بزووتنەوەی ئیتنیکیی کبێك هێندێك ئارام بۆوە، بەڵام لە دەیەی نەوەددا نەتەوەگەرایی کبێك دووبارە توند بۆوە و فەرِانسەیی زمانەکانی کانادا سوورتر لە هەمیشە خوازیاری سەربەخۆیی بوون. لە نێوەرِاستی ساڵی ١٩٩٢دا نوێنەران و چالاکە سیاسییەکانی بزووتنەوەی نەتەوەگەرایی ئیتنیکیی کبێك لەگەڵ بەرپرسانی حکوومەتی ناوەندیی کانادا دەستیان بە وتووێژ کرد تا سەرەتی (امتیاز)ی زیاتر وەرگرن، بەڵام ئەم وتووێژانە بێ ئاکام بوون، لە ساڵی ١٩٩٥یش دا هەوڵێکی دیکە لە پێناوی سەربەخۆییدا درا کە ئاکامێکی شیاوی سەرنجی لـێنەکەوتەوە. هەر بەم هۆیە دژایەتیی کولتووری و نەتەوەگەرایی و جیایی خوازیی کبێکییەکان رۆژ بە رۆژ بەرینتر و توندتر دەبێ (Eller, 1999: 344 – 45).

***ئەورووپا:*** پێکهاتەی کولتووری — ئیتنیکیی وشکایی ئەورووپا هاوچەشنتر لە وشکایی ئاسیا و ئەفریقایە، چونکە لە درێژایی چەندین دەیەدا بە شێوەی ئاشتییانە و توندوتیژانە بەشی زۆری فرەیی و جیاوازییە کولتووری و ئیتنیکییەکانی ئەم وشکاییە لە نێو چوە. لە ساڵی ١٩١٠ تا ١٩٣٠ رێژەی ئەو ئەورووپاییانەی کە سەر بە گرووپێکی ئیتنیکی بوون بەڵام دەوڵەتی سەربەخۆیان نەبوو، لە ٢٦ەوە گەیشتە حەوت سەد. دوای شەرِی جیهانیی دووهەمیش نزیکەی بیست میلیۆن ئەورووپایی نیشتمانی سەرەکیی خۆیان بە جێ هێشت و لە شوێنی نوێ نیشتەجی بوون (Krejci, 1981: 63 – 64).





بەڵام ئەم گۆرانکاری و رێ و شوێنانە، تایبەتگەرایی کولتووریی لەم وشکاییە لە نێو نەبردوە و ئێستاکە مەیل و بزووتنەوەی ئیتنیکیی روو لە زیادبوون و پەرەگرتن لە گۆرِێ دایە. لە ئەورووپای رۆژئاوا، بریتانیا لەگەڵ گرفتی ئیتنیکیی ئیرلەندی باکوور، سکاتلەند و وێلز بەرەوروویە. باسکەکان و کاتالانەکان چەندین ساڵە کە بۆ جیابوونەوە لە ئیسپانیا و پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ خەبات دەکەن. لە فەرِانسە خەبات و بزووتنەوەی ئیتنیکیی بێرتنەکان و باسکەکان نموونەی دیاری تایبەتگەرایی کولتوورین. وڵاتانی دیکە ئەورووپای رۆژئاوایش کەم تا زۆر گۆرەپانی ئەم جۆرە تایبەتگەراییانەن (Giddens, 1998: 31 – 32; Peterson, 1999: 90).

زێدەتر لەوانە، تێکەڵاویی کولتووریی سەرچاوەگرتوو لە کۆچەکان و هەروەها لەبەریەك هەڵوەشانی سۆڤییەت و یۆگسلاوییش تایبەتگەرایی کولتوورییان لە ئەورووپای رۆژئاوا دا بەهێز و بەگورِ کردوە. کرێکارانی میوان (کۆچەر) کە نزیکەی حەوت تا پازدە لە سەدی کۆی حەشیمەتی ئەورووپای رۆژئاوا پێك دێنن، زۆرتر خاوەنی کولتوور و زمانی جیاوازن و هەر بەم هۆیەوە ئاڵۆزیی ئیتنیکی نوێ پێك دێنن. لە ئاڵمان پەلاماردانی کرێکارانی بیانی شتێکی ئاساییە و رۆژ بە رۆژ لە زیادبوون دایە. هەروەها حیزبە راستە رادیکاڵەکان لە وڵاتانی وەك فەرِانسە بە پێداگرتن لە سەر سیاسەتی دژە کۆچ و تۆختر کردنی مەترسیی کۆچی بیانەکان و لە نێوچوونی پاکژیی رەگەزی دەنگی زۆرتر دێننەوە (Jalali, 1998: 323).

تایبەتگەرایی ئیتنیکی لە ئەورووپای رۆژهەڵات توندتر و زەقتر لە ناوچەکانی دیکەی ئەم وشکاییە. هەر دوابەدوای لە بەر یەك هەڵوەشانی سۆڤیەت و کۆتایی دەسەڵاتی رووسەکان بە سەر سیاسەت وکولتووری ئیتنیکە جۆراوجۆرەکانی ئەورووپای رۆژهەڵات دا، ویست و مەیلە کولتوورییە سەرکەوتکراوەکان جارێکی دیکە دەرکەوتن و رێکخستنی سیاسی لە سەر بنەمای خۆئاگایی(وشیاریی) کولتووری — ئیتنیکی سەرانسەری ئەم ناچەیەی گرتەوە. یۆگسلاوی کە هیچ کام لە گرووپە ئیتنیکییەکانی لە زۆرینە دا نەبوون، لێك بڵاوبوو و چوار کۆماری سلوونی، کرواسی، بۆسنی هێرزگۆوین و مەقدوونیە سەربەخۆییان راگەیاند. دیارە ئەم تایبەتگەراییانە هێندێك جار (وەك بۆسنی هێرزگۆوین) زۆر توندوتیژ بوون (Hutchinson, 1994: 11).

لە ناوچەکانی دیکەی ئەورووپای رۆژهەڵاتیش دا دۆخێکی تارِادەیەك هاوشێوە زاڵە: چێکەکان و سلواکەکان چێکسلۆاکییان بە دوو وڵاتی سەربەخۆ دابەش کردوە: کەمایەتییە مەجارەکانی دانیشتووی رۆمانی بە توندی و لێبرِاوییەکی زۆرتر ویستە ئیتنیکییەکانیان دێننە گۆرِێ؛ نزیکەی یەك میلیۆن کەمایەتیی تورکی بولغارستان کە تا ئەم ساڵانەی دوایی لە

هەڵبژاردنی ناوی تورکی و قسەکردن بەم زمانە و ڕەچاوکردنی داب و نەریت ڕێوشوێنی ئیسلامی بێبەش بوون، ئێستاکە بۆ وەدەستهێنانی ماف و سەرەتیی زیاتر هەوڵ دەدەن؛ دژایەتی جوولەکە و بیانەش لە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات لە زیادبون دایە (Rubenstein, 1999: 248).

## نەتەوەگەرایی

لە سەرەتای باس کردن لە تایبەتگەرایی ئیتنیکی دا گوترا بێجگە لە جۆرەکانی ئاڵۆزی، دژایەتی و وشیاریی بنیاتنراو لە سەر جیاوازی و ناکۆکییە ئیتنیکییەکان، بزووتنەوە نەتەوەییەکانیش دەتوانین بە جۆرێکی دیکەی تایبەتگەرایی ئیتنیکی لە قەڵەم دەین. بەم پێیە ئەگەرچی جیاکردنەوەی ئەم تایبەتگەراییە لەو تایبەتگەراییانەی ناویان هێنرا زۆر دژوار و هێندێك جاریش نەکراوە، بەڵام بێ گومان لەبەرچاو گرتنی بزووتنەوە نەتەوایەتییە جۆراوجۆرەکان لە جیهانی هاوچەرخ دا باس کردن لەم دەستەیە لە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان خەوشدار دەکا. لە سەر ئەم بنەمایە دوای ئاماژە کردن بە جیاوازیی نێوان ئیتنیسیتە و ناسیۆنالیسم و چەمکی ناسیۆنالیزم، باسێکی کورتیش سەبارەت بە بۆچوونەوەی ناسیۆنالیسم دەکەین.

گرووپی ئیتنیکی، نەتەوە و دەوڵەت کۆمەڵێك دیاردەی پێکەوە پێوەندیدار بەڵام لێك جیاوازن کە زۆرجار لێك جیا ناکرێنەوە. گرووپی ئیتنیکی و نەتەوە زۆر جار بە هاوواتا لە قەڵەم دەدرێن و دەوڵەت و نەتەوەش زۆرتر لە جێگای یەکدی بەکار دەبرێن. ئەم بەکارهێنان و لە جێگادانانە نەك تەنیا لەگەڵ ڕاستی یەك ناگرێتەوە، بەڵکوو لە لایەنی لۆژیکیشەوە هەر ئەم ئەنجامە ناڕاستەی لـێدەکەوێتەوە کە گرووپی ئیتنیکی لەگەڵ دەوڵەت یەکسانە. لە ڕاستیدا هەموو گرووپە ئیتنیکییەکان نەتەوە نین، بەڵکوو هێندێك لەوان نەتەوەن. هەروەها هەموو گرووپە ئیتنیکییەکان یان نەتەوەکان خاوەنی دەوڵەت یان خوازیاری دەوڵەت نین، بەڵکوو هێندێك لەوان ئەم تایبەتمەندییەیان هەیە.

لە ڕاستیدا پێوەندیی نێوان گرووپی ئیتنیکی و نەتەوە هەروەك پێوەندیی نێوان نەتەوە و دەوڵەت ئاڵۆزە و لە گۆڕان دایە و لە لایەنی لۆژیکییەوە پێوەندیی گشت و تایبەت لە نێوان ئەوان دا هەیە: هێندێك لە گرووپە ئیتنیکییەکان، نەتەوەن و هێندێکیان نین؛ هێندێك لە نەتەوەکانیش گرووپی ئیتنیکین و هێندێکیان نین. بە گوتنێکی دیکە گرووپی ئیتنیکی و



نەتەوە دوو جۆرە حەشیمەتن کە هەرچەند لە ڕاستیدا و هێندێك جار لایەنی هاوبەشیان هەیە، بەڵام وەك چەمك ڕێك وەك یەك نین. بۆ وێنە وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا نەتەوەیەکە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك بە گرووپێکی ئیتنیکی ناژمێردرێ.

بە پێی ئەم جیاکردنەوەیەی نێوان گرووپی ئیتنیکی و نەتەوە، دەتوانین هێزەکان و پرۆسە دیاریکەر و خوڵقێنەرەکانی هەر کام لەوان لێك جیا بکەینەو کە لە ڕاستی دا دەبێتە جیاکردنەوەی ئیتنیسیتە لە ناسیۆنالیسم. ئەگەرچی ناسیۆنالیسم زۆرتر لە سەر بنەمای ئیتنیسیتە یان بە هۆی گرێدراوی بە گرووپێکی ئیتنیکییەوە دروست دەبێ، بەڵام جۆرێك هێزی کۆمەڵایەتیی جیاوازە. ئیتنیستیە کاتێك کە لەگەڵ ناسیۆنالیسم ئاوێتە دەبێ یان دەبێتە ناسیۆنالیسم، لە نێوەڕۆك دا دەگۆڕێ. بە واتایەك، گرووپێکی ئیتنیکی ڕەنگە ناسیۆنالیستی بێ یا نەبێ، بەڵام ئەگەر ناسیۆنالیستی بێ، لە بنچینەدا لە گرووپێکی ئیتنیکی جیادەکرێتەوە. گرووپی ئیتنیکیی ناسیۆنالستی هەم لە لایەنی کولتوورییەوە و هەم لە لایەنی ئامانجە سیاسییەکانەوە لە گرووپی ئیتنیکیی نا ناسیۆنالیستی جیاوازە (Eller, 1999: 20 -21).

لەم ڕوانگەیەوە، ناسیۆنالیستم شکڵێك لە کولتوور (ئایدیۆلۆژییەك، زمانێك، ئەفسانەکان، هێماگەرایی و وشیاری)ە کە چوار ئامانجی هەیە: گۆڕینی گرووپێکی ئیتنیکیی ناچالاك بە کۆمەڵێکی ئیتنیکیی سیاسیی چالاك؛ ڕێکخستنی کولتووری گرووپ و دانانی کولتوورێکی بەرزی ستاندارد و فەرمی؛ گۆڕینی گرووپ بە نەتەوەی خاوەن هاوچەشنیی کولتووری؛ وەدەست هێنانی نیشتمانێك یان تەنانەت دەوڵەتێك بۆ ئەو نەتەوەیە (Smith, 1991: 126).

لە لایەنی مێژووییەوە ناسیۆنالیسم زیاتر لە دوو سەد ساڵ تەمەنی هەیە و بێ گومان دەتوانین ئەو بە یەکێك لە بەتواناترین هێزەکانی دنیای مۆدێرن دانێین. لە نیوەی دووهەمی سەدەی هەژدەهەم دا ئەم هێزە سیاسییە لە ئەورووپای ڕۆژئاوا بۆ وێنە لە فەڕانسە و ئەمریکای باکووری شکڵی گرت، کەمێك دواتر گەیشتە ئەمریکای لاتین و دوای شەڕی جیهانیی دووهەم سەرانسەری جیهانی گرتەوە. شکڵی دەرکەوتنی ناسیۆنالیسمیش جۆراوجۆرە: ئایینی، پارێزگارانە، لیبراڵ، فاشیستی، کۆمۆنیستی، کولتووری، سیاسی، جیاییخوازانە و... (Hutchinson, 1994: 3).

سەرەڕای گرنگیی بەرچاوی ناسیۆنالیسم، زاڵێتیی گوتار و تیۆرە مارکسیستی، لیبراڵییەکان و تیۆری نۆێژەنکردنەوە پێشی ئەوەیان گرتبوو کە ئەم دیاردەیە بە شێوەیەکی ورد و لێبڕاوانە تاوتوێ بکرێ. بە پێی ئەم جۆرە ڕوانگە و تیۆرانە، ناسیۆنالیسم دیاردەیەك بوو کە

لە پرۆسەی گۆڕانکاری و کامڵ بوون و نوێکردنەوەی کۆمەڵگەدا وردە وردە دەتوێتەوە و ون دەبێ. بەڵام لە دەیەی شەست بەم لاوە، بڕواپێکراویی ئەم جۆرە پێش گریمانە و تیۆرانە کەوتنە ژێر پرسیار و قۆناخێکی نوێ لە موتالاّ و توێژینەوە سەبارەت بە ناسیۆنالیسم دەستی پێ کرد. لە ڕوانگەی هێندێك لە تیۆریستەکانەوە ئەو گۆڕان و گۆڕانکارییە ئاکامی شکڵ گرتنی شەپۆلێکی نوێی تایبەتگەرایی کولتووری لە چوارچێوەی بزووتنەوە ناسیۆنالیستییەکان دا بوو کە لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا توندتر و بەرینتر بوون و لە سەدەی بیست و یەکەمیش دا بەردەوام بوون.

ئانتۆنی سمیت تیۆریستی ناوداری ناسیۆنالیسم، باس لە "بوژانەوەی ناسیۆنالیسم" دەکا. بە بۆچوونی ئەو بزووتنەوە جیاییخوازانەکانی کانادا، سکاتلەند، بریتانیا، ئیسپانیا و ناوچەکانی دیکەی جیهانی ڕۆژئاوا، زۆر لە گریمانە هاوبەشەکانی پێوەندیدار بە نوێکردنەوە و دیمۆکراسی بێ متمانە دەکا. سمیت هەروەها بڕوای وایە کە دژایەتییەکان و بزووتنەوە ناسیۆنالیستییەکانی ئەورووپای ڕۆژهەلات، ناسەقامگیری و ناسیۆنالیسمی پوپۆلیستی لە ڕووسیە، ڕاپەڕینەکانی خەڵکە ڕەسەنەکان و دژایەتییە قووڵەکان لە ئەفریقای ڕۆژهەلات و باشوور، دووبارە ناسیۆنالیسمیان خستۆتە ناوەندی کاروباری جیهانەوە (Hutchinson, 1994: 10 – 11).

گیدێنز ڕابوونی ئەم دواییانەی ناسیۆنالیسم لە چوارچێوەی ناسیۆنالیسمە ناوچەییەکان دا تاوتوێ دەکا و ئەم دیاردەیە بە بەرهەمی ئەو دەرەتانانە دەزانێ کە پرۆسەی بەجیهانیبوون بۆ دووبارە بەرهەمهێنانەوەی شوناسە ناوچەییەکان پێکی دێنێ. تیۆریست گەلی دیکەش وەك ملوچی و گی برناش بوژانەوەی ناسیۆنالیسم دەسەلێنن. مانوئێل کاستێل ڕاپەڕینی نەتەوایەتی بە تایبەتمەندیی سەردەمی بەجیهانیبوون دەزانێ و باس لە جۆرەکانی ناسیۆنالیسم لە جیهانی هاوچەرخ دا دەکا:

(Melucci, 1989: 89 – 90; Giddens, 19908: 31 – 23; Castells, 1997: 27 – 31; Guibernau, 1996: 74).

لە ژمارەیەك لە بەرهەمەکانیش دا باس لە شەپۆلی سێهەم یان جۆری سێهەمی ناسیۆنالیسم دەکرێ کە دوای کۆتایی شەڕی سارد شکڵی گرتووە و ڕۆژ بە ڕۆژ بەرینتر و بەگوڕتر دەبێ. شەپۆلی سێهەمی ناسیۆنالیسم لە هەمان کات دا کە هێندێك وێکچوونی لەگەڵ قۆناخەکانی پێشووی ناسیۆنالیسم هەیە، بەڵام لەوان جیاوازە. لە کاتێك دا کە لە





ناسیۆنالیسمەکانی دیکەدا پێ لە سەر لایەنی سیاسیی نەتەوە دادەگیرا، لەوان دا ڕەگەی ئینترناسیۆنالیستی وەبەرچاو دەکەوت و مەیل گەلی لیبرالی و دژە کلۆنیالیستی بوونی هەبوو، ناسیۆنالیسمی ئێستا خاوەنی لایەنی دژە لیبراڵی و شۆڤێنیستی و پاوانخوازانەیە. بە گوتنێکی دیکە شەپۆلی سێهەمی ناسیۆنالیسم لە سەر شوناس سازی و جیاوازیی دابڕان خولقێن بونیات نراوە(Holton, 1998: 136; Schwarzmentel, 1998: 144).

هەموو ئەو نموونانەی باسیان لێوەکرا باس لەوە دەکەن کە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم شایەدی جۆرێك تایبەتگەرایی کولتووری زێدەڕوو و پەرەخواز بووە. ئەگەرچی ئەم جۆرە تایبەتگەراییانە بە شێوەی جیاواز و جۆراوجۆر دەرکەوتوون، بەڵام هەموویان بە تێکەڵاوێك لە وشیارییەکان، ئالۆزییەکان و دژایەتیی ئێتنیکی و بزووتنەوەی نەتەوایەتی دەژمێردرێن. لە تەواوی ئەم تایبەتگەراییانەدا زمان، ڕەگەز، ئێتنیسیتە، ئایین و مێژوو دەبنە تەوەر و بنەمای ڕێکخستنی تاکەکان و گرووپە جۆراوجۆرەکان کە هێندێك جار تێکهەڵچوونی زۆر توندوتیژانەیان لـێ دەکەوێتەوە.

## بونیادگەرایی ئایینی

ئەگەرچی تایبەتگەرایی ئێتنیکی لە خۆگری دەستەیەك لە نیشانەکان و ژمارەیەکی زۆر لە هێماکان و جۆراوجۆریی تایبەتگەرایی کولتوورییە، بەڵام وادێتە بەرچاو لە بونیادگەرایی ئایینیدا تایبەتگەرایی کولتووری پڕڕەنگتر و زەقترە. لە جۆرەکانی تایبەتگەرایی ئێتنیکی دا دەتوانین هەموو یان هێندێك لە تایبەتمەندییەکانی تایبەتگەرایی کولتووری بە تایبەت ناخ باوەڕی و باڵادەستیی کولتووری دەس نیشان بکەین، هەرچەند کە ئەم تایبەتمەندییانە زۆرتر شاراوە و کەم ڕەنگن، بەڵام بوونی ئەم تایبەتمەندییانە لە بونیادگەراییە ئایینییە جۆراوجۆرەکان دا بە تەواوی دیار و سەرنجڕاکێشە. لەم ڕووەوە بونیادگەرایی ئایینی زیاتر لە دژایەتییە ئێتنیکییەکان و بزووتنەوە ناسیۆنالیستییەکان تایبەتگەرایانەیە.

بێ گومان دەستەو داوێن بوونی ئایین و خوا بە شکڵ و شێوەی جۆراوجۆر بە قەت مێژووی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ تەمەنی هەیە و مرۆڤەکان بەهۆی جۆراوجۆر لەوانە ڕەنجی ژیان و ترس لە مردن، دەستەوداوێنی هێزی بان سروشتی دەبوون، بەڵام بونیادگەرایی ئایینی دیاردەیەکی نوێ و جیاوازە. ئەم دیاردەیە کە بە گرنگترین و زەقترین نیشانەی بونیادگەرایی کولتووری دەژمێردرێ و کەم تا زۆر سەرانسەری دنیای تەنیوەتەوە، ئەرکێکی جیاوازی لە سەر شانە. بە

دەربڕینێکی دیکە ئێستاکە ئایین لە چوارچێوەی بونیادگەرایانەی خۆیدا بۆتە گرنگترین سەرچاوەی شوناس سازی لە جیهان دا.

دەستهەڵبەست کردن و بەکارهێنانی وشەی "بونیادگەرا"[53] دەگەڕێتەوە بۆ دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم کە پرۆتستانەکانی ئەمریکا بە شێوەیەکی لێبڕاوانە بەرەورووی نوێبوونەوە بوونەوە. لەم بەرەورووبوونەوەیەدا پەرچەکردار و هەڵوێستی ژمارەیەك لە پرۆتستانەکان ئەمە بوو کە ئەوەی کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتوە هەمووی راستە و پێویستی بە پێداچوونەوە و تەنانەت بێدەنگە لـێکردن لەوان نیە. لە مێژووی ئەمریکادا بەم دەستەیە لە پرۆتستانەکان دەگوترێ سەرسەخت و بونیادگەرا، بەڵام ئێستاکە وشەی بونیادگەرایی بەو بزووتنەوە ئایینییە پرئەژمار و جۆراوجۆرانە دەگوترێ کە سەرانسەی جیهانیان داگرتووە (Peterson, 1999: 86).

بونیادگەرایی کولتووری لە هیچ کام لە ئایینە گەورەکانی جیهان دا کورت نابێتەوە. هێندێك لە پێڕەوانی کاتۆلیك، ئۆرتدۆکس و پرۆتستانی ئایینی مەسیح لە شوێنە دوورەکانی جیهان ئۆگریی بونیادگەرایانە لە خۆیان نیشان دەدەن، بونیادگەرایی ئیسلامی زۆر لە وڵاتانی جیهانی لە ئەمریکاوە تا رۆژهەڵاتی ئاسیا دەگرێتەوە. گرووپە بونیادگەرا جوولەکەکانی (یەهوودی) ئیسرائیل و شوێنەکانی دیکەی جیهان چالاکتر بوون. هیندۆئیسم لە هێندێك لە ناوچەکان شێوەیەکی بونیادگەرایانەتری گرتۆتە خۆی. شوێنکەوتوانی بونیادگەرایی ئایینی بودایش رۆژ بە رۆژ زیاتر و چالاکتر دەبن(Westerlund, 1996: 9 – 18).

جگە لەمانە لە دەیەکانی دواییدا گرووپ و بزووتنەوەی ئایینیی نوێ شکڵیان گرتووە کە لە زۆربەی جیهان دا بڵاوبوونەتەوە و ئامار و مەزەندەکردنی جۆراوجۆر سەبارەت بەوان هەیە. لە هێندێك لە سەرچاوەکان دا هاتوە کە نزیکەی سێ هەزار گرووپی ئایینیی بچووك و گەورە لە ئەمریکا و ئەورووپا هەن. ژمارەی گرووپە ئایینییە نوێیەکان لە ژاپۆن بە هەشت سەد تا هەزار گرووپ خەمڵێنراوە. بە پێی ئامارێکی دیکەش نزیکەی دە هەزار ئایینی نوێ بە دوازدە میلیۆن پێڕەو لە نێو خێڵەکانی ئەمریکا، ئاسیا، ئەفریقا و بیاقی ئۆقیانووسی ئارام دا هەن (Barker, 1999: 16).

بونیادگەرایی ئایینی نەك تەنیا لە ئایینێکی دیاریکراودا سنووردار نابێ و لە لایەنی جۆغرافیاییەوە زۆر بەربڵاوە، بەڵکوو لە لایەنی پێڕەو شوێن کەوتووەکانیشەوە جۆراوجۆرییەکی

53- fundamentalist



بەرچاوی هەیە. توێژینەوە جۆراوجۆرەکان نیشانی دەدەن کە لە روانگەیەکی گشتییەوە ناتوانرێ پێوەندییەکی مانادار لە نێوان تەمەن، سێکس، پێگەی چینایەتی و پێگەی کۆمەڵایەتیی پێڕەوانی بزووتنەوە بونیادگەرا ئایینیی‌یەکان دا بدۆزرێتەوە. ئەم بزووتنەوانە زۆر رەنگاو رەنگن و زۆرتر کەسانی جۆراوجۆر (پیر و لاو، هەژار و دەوڵەمەند، ژن و پیاو و رەش و سپی) دەچنە ریزی ئەوانەوە (Baker, 1999: 20).

بنواشە و تایبەتمەندییە ئایدیۆلۆژیکیەکانی بزووتنەوە بونیادگەرا ئایینیی‌یەکانیش وەك لایەنەکانی دیکە جۆراوجۆر و فرەچەشنن. هێندێك جار ئەو وێنەیەی لە دۆخەکە خراوەتە بەرچاو روونە و رێگاکانی گۆڕینی ئەو و گەیشتن بە دۆخی دڵخواز بە روونی دیاری کراوە. هەروەها لە ژمارەیەك لە بزووتنەوەکان دا لە سەر توندوتیژی و دژایەتی پێ داگیراوە و لە ژمارەیەکی دیکە دا ئەم توندییە بەرچاو ناکەوێ. لە لایەنی دیکەشەوە جیاوازیی بەرچاو لە نێوان بونیادگەراییە ئایینیی‌یەکان دا هەیە.

دیارە سەرەڕای ئەم جۆرە جیاوازی و جۆراوجۆرییانە دەتوانین هێندێك توخم کەم تا زۆر لە هەموو بزووتنەوە بونیادگەرا ئایینیی‌یەکان دا بدۆزینەوە. بە گشتی دەتوانین بڵێین کە بونیادگەرایی جۆرێك پەرچەکرداری کۆمەڵایەتیی ئایینی بەرانبەر ترسێکی خەیاڵیی داسەپاو لە لایەن پرۆسەی جیهانییەوەیە. بونیادگەراکان لەم بڕوایە دان کە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان دەبنە هۆی وەمەترسی کەوتنی شێوەی ژیان، بایەخەکان و بڕوا ئایینییە دڵخوازەکان و دەبێ سەرسەختانە بەربەرەکانییان لەگەڵ بکرێ. بۆ وێنە بونیادگەراکانی ئەمریکا قسە لەوە دەکەن کە هەڵسوکەوتی نەرم و ئاوێتە بە لێبوردن لەگەڵ هاورەگەزبازی (هۆمۆسێکسیوالیتە) لە کۆمەڵگەی هاوچەرخ دا لەگەڵ بنواشە ئاکارییەکانی کتێبی پیرۆز ناتەبایی هەیە، بنەماڵە لە نێو دەبا و نیشانەیەکی پووکانەوە ئاکارییە (Peterson, 1999: 87).

بونیادگەراکان دۆخی باو بە نادڵخواز دەزانن و وێنەیەکی ناپەسند لەو دەخەنە بەرچاو. ئەوان رەخنە لە پێکهاتەی کولتووریی زاڵ بە سەر جیهان دا دەگرن و کولتووری جیهانی دەدەنە بەر پەلامار. تایبەتمەندیی ئەم کولتوورە جیهانییە بنواشە و بایەخەکانی نوێبوونەوەن و هەر بەم هۆیە دژایەتی کردنی نوێبوونەوە بۆتە پێ ئەسپێردراوی سەرەکیی بونیادگەراکان. لە سەر ئەم بنەمایە و لەوەڕا کە نوێبوونەوە دیاردەیەکی جیهانییە بونیادگەراییش جیهانی دەبێ (Lechner, 2000: 338).

پێ ئەسپێردراوی گەورەی بونیادگەراکان لە خەبات لەگەڵ کولتووری جیهانی و نوێبوونەوە دا پێویستی بە سەرسەختی و لە سازان نەهاتوویی هەیە. زۆر لە بونیادگەراکان هەر چەشنە سازانێك بە دەست بەردانەوە لە بەرانبەر دوژمن دا دەزانێ. دوژمنانی ئەوان زۆرتر وەك دوژمنانی خوا یان رەنگە دوژمنانی حەقیقەت و ئاکار نیشان دەدرێن کە سازان لەگەڵ ئەوان بە هیچ شێوەیەك رێگای پێ نادرێ. هەر بەم هۆیە بونیادگەراکان بایەخێکی ئەوتۆ بۆ مافەکانی مرۆڤ، وتووێژ، پلۆرالیسم، ئازادیی را دەربڕین، هەڵکردن و توخمە تایبەتمەندی بەخشەکانی دیمۆکراسیی مۆدێڕن دانانێن. بۆ وێنە بونیادگەرا سەهیۆنیستەکان و گرووپی تالیبان بە راشکاوی ئەم پرنسیپانە رەت دەکەنەوە (Peterson, 1999: 88 – 89).

بونیادگەراکان هەر لەو کاتەدا کە دۆخی باو بە نادڵخواز دەزانن و رەتی دەکەنەوە، نموونەیەکیش لە کۆمەڵگەی خوازراوی خۆیان دەخەنە بەرچاو. ئەم نموونەیە زۆرتر لە خۆگری نوێژەن کردنەوەی رابردوویەکی خەیاڵیی زێڕینی بونیات نراو لە سەر بایەخە بنەماییەکانی نەریت و ئایینە. بەڵام ئەوان بۆ خستنە بەرچاوی گێڕانەوەیەکی پیرۆز لە رابردوو زۆرتر پەنا دەبەنە بەر دەستەبژێر کردن: وزەی ئەوان بۆ هەڵبژاردنی ئەو تایبەتمەندییانە تەرخان دەکرێ کە شوناسی ئەوان بە باشترین شێوە بەهێز بکا، بزووتنەوەکەیان رێك بخا، لە سنوورەکانی ئەوان بەرگری بکا و بیانە(نەیار) دوور راگرێ (Marty, 1991: 1X – X).

هەموو یان بەشێك لەو شتانەی وەك تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی بونیادگەرایی ئایینی باسمان لـێ‌کردن، لە بزووتنەوە بونیادگەرا جۆراوجۆرەکانی جیهان دا وەبەرچاو دەکەون، هەرچەند کە رەنگە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە و لە ئایینێکەوە بۆ ئایینێکی دیکە پڕڕەنگتر یان کەمرەنگتر بن. دیارە تایبەتمەندیی دیکەش دەتوانین دەس نیشان بکەین کە پێویستی بە باسێکی تێروتەسەل هەیە و لە باسی جۆرەکانی بونیادگەرایی ئایینی (مەسیحی، ئیسلامی، جوولەکە، بوودایی و هیندوو)دا ئاماژەیان پێ دەکرێ.

## بونیادگەرایی مەسیحی

هەروەك پێشتر باس کرا چەمکی بونیادگەرایی ریشەکەی دەگەڕێتەوە، بۆ گۆڕانکارییەکان و رووداوەکانی یەکەمین دەیەکانی سەدەی بیستەمی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. لەو ساڵانەدا ژمارەیەك لە پرۆتستانەکانی ئەمریکا بڕوایان وابوو کە لە بەرانبەر فشار و پەرەگرتنی نوێبوونەوەدا بە هیچ شێوەیەك نابێ لە رێ و شوێنەکانی کتێبی پیرۆز دەست هەڵ گیرێ،



چونکە هەر شتێکی لەو کتێبەدا هاتوە حەقیقەتی هەیە. ئەوان هەروەها لە ساڵی ١٩١٠ تا ١٩١٥ ژمارەیەك بەرهەمیان بە ناوی "The fundamentals" بە شێوەیەکی تایبەتی بڵاوکردەوە کە وشەی بونیادگەرا لەو ناوەوە وەرگیراوە (Castells, 1997: 21).

ئەگەرچی بونیادگەرا سەرەتاییەکان لە کۆمەڵگەی ئەمریکادا توانەوە، بەڵام مەیلە بونیادگەرایانەکان بە هیچ شێوەیەك لەو کۆمەڵگەیەدا لە نێو نەچوون و کەم تا زۆر بە شێوەگەلی جۆراوجۆر درێژەیان کێشا. لە دەیەی حەفتا و دەیەی هەشتادا بونیادگەرایی بەربڵاوتر و توندتر بوو و کەسان و گرووپ گەلێکی زۆرتر چوونە ریزی بزووتنەوە و رێکخراوە بونیادگەراکانەوە. لوتکەی پەرەگرتنی بونیادگەرایی دروست بوونی رێکخراوێکی زۆر توندرۆ و زێدەخواز بوو بە ناوی "Jerry Falwells’ Moral Majority" کە لە مێژووی بونیادگەرایی ئەمریکا دا بە خاڵێکی وەرچەرخان دەژمێردرێ.

لە دوایین مانگەکانی دەیەی هەشتادا ئەم رێکخراوە لێك بڵاوبوو. سەرەتا وا دەهاتە بەرچاو کە لێك بڵاوبوونی ئەم رێکخراوە، سەرەتای قەیران و لەرزۆك بوونی بونیادگەرایی لە کۆمەڵگەی ئەمریکا دا دەبێ. بەڵام گۆڕانکاری و رووداوەکانی دواتر دەریان خست کە ئەو رووداوە تەنیا نیشانەی قەیران لە رێکخراوێك و رێکخستنێك دا بوو نەك قەیران و پووکانەوەی بونیادگەرایی ئایینی. لە دەیەی نەوەددا بونیادگەرایی ئایینی پێشوازییەکی زۆرتری لـێ‌کراو مەیلی بونیادگەرایانە لە نێو توێژە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکادا زیادی کرد. نیشانەی زەقی ئەم جۆرە مەیلە ئایینی — کۆمەڵایەتییە هاتنە مەیدانی یەکیەتیی مەسیحییەکانە کە کەسان و گرووپە بونیادگەرا جۆراوجۆرەکان دەگرێتەوە و بە توندی لە پرسە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکادا بەشدارە (Haynes, 1999: 224).

تاك تەوەری بیرکردنەوەی بونیادگەرایانەی مەسیحی لە ئەمریکایە. بە پێی ئەم ئایدیۆلۆژییە بونیادگەرایانەیە، جیهانی هاوچەرخ مرۆڤ گەلی گەندەڵ، لارێ و بێ سەرەوبەرەی پەروەردە کردوە. کەواتە لە دایکبوونەوەیەکی دیکە پێویستە تا لە رێگەی ئەوەوە تەواوی کەسایەتیی مرۆیی دروست بکرێتەوە. بونیادگەرایی مەسیحی کەڵکەڵەی بارهێنانی مرۆڤ گەلێکی لە سەر دایە کە لە چوارچێوەی نەریتی ئایینی دا پێبەندی زنجیرەیەك لە پلە کۆمەڵایەتییەکان بن، لە سەر پاکژیی کولتووری و کۆمەڵایەتی سوور بن و لە رەچاو کردنی رێوشوێنە ئاکارییەکان دا زۆر سوور و سەختگیر بن.

نوێژەن کردنەوەی کەسایەتیی مرۆڤ بنەما و خاڵی وەرێ کەوتنە بۆ دروست کردنەوەی چەمکێکی نوێ لە سەربەخۆیی، شوناس، تەکووزیی کۆمەڵایەتی و ئایدیالی سیاسی. پێداگرتنی بونیادگەراکان لە سەر ئەم ڕێوشوێنانە نیشان دەدا کە کۆمەڵگەی ئایدیالیی ئەوان کۆمەڵگەیەکە کە لەودا پێوەندی و ئاوێتە بوون لەگەڵ کۆمەڵگەکانی دیکە دەبێ ئەوەندی دەکرێ کەم بکرێتەوە، دەستڕاگەیشتن بە شوناسێکی ڕەسەن و پاکژ بکەوێتە ڕۆژەڤەوە، تەکووزیی کۆمەڵایەتیی زنجیرە پلەیی نەریت تەوەر بە وردی لە کۆمەڵگەی ئەمریکادا زاڵ بێ و پەرەدان بە ئاکاری ئایین تەوەر ببێتە کەڵکەڵەی سەرەکیی دەسەڵاتداران و بەڕێوەبەرانی کۆمەڵگە.

پێوەندیی نێوان تاك و کۆمەڵگە لە ڕێگای بونیادنانەوەی دامەزراوەی بنەماڵەوە ڕێك بخرێ. بە پێی بونیادگەرایی مەسیحیی ئەمریکایی، بنەماڵەش بۆتە قوربانیی کولتووری جیهانی کە هەر جۆرە ئۆتۆریتە و پیاوسەرداریيەك لە نێو دەبا. ئایدیۆلۆژیی بونیادگەرایانە چارەسەری ئەم دەردە لە بوژاندنەوەی پیاوسەرداری، پەروەردەی نەریتی و مەزهەبیی منداڵان و گەڕاندنەوەی ژنان بۆ پێگەی نەریتیی خۆیان دا دەبینی. لە بنەماڵەی دڵخوازی بونیادگەراکان دا، ژنان بە بەڕێوەبردنی ئەرکی سروشتی دایکایەتی و تەنانەت قوربانی بوون، شوناسی ژنانەی خۆیان دەردەخەن و پیاو کامڵ دەکەن. بە شکڵ گرتنی بنەماڵەگەلی لەو چەشنە ئابووری و کولتوورێکی باشیش شکڵ دەگرێ (Castells, 1997: 24).

بونیادگەراکان دیاریکردنی ڕێکەوتی ڕاپەڕین و بەربەرەکانیشیان لە بیر نەکردوە. بە بۆچوونی ئەوان کۆمەڵگەی ئایدیالیی دڵخواز هەرگیز شکڵ ناگرێ، مەگەر بە دنیا ئاخربوون (آخرالزمان) و دەرکەوتنی دووبارەی عیسا مەسیح. بەم پێیە بەردەوام لایەنگرانیان بۆ بەربەرەکانییەکی دژوار لەگەڵ دوژمنان هان دەدەن تا لەم ڕێگەیەوە بوار بۆ دەرکەوتنی "مهدی معود" خۆش بێ. لە ئایدیۆلۆژیی بونیادگەرایی دا ملۆزم و مەترسیدارترین دوژمنەکان بریتین لە فیمینیستەکان، هێمۆسێکسیواڵەکان، جوولەکەکان و ئیسرائیل (Castells, 1997: 24).

گرووپە توندڕۆیە ڕاستگەراکانی ئەمریکا زەقترین نیشانەکانی ئەم جۆرە بونیادگەراییەن. ئەم گرووپە مەسیحییانە پشتیان بەو ڕێوشوێنانەی مەسیحایەتییەوە بەستوە کە کەم تا زۆر لە هەموو بزووتنەوە بونیادگەراکان دا بە شێوەگەلی جۆراوجۆر هەیە. ئەم دەستەیە لە ڕاستگەراکان پێیان وایە کۆمەڵگەی مرۆیی تووشی داڕووخان بووە و پێویستی بە گۆڕانکارییەکی ڕزگاریدەرانەیە. هەروەها لە ئایدیۆلۆژیی ئەم گرووپانە دا، نەتەوەی ئەمریکا



وەك نەتەوەیەکی هەڵبژێردراو لە قەڵەم دەدرێ کە پێ ئەسپێردراوێتی گرنگی لە سەر شانە (Aho, 1996: 192 – 3).

ڕاستگەرا مەسیحییەکان پێیان وایە کە ئەنگلۆساکسۆنەکان ئیسرائیلییە ڕەسەنەکانن. ئەوان لە ڕاستی دا بە ڕۆڵەکانی ئیسحاق دەژمێردرێن و تەورات کتێبێکی مێژوویی ئەوانە نەك جوولەکان. دوای دوورخرانەوەی ئیسحاق بۆ شوێنێك لە باکووری ئێران، نزیکەی حەوت هەزار ساڵ لەوە پێش، ئیسرائیلییەکان لە بەرزاییەکانی قەفقاز تێپەڕین و لە وڵاتە جۆراوجۆرەکانی ئەورووپا دا بڵاوبوونەوە. کەواتە ئیسرائیلی سەرەکی و نوێ ئەمریکایە و دەبێ پاکژیی ڕەگەزی، کە ئێستاکە لە نێو چووە، بۆ نەتەوەی ئەمریکا بگەڕێتەوە (Aho, 1996: 194).

ئەندامە توندڕۆیەکانی گرووپە ڕاستگەراکان ئەو بنواشانەی (اصول) یاسای بنەڕەتی ئەم وڵاتەیان کە پێوەندیی بە هەڵوەشاندنەوەی کۆیلەتییەوە هەیە ڕەت دەکەنەوە و ئیدیعای ئەوە دەکەن کە ئەم یاسا بنەڕەتییە لە لایەن سپی پێستەکانەوە و تەنیا بۆ خۆیان نووسراوە. دانیشتووە ناقەفقازییە ڕەسەنەکانی ئەمریکا میوانن و مافێکیان نیە و، تەنیا لە بەر کەرەمی خانەخوێ ئەنگلۆساکسۆنەکانی خۆیان لەو نیشتمانە دا ماونەتەوە. تەنانەت هێندێك لەو کەسانە بڕوایان وایە کە سەردەمی ئەو میوانگرییە کۆتایی پێ هاتوە و دەبێ سەرەتا دەست بە سەر داراییەکانیان دابگیرێ و دواتر لە ئەمریکا دەرکرێن (Aho, 1996: 194).

مەیلە بونیادگەراکانی ئەمریکای باکوور، کۆمەڵگەکانی ئەمریکای لاتینیشی خستۆتە ژێر کاریگەرییەوە. ئێستاکە لە بەرانبەر شەپۆلی مەزنی بزووتنەوەی ئیلاهیاتی ڕزگاریدەر دا کە زۆربەی کۆمەڵگەکانی ناوچەی گرتۆتەوە، بزووتنەوەگەلی بونیادگەرایانەی نوێ دروست بوون. کە بەستێنی زۆربەی ئەم بزووتنەوانە ناوچە پرۆتستان نیشینەکانە. بۆ وێنە لە سەرەتاکانی دەیەی شەستەوە تا دەیەی نەوەد ڕێژەی[حەشیمەتی] پرۆتستانەکان بە کۆی حەشیمەتی گواتمالا لە دوو لە سەدەوە گەیشتۆتە نزیکەی ٣٠ لە سەد (Hallencreutz, 1996: 11).

یەکێك لە وێنە هەرە زەقەکانی مەیلە بونیادگەرایانەکان لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا پەرچەکردار و هەڵوێستە جۆراوجۆرە ئایینیەکانە سەبارەت بە بابەتی ئەورووپای یەکگرتوو. ئەگەرچی هەڵسەنگاندنی دەوری مەسیحایەتیی کاتۆلیك و پرۆتستان لەم بوارەدا سانا نیە، بەڵام وا دێتە بەرچاو کە لە دژایەتی کردنی خەڵکی ئەورووپای باکوور دا لەگەڵ یەکیەتیی ئەورووپایی دا توخمێکی ئایینی بوونی هەبووە. ژمارەیەك لە تاك و گرووپەکانی ئەم ناوچەیە بە سەرنجدان بە بەهێزبوونی وڵاتانی کاتۆلیك لە کۆمەڵگەی ئەورووپا دا و بەهێزبوونی حیزبە

دیمۆکرات مەسیحییەکانی ژێر کۆنترۆڵی کاتۆلیکەکان، بەرینبوونەوەی پانتایی کۆمەڵگەی ئەورووپا و یەکیەتیی ئەورووپایی بە جۆرێك وەمەترسی خستنی کاتۆلیك لە قەڵەم دەدەن. کەسانێکیش هەن کە هەر چەشنە یەکگرتنێکی سیاسی لە ئەورووپا بە مەترسییەك لە دژی کلیسا نەتەوەییەکان دەزانن (Hallencreutz, 1996: 12).

وێنەیەکی دیکە، بزووتنەوەی بوژاندنەوەخوازانە لە ئینگلستانە. ئەم بزووتنەوەیە بە بەشێك لە بزووتنەوەیەکی بەرینتر بە ناوی کلیسای ماڵی(خانگی) دەژمێردرێ کە بە کلیسا ماڵییەکانی نێو گرووپەکان دەگوترێ. ژمارەیەك لەو کلیسایانە بە تەواوی سەربەخۆن و ژمارەیەکیشیان لە چوارچێوەی بزووتنەوە جیاییخوازە بچووکەکان دا شکڵیان گرتوە. توندرۆترین، رێکخراوترین و گەورەترین کلیسای ماڵیی سەربەو بزووتنەوەیە دوو گرووپن کە لە سەرەتاکانی دەیەی حەفتا دا دروست بوون و نزیکەی سی تا چل هەزار کەس ئەندامیان هەبوو (Walker, 1997: 199).

لە رۆژهەڵاتی ئەورووپا، بزووتنەوە بونیادگەرا ئایینییەکان بەرینتر و بەهێزترن. دوای لێك هەڵوەشانی سۆڤیەت، مەسیحایەتیی ئۆرتدۆکس وێڕای ناسیۆنالیستی نوێی رووسی بۆتە گرنگترین جێگرەوەی لیبراڵ دیمۆکراسی. بە تێپەڕینی کات توخمە جۆراوجۆرە ئایینییەکان لەم جۆرە نەتەوەگەراییە دا پڕەنگتر دەبێ و ئۆگری بە نەریتە کۆنەکان زیاد دەکا. بە دەربڕینێکی دیکە لە ساڵەکانی دوای لە بەریەك هەڵوەشان کە جۆرێك قەیرانی شوناسی بۆ کۆمەڵگەی رووسی دروست کرد، مەسیحایەتیی ئۆرتدۆکس بۆتە گرنگترین هۆکاری شوناسبەخش (Parland,1996: 125).

تایبەتگەرایی بەرین و پڕ هەڵپەی ئایینی لەم وڵاتە دا تەنانەت گرووپ و رێکخراوە نائایینیەکانیشی خستۆیە ژێر کاریگەرییەوە و ناچاری کردوون هەڵوێست بگۆڕن. لە سەرەتاکانی دەیەی نەوەد دا زۆر لەو بولشویکە نەتەوەگەرایانەی رەخنەیان لە سۆسیالیسمی سۆڤیەت گرتوە، بەرەو مەسیحایەتیی ئۆرتدۆکس رۆیشتوون. بەر لە ئاگۆستی ١٩٩١، بۆلشویسمی نەتەوەیی ئۆرتدۆکس لە راستی دا هەوڵێك بوو بۆ ئاوێتەکردنی مارکسیسم–لینینسم لەگەڵ مەسیحایەتیی ئۆرتدۆکس. لە ساڵەکانی سەرەتای دەیەی نەوەدیش دا هاوکاریی نێوان نەتەوەگەرا توندڕۆیەکان و کۆمۆنیستە پارێزگارەکان لە چوارچێوەی مەسیحایەتیی ئۆرتدۆکس دا رووی دا (Parland, 126 – 27).



لە وڵاتانی دیکەی ئەورووپای رۆژهەڵاتیش دا تایبەتگەرایی هەیە. ژمارەیەکی رۆژ لە رۆژ زیادتر لە سێربەکان، بولغارەکان، رۆمانییەکان و یۆنانییەکان زیاتر لە پێشوو روو لە مەسیحایەتیی ئۆرتدۆکس وەك هۆکارێکی شوناسبەخش دەکەن و هەر بەو رادەیە بێزاری لە رۆژئاوا و کلیسای کاتۆلیك زیاد دەکا. لە هێندێك بەشی ئەم ناوچەیە نەریتی ئایینی لەگەڵ نەتەوەگەراییەکی نوێ ئاوێتە بووە تا لە بەرانبەر مەیلە کۆمۆنیستییەکانی پاشماوەی سەردەمی حکوومەتی سۆسیالیستی بەرنگاری بکا. لایەنگریی رووسیە لە سێربەکان لە شەڕی نێوخۆیی یۆگسلاوی دا وێنەیەك لە گەشەی هەستی تایبەگەرایانەی ئیتنیکی و ئایینی لەم ناوچەیە دایە (Hallencreutz, 1996: 11 – 12).

بونیادگەرایی مەسیحی لە ئەفریقا لە ژێر کارتێکردنی راستەوخۆی بونیادگەرایی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دایە. مەسیحییە بونیادگەراکانی ئەمریکا زۆر وەفدی مەزهەبی دەنێرن بۆ وڵاتانی ئەفریقایی، زۆر کلیسا دروست دەکەن و پارەی زۆر بۆ بانگەشەی ئایینی لەم وشکاییە تەرخان دەکەن. کەواتە دەتوانین بڵێین کە ئێستاکە پەرەگرتنی بەرچاوی بونیادگەرایی مەسیحی لە ناوچەکانی ئەفریقادا دەگەڕێتەوە بۆ بونیادگەرایی ئایینی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا. دیارە بە هۆی پرسە تایبەتەکانی کۆمەڵگە ئەفریقاییەکانەوە، بونیادگەرایانی ئەفریقایی بە کەڵك وەرگرتن لە بابەتە جۆراوجۆرەکان خەڵك رێك دەخەن (Gifford, 1996: 198 – 99).

پەرەگرتنی بونیادگەرایی مەسیحی لە هێندێك لە وڵاتانی ئەفریقاییدا، وەك تۆگۆ، سیرالیۆن، کۆماری ئەفریقای ناوەندی، لیبریا و کنیا، دەسەڵاتدارە سەرەرۆیەکانی ئەو وڵاتانەی هان داوە تا بە کەڵك وەرگرتن لە هەست و مەیلی ئایینیی خەڵك، رەوایی وەدەست بێنن و لە دەسەڵات دا بمێننەوە. هەروەها بە پێی هێندێك نیشانە، گرووپە کاریزماتیکەکان لە نیجریە بە شێوەیەکی زێدەروو ئۆگرییە سیاسییەکانیان نیشان دەدەن و لە کاندیدا مەسیحییەکان پشتیوانی دەکەن. لە ژمارەیەکی دیکە لە وڵاتانی ئەم وشکاییەش دا دەتوانین نیشانەکانی بونیادگەرایی ئایینی بدۆزینەوە (Gifford, 1996: 200 – 203).

ئەگەرچی زۆربەی دانیشتووانی وشکایی بەرینی ئاسیا لە نامەسیحییەکان پێك دێ، بەڵام لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی ئەم وشکاییە دا بزووتنەوەی بونیادگەرایانەی مەسیحی هەن کە زۆربەیان لە ساڵانی دوایی دا پێك هاتوون. لە لایەنی بڵاوبوونەوەی جوغرافیاییەوە، یەکێك لە ناوەندەکانی بونیادگەرایی مەسیحی لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا و وڵاتانی ئەم

ناوچەیە دایە. لەم ناوچە و وڵاتانەدا، فرەیی ئایینی و ئێتنیکی بواری بۆ تایبەتگەراییە ئایینیی‌یە جۆراوجۆرەکان رەخساندوە کە زۆربەیان ئاوێتەی ناکۆکییە ئێتنیکی‌یەکان دەبن و هێندێك جار دژایەتی و ئاڵۆزیی بەرینیان لـێ‌دەکەوێتەوە.

بە پێچەوانەی رای زۆر لە کارناسانی کاروباری هیند کە پێش بینی‌یان دەکرد لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا، ئایین بچێتە بیاڤی کەسێنییەوە، گۆڕانکارییەکان و رووداوەکان نیشانیان داوە کە ئایین وەك هۆکاری شوناسبەخش هێشتا بە توانایە و بە تواناتر دەبێ. لەم ساڵانەی دوایی دا مەسیحییەکانی ئەم وڵاتە وەك کەمایەتییە ئایینی‌یەکانی دیکە خوازیاری نیشتمان و دەوڵەتی سەربەخۆن. ئەم تایبەتگەراییە ئایینی‌یە لە چوارچێوەی ئۆگریی زێدەروو بە شێوە کارێزماتیکەکانی مەسیحیایەتی لە باشووری هینددا دەردەکەوێ و لە لایەن رێکخراو و بزووتنەوە ئایینی‌یەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە پشتگیرییان لـێ‌دەکرێ و بەهێز دەکرێن (Caplan, 1987: 171 – 2).

وێنەیەکی دیکەی بونیادگەرایی دەتوانین لە فیلیپین بدۆزینەوە. ئەگەرچی لە سەرەتاکانی نیوەی دووهەمی دەیەی هەشتادا ژمارەیەکی زۆر لە بانگەشەکارە پرۆتستانەکان روویان کردە ئەم وڵاتە، بەڵام دەبێ نیوەی دووهەمی دەیەی هەشتا بە سەرەتای قۆناخێکی بونیادگەرایی لە فیلیپین دانێین. دوای لە سەر کار لابرانی فردیناند مارکوس لە ١٩٨٦دا شەپۆلێك لە بزووتنەوەی نوێ بونیادگەرایانەی توندرۆیانە کۆمەڵگەی فیلیپینیان داگرت و دوای بە دەسەڵات گەیشتنی ئاکینۆش پەرەگرتنی بونیادگەرایی کاتۆلیك و پرۆتستان لەم وڵاتەدا بەردەوام بوو.

ئامارەکانی پێوەندیدار بە گرووپە توندرۆ مەسیحییە ناکاتۆلیکەکان، پەرەگرتنی بونیادگەرایی مەسیحی لە فیلیپین بە باشی دەردەخەن. بەر لە ساڵی ١٩٨٠، ١١١ گرووپی مەزهەبی لە مانیل، ١١٧ گرووپ لە دەرەوەی مانیل و ٢٢٨ گرووپ لە تەواوی وڵات دا هەبوو، لە کاتێك دا کە ئەم ئەژمارانە دوای ساڵی ١٩٨٠ بە ریز گەیشتنە ٨٣٦، ٦١٢، ١٤٤٨. هەروەها ژمارەی بەشداربووەکان لە کلیسا پرۆتستانەکان دا لە ماوەی بیست ساڵ دا (لە ١٩٧٠ تا ١٩٩٠) زۆر زیادی کرد: پێنج هەزار کەس لە ١٩٧٠، ٩٤٠٠ کەس لە ١٩٨٠ دا، و ٢٣٠٠٠ کەس لە ١٩٩٠دا (Rose, 1996: 327 – 28).



## بونیادگەرایی ئیسلامی

ئەگەرچی بونیادگەرایی ئایینی یەکەم جار لە کۆمەڵگەیەکی مەسیحی دا سەری هەڵ دا، بەڵام توندی و فرەیی و پەرەگرتنی ئەو لە جیهانی ئیسلام دا زۆر زیاتر لە کۆمەڵگە مەسیحییەکان بووە و لە ماوەی دوو دەیەی دوایی‌دا شۆڕشێکی کولتووری — ئایینی نزیکەی هەموو کۆمەڵگە ئیسلامییەکانی داگرتوە. کەمایەتییە موسوڵمانەکانی وڵاتانی ناموسوڵمانیش روویان کردۆتە بزووتنەوە و گرووپە بونیادگەراکان. ئێستاکە هەم لە کۆمەڵگە گەشەکردوە رۆژئاواییەکان دا و هەم لە جیهانی سێهەم دا و هەم لە وڵاتانی تازە بە سەربەخۆیی گەیشتوو دا دەتوانین پەرەگرتنی بونیادگەرایی ببینین کە هێندێك جار شەڕ و تێکهەڵچوونی خوێناوییان لـێ‌دەکەوێتەوە.

لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکان دا دۆخی بونیادگەراکان جیاوازە. هێندێك جار هەرچەند بونیادگەراکان بە هێزی سیاسیی بەرچاو دەژمێردرێن و پێوەندییەکی پڕ لە ئاڵۆزییان لەگەڵ دەوڵەت هەیە، بەڵام تا رادەیەکی زۆر کۆنترۆڵ کراون، میسر و تورکیە وێنەی بەرچاون لەم بارەیەوە. جگە لەوانە بونیادگەراکان دەکرێ بگوترێ توانیویانە جڵەوی دەسەڵات بە دەستەوە بگرن یان لەودا پشکدارن. بۆ وێنە تالیبان بە گرووپێکی بونیادگەرای توندرۆ دەژمێردرێ کە ئێستاکە [لە کاتی نووسینی ئەم کتێبە دا– وەرگێڕ] بەشێکی زۆری ئەفغانستانیان کۆنترۆڵ کردوە، خەریکی بەڕێوەبردنی شەرعی ئیسلامن.

بە پێچەوانەی تالیبان، ژمارەیەك لە حیزب و گرووپە بونیادگەراکان هەرچەند بەهێزن و لایەنگریان زۆرە، بەڵام لە وەدەست هێنانی دەسەڵاتی سیاسی‌دا سەرکەوتوو نەبوون. سەرەڕای ئەوەی کە بونیادگەراکانی ئەلجەزایر لە هەڵبژاردنێکی تارادەیەك دیموکراتیك دا دەنگی بەرچاویان هێنایەوە، بەڵام دەوڵەتی ناوەندی بە پێچەوانەی یاسای یاریی سیاسی، ئەوانی لە دەستڕاگەیشتن بە دەسەڵاتی سیاسی بێ بەش کرد و هەربۆیە شەپۆلێك لە شەڕ و ئاڵۆزی کۆمەڵگەی ئەلجەزایری گرتەوە.

وێنەی واش هەیە کە دامەزراوە دەوڵەتییەکان، بزووتنەوە و گرووپە بونیادگەراکانیان بە فەرمی ناسیوە و هێندێك سەرەتی (امتیاز)یان داونەتێ. بۆ وێنە لە سوودان و بەنگلادش بونیادگەراکان دەکرێ بگوترێ بە شێوەیەکی رێژەیی ددانیان پێدانراوە و تارادەیەك فەرمین. هەروەها دەبێ باس لەو وێنانەش بکرێ کە بونیادگەراکان جۆرێك پێکەوەژیانی ناجێگیریان لەگەڵ دەوڵەت دا هەیە. دەوڵەتەکانی عەرەبستانی سعوودی، مەراکیش و ئەندۆنزیش کە تا

ڕادەیەکی زۆر لە سیستمی جیهانیدا ئاوێتە بوون، سیاسەتێکی کەم تا زۆر لە سەرەخۆیانە و ئاوێتە لەگەڵ لێبوردنیان لە بەرانبەر بونیادگەراکان دا گرتۆتە بەر (Castells, 1994: 14).

زیاتر لەمانە، بونیادگەرا ئیسلامییەکان لە لایەنی لێکدانەوەی شەریعەت، پێگەی فیقھ و فەقیھ و خوێندنەوەی زاڵ و باڵادەست لەگەڵ یەکتر دا جیاوازن. لە کۆمەڵگەیەکی وەك عەرەبستانی سعوودی دا بونیادگەراکان نێوەرۆکێکی لەسەرخۆ و تا ڕادەیەك پارێزگارانەیان هەیە، بەڵام بونیادگەرایی لە میسر و بونیادگەرایی شیعە زۆر ڕادیکاڵترن. دیارە سەرەڕای ئەم جیاوازییانە، وێکچوونی بەرچاویش لە نێوان بزووتنەوە بونیادگەرا ئیسلامییەکان دا هەیە کە پێداگرتن لە سەر بونیادنانەوەی مێژووی ئیسلام لە ڕیزی ئەوان دایە.

هەم لە هزری پێشڕەوانی بوژاندنەوەی بیرکردنەوەی ئایینی دا وەك حەسەن ئەلبەنا و سەید قوتبی میسری، عەلی ئەلنەداویی هیندی و مودودیی پاکستانی دا کە بزووتنەوە بونیاگەرایانە ئایینییە هاوچەرخەکانیان خستۆتە ژێر کارتێکردنی خۆیانەوە و هەم لە ئایدیۆلۆژییە بونیادگەرایانەکانی ئێستادا، پێویستیی بونیادنانەوە و نووسینەوەی مێژووی ئیسلام پێی لە سەر داگیراوە. ئەم بونیادنانەوەیە لەم ڕووەوە بۆ بونیادگەراکان گرنگیی هەیە کە دەتوانرێ بە هۆی ئەوەوە وێنەیەك لە ڕابردووی زێڕینی ئوممەتی ئیسلامی بخرێتە بەرچاو و هەم هۆکارەکانی پووکانەوەی ئیسلام دەس نیشان بکرێ. نموونەیەك کە بونیادگەراکان وەك کۆمەڵگەی ئایایدیالیی خۆیان دروستی دەکەن، لەم مێژووە دووبارە دروستکراوەیەی ئیسلام بە تایبەت لە ساڵەکانی حکوومەتی پێغەمبەری ئیسلام وەرگیراوە.

خستنەڕووی وێنەیەکی تاڕادەیەك چەوت و ناشایست لە جیهانی هاوچەرخ (بۆ وێنە جیهانی ئیسلام) تایبەتمەندییەکی دیکەی هاوبەشی بونیادگەرا ئیسلامییەکان پێك دێنێ. بە پێی ئەو وێنە تاڕادەیەك وێکچووانەی بونیادگەرا ئیسلامییەکان لە دۆخی ئێستا دەی خەنە بەرچاو، سەرانسەری جیهانی نائیسلامی چەپەڵی، بێ سەرەوبەرەیی، بێ ئاکاری و هەڵکردنی زێدەڕۆیانە دای گرتوە. لە ڕوانگەی ئەوانەوە ئەم ماڵی کفرە ( دارالکفر) لە ژێر هێژمونیی کولتووری جیهانی دایە کە نەریتەکان لاواز دەکا، بڕەو بەو بایەخانە دەدا کە نائایینی و نائاکارین و پەرە بە گەندەڵی، توندوتیژی، سەرەڕۆیی، چێژخوازی و تاکگەرایی دەدا.

بە بڕوای بونیادگەراکان، ئەم کولتوورە جیهانییە کفراوییە نەك تەنیا سەرزەوییە نائیسلامییەکان، بەڵکوو دنیای ئیسلامیشی پیس کردوە. هێرشی کولتووری و نەبوونی دوور بینی و خۆدۆڕاندنی دەسەڵاتدارانی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان، دووبەرەکیی زێدەڕووی نێوان



موسوڵمانان وەمەیل و ئۆگریی توێژ و گرووپە جۆراوجۆرەکان بۆ لای کولتوور و شارستانیەتیی بێگانە، جیهانی ئیسلامی بە چەشنێك دارماندوە کە لە کۆمەڵگەی نەزانیی (جاھلی) بەر لە ئیسلام دەچێ و جیاکردنەوەی موسوڵمان و ناموسوڵمان دژوارە. کەواتە لە ڕاستیدا نەك ناموسوڵمانەکان یان موسوڵمانەکان، بەڵکوو تەواوی مرۆڤایەتی لە لارێیی و نەزانی دایە.

بە پێی ئایدیۆلۆژیی بونیادگەرایانەی ئیسلامی، ڕێگای ڕزگاری تەنیا دەبێ لە کولتوور و مێژووی ئیسلام دا بدۆزرێتەوە. یەکەمین هەنگاو لەم ڕێگایەدا، خەبات و جیهاد لە دژی نەزانی و گەندەڵیی کۆمەڵایەتی و کولتووری پەستی بێگانە لە سەرزەوییە ئیسلامییەکانە تا هەموو شتێك ئیسلامی بێ و سیاسەت بۆ هەمیشە بکەوێتە خزمەت ئایینەوە. لەم شەڕە پیرۆزەدا، موسوڵمانان دەبێ هەرچەشنە گرێدراوییەکی نەتەوەیی و ئیتنیکی کە لە هۆکارە سەرەکییەکانی دوو بەرەکین وەلانێن، پێڕەوی لە ئوممەتی ئیسلام بکەن. ئامادەیی بۆ شەھید بوون و فیدابوونیش مەرجێکی گرنگی دیکەی ئەم ئەرکە ئیلاھییەیە.

دوای ئەوەی کە جیهانی ئیسلام لە هەرچەشنە چەپەڵی، گەندەڵی، بێ ڕەوشتی و کولتووری بێگانە پاك بۆوە و کۆمەڵگەیەکی بە ڕاستی ئیسلامی بەدی هات، نۆرە دەگاتە سەرزەوییە نائیسلامییەکان. ئەم جار دنیای ئیسلام بۆ ڕزگارکردنی باقیی مرۆڤەکان ڕادەپەڕێ و پیاوانی خوا بۆ شەڕ لەگەڵ کافرەکان دەچنە مەیدان. کاتێك کە ئەم جیهادە بە سەرکەوتنەوە کۆتایی پێ هات، ناتەبایی نێوان "دارالسلام" و "دارالکفر" لە نێو دەچێ و کۆمەڵگەی جیهانیی ڕاستەقینە شکڵ دەگری کە بە نموونە هەڵگرتنەوە لە یەکەمین کۆمەڵگە و حکوومەتی ئیسلامیی سەردەمی پێغەمبەری ئیسلام دروست دەکرێتەوە و بەڕێوە دەبرێ.

لەم کۆمەڵگە جیهانیی ئیسلامییەدا هەموو مرۆڤەکان بە ئیسلامەوە شوناس وەدەست دێنن. بۆ دەستڕاگەیشتن بەم شوناسە ئیسلامییە جۆرێك پێکهاتەشکێنیی دووانەییانە پێویستە. یەکەم بکەرە کۆمەڵایەتییەکان، چ وەك تاك یان ئەندامی گرووپێکی ئیتنیکی یان هاووڵاتیی دەوڵەت — نەتەوە دەبێ لە خۆیان دا وەك سووژەیەك پێکهاتەشکێنی بکەن و ژنانیش گوێڕایەڵ و ملکەچی پیاوان بن. لەم ڕوانگەیەوە تەنیا لە چوارچێوەی ئوممەتی ئیسلامی دایە کە تاك دەتوانێ بە تەواوی خۆی بێ و بچێتە پەنا برائایینییەکانی خۆی کە پشتیوانی، یەکگرتوویی، مانا و ئایدیالی هاوبەش دابین دەکەن. دووهەم، دەوڵەت — نەتەوەش دەبێ نکۆڵی لە شوناسی خۆی بکا و لە دەوڵەتی ئیسلام دا بتوێتەوە (Castells, 1997: 15 – 16).

ئەم بونیادگەراییە ئیسلامییەی ئەم تایبەتمەندییانەی هەیە ئێستاکە سەرانسەری جیهانی ئیسلام و زۆر لەو کۆمەڵگایانەی گرتۆتەوە کە خاوەنی کەمایەتیی موسوڵمانن. ئاسیا وەك شوێنی سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام، بە ناوەندی ئەم بزووتنەوە ئایینییە دەژمێردرێ. لە دوو دەیەی رابردوودا نزیکەی زۆرینەی وڵاتانی ئەم وشکاییە بە شێوەی جۆراوجۆر بزووتنەوەی ئایینییان ئەزموون کردوە. بە تایبەت لەو کۆمەڵگایانەدا کە خاوەنی فرەیی ئایینی و ئیتنیکین، بزووتنەوە تایبەتگەرا ئایینییەکان فەزایەکی پڕ لە ئاڵۆزییان خوڵقاندوە و هەموو ساڵێك دەیان مرۆڤ دەبنە قوربانیی شەڕ و تێکهەڵچوونە توندوتیژانەکانی نێوان گرووپە مەزهەبییەکان.

حیزب و گرووپە ئیسلامییەکانی ئەندۆنزی ئەگەرچی دوای هەوراز و نشێوی زۆر، لە ساڵانی دواییدا بوونەتە هێزێکی سیاسیی پەڕاوێز، بەڵام موسوڵمانە بونیادگەراکانی ئەم وڵاتە ئێستاش بەهێز دێنە بەرچاو. لە مالیزیش لەگەڵ ئەوەی کە کەمێك زیاتر لە پەنجا لە سەدی خەڵك موسوڵمانن، بەڵام ئیسلامی سیاسی زەقتر و بەرینتر بووە. ئەم وشیارییە نوێیە ئیسلامییە نەك هەر لە نێو خەڵکی ئاساییدا، بەڵکوو لە کۆڕە حکوومەتییەکانیش دا دروست بووە و تێگەیشتن و خوێندنەوەی نەریتی لە ئیسلام وردە وردە راکێشەریی خۆی لە دەست دەدا (Cederroth, 1996: 361 – 62, 356).

موسوڵمانەکانی هیندووستان ساڵانێکە بۆ وەدەست هێنانی سەرەتیی زیاتر خەبات دەکەن و لەگەڵ شوێنکەوتووانی ئاین و گرووپەکانی دیکەدا لە شەڕ و ململانێ دان. بە زیادبوونی تایبەتگەرایی کولتووری لە سەرانسەری کۆمەڵگەی هیندا کە بە سەرکەوتنی حیزبی باهاراتا جاناتا گەیشتە لوتکەی خۆی، وشیاریی ئیسلامی زیاتر لە پێشوو زیادی کردوە. ئەم وشیارییە لە نێو موسوڵمانەکانی چینیش دا دروست بووە. موسوڵمانەکانی ئەم وڵاتە کە نزیکەی ١/١٧ لە سەدی کۆی حەشیمەت پێك دێنن (١٧/٦ میلیۆن کەس) و زۆربەیان لە پارێزگای سێن کیانگ دەژین، لە ژێر کارتێکردنی گۆڕانکارییە جیهانیەکان دا و بە تایبەتی گۆڕانکارییەکانی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندیدا، ئۆگری دروست کردنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی سیاسیی خۆیان لە سەر بنەمای بڕوا ئایینییەکانیان، هەرچەند ئەم ئۆگرییە هێشتا رێکخراوێکی لێنەکەوتۆتەوە (Hallencreutz, 1996: 15; Avsm, 1994: 226).

تایبەتگەرایی و دەستەگەرایی ئیسلامی لە بەنگلادش توندتر و بەربڵاوتر لە هیند و چینە. ئەگەرچی هێزە تایبەتگەراکان لە درێژایی ساڵانی خەبات بۆ سەربەخۆیی دا لاواز بوون، بەڵام دوای کودیتای ١٩٧٥ کە لەودا ژێنرال زیائەلرەحمان بە دەسەڵات گەیشت، بەهێزبوون. ئەو





سنووردارییەکانی سەر حیزبە بونیادگەراکانی لابرد و ئەم جۆرە حیزبانە بۆ وێنە "جماعت اسلام" بە راشکاوی دەستیان بە چالاکی کرد. دوای ئەوە بێجگە لە چالاك بوونی ئەو حیزب و گرووپە ئیسلامییانەی بوونیان هەبوو، گرووپ و حیزبی ئیسلامیی نوێیش هاتنە گۆڕەپانی سیاسەتی بەنگلادشەوە. لە سەرەتاکانی دەیەی نەوەدیش دا چەند رێکخراوی بە تەواوی ئیسلامی لەم وڵاتە دا زۆر بەهێز و چالاك بوون (Chakarvarty, 1994: 171 – 75).

لە ماوەی یازدە ساڵ حکوومەتی سوپایی ژێنراڵ زیائەلحەق لە پاکستان فەزایەکی لەبار بۆ گەشەی تایبەتگەرایی ئایینی پێك هات و حیزبی بونیادگەرای گەورەی وەك "جماعت اسلامی پاکستان"، "جماعت علمای اسلام" و "جماعت علمای پاکستان" لەم فەزایەدا گەشەیان کرد. ئەگەرچی لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٣ دا خەڵکی پاکستان نارەزایەتیی خۆیان لە بزووتنەوە و رێکخستنە تایبەتگەراکان نیشان دا، بەڵام تایبەتگەرایی کولتووری- ئایینی بە هیچ شێوەیەك لەم وڵاتەدا لاواز نەبوو. ئەمڕۆکە تێکهەڵچوونی توندوتیژانە لە نێوان گرووپە مەزهەبی و ئیتنیکییەکان بۆتە دیاردەیەکی ئاسایی خەڵکی پاکستان کە کارکردی توندرۆیانەی گرووپی سەحابە دەتوانین وەك وێنەیەکی زەق لەم پێوەندییە دا بێنینەوە (Bahadur, 1994: 150).

دراوسێی باکووری پاکستان ئەمڕۆکە گۆڕەپانی چالاکیی ئەو تایبەتگەرایانەیە کە لە هیچ هەوڵ و کردەوەیەك بۆ جێگیر کردنی ئەو شتەی کە بۆ خۆیان بە شەرعیی ئیسلامی دادەنێن، خۆ نابوێرن، تالیبانی ئەفغانستان تەنانەت سەرەتاییترین مافەکانی مرۆڤیشیان بە بیانووی ناشەرعی بوون دەخستە ژێر پێ. وڵاتانی هەڵکەوتوو لە باکووری ئەفغانستانیش لە کۆتاییەکانی دەیەی هەشتاوە شایەدی پەرەگرتنی جۆرێك تایبەتگەرایی ئیسلامیی شوێن هەڵگرتوو لە بزووتنەوەی وەهابین. ئەگەرچی ئەم رێبازە لە سەرەتای دەیەی هەشتادا سەرکوت کرا، بەڵام وشیاریی ئیسلامی لەم وڵاتەدا بە تایبەت لە ئۆزبەکستان و تاجیکستان دا، دیاردەیەکی سەرنجڕاکێشە (Avsm, 1994: 223).

دوای لێك بڵاوبوونی سۆڤیەت و دامەزرانی کۆماری ئازەربایجان، بونیادگەرا ئیسلامییەکان ماوەیەکی کورت لەم وڵاتەدا چالاك بوون و ئەمڕۆکەش سەرەڕای سنووردارکردن و رێوشوێنە توندەکانی دەوڵەت کەم تا زۆر لە گۆڕەپانی سیاسیی وڵات دان. لە تورکیە رۆژئاواییترین وڵاتی جیهانی ئیسلامیش دا بە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٥ و سەرکەوتنی بەرچاوی ئیسلامگەراکان نەریتی سیکۆلار و نەتەوەگەرایانەی ئاتاتۆرك کەوتە بەر پرسیار. ئێستا بزووتنەوەیەکی بەهێزی ئیسلامی لە تورکیە دا پێك هاتوە کە دەوڵەتی سیکۆلاری ئەم وڵاتە بە گەورەترین مەترسی دادەنێ (Castells, 1997: 19).

لە رۆژئاوای ئاسیا بێجگە لە ولآتانی وەك عەرەبستانی سعوودی و لوبنان کە بزووتنەوەی بونیادگەرایانەیان لە خۆگرتووە، سەرزەوییە داگیرکراوەکانی فەلستینش بە گۆڕەپانی بزووتنەوە ئیسلامییە زۆر چالاك و بەهێزەکان دەژمێردرێ. لە کاتی دەست پێ کردنی "انتفاضە" لە ساڵی ١٩٨٧دا، چالاکە ئیسلامییەکان بوونەتە هێزی سیاسیی گرنگ. دوو رێکخراوی سەرەکیی ئەم بزووتنەوەیە بریتین لە "بزووتنەوەی بەرگریی ئیسلامی(حماس)" و "جیهادی ئیسلامی" کە هەر دووك رێکخراو خوازیاری بوژاندنەوەی فەلستینن و خۆیان بە بەشێك لە بزووتنەوەی جیهانی ئیسلامی دەزانن (Sharma, 1994: 219).

ناوەندی تایبەتگەرایی ئیسلامی لە ئەفریقا چەند ولآتی هەڵکەوتوو لە باکووری ئەم وشکاییەیە. لە دەیەی هەشتاوە بزووتنەوەیەکی ئیسلامی بە هێز لە میسر پێك هاتوە. ئەم بزووتنەوەیە کە لە نێو توێژە خوێندەوارەکانی میسردا پێگەیەکی بەرینی هەیە، خوازیاری دامەزراندنی حکوومەتێکی ئیسلامیی راستەقینەیە. ژمارەیەك لە ئەندامە توندڕۆیەکانی ئەم بزووتنەوەیە، وەك گرووپی "الجهاد" هەموو کۆمەڵگە ئیسلامییەکان بە جۆرێك کۆمەڵگەی نەزانی (جاهلی) لە قەڵەم دەدەن و موسوڵمانە حەقیقییەکان بەرەو ئیسلامی رەسەن بانگهێشت دەکەن. دیارە هێندێك جار خەباتکارە ئیسلامییەکانی میسر پەنایان بردۆتە کردەکانی وەك تیرۆر، بۆمب دانانەوە و هێرشی چەکدارانە کە بەرپرسە دەوڵەتییەکانی تورە کردوە (Zubaida, 1987: 40; Sharma, 1994: 206).

بە پێچەوانەی میسر کە دەوڵەت توانیویەتی تاڕادەیەك خەباتکارانی موسوڵمان کۆنترۆڵ بکا، بزووتنەوەی ئیسلامیی ئەلجەزایر بەهێزتر و بەتاوتر لەوە بووە کە لە بەرانبەر دەوڵەت دا بە چۆك دابێ. لە ژوئەنی ١٩٩٠دا "بەرەی رزگاریدەری ئیسلامی"ی ئەلجەزایر لە یەکەمین هەڵبژاردنی چەند حیزبیی دوای سەربەخۆیی ئەلجەزایردا سەرکەوتنی بەرچاوی وەدەست هێنا و دوو ساڵ دواتر کە هێزە ئیسلامییەکان لە بەرەبەری دووهەمین سەرکەتنی گرنگ دابوون، دادگای بەرزی ولآت هەڵبژاردنەکەی هەڵوەشاوە راگەیاند. لەو کاتەوە تێکهەڵچوونی توندوتیژانە لە نێوان هێزە دەوڵەتییەکان و ئەندامانی بەرەی رزگاریدەری ئیسلامی رووی داوە کە ئاکامەکەی سەدان کوژراو بووە. کوشتاری گوندییەکانیش رووداوێکی راچڵەکێنەرە کە لایەنەکانی ئەم تێکەڵچوونە یەکدیی بەو تاوانبار دەکەن ( Sharma, 1994: 210).

لە سوودان لە سەرەتاکانی دەیەی هەشتاوە کە جەعفەر نمیری سەرۆك کۆماری ئەو کاتی ئەم ولآتە رای گەیاند پێویستە یاسا ئیسلامییەکان بەڕێوە ببرێن، فەزایەکی لەبار بۆ پێکهاتن و



گەشەی بزووتنەوە ئیسلامییەکان رەخسا. لەم فەزایەدا سێ حیزبی گەورەی سوودان — کە هەر کام سەر بە گرووپێکی مەزهەبین — گەشەیان کرد و یەکێك لەوان (بەرەی ئیسلامیی نەتەوەیی) لە هەڵبژاردنی ئاوریلی ١٩٨٦دا هەموو کورسیەکانی لە خارتووم وەدەست هێنا. ئەم هەڵوێستەی دەوڵەت، نارەزایەتی و تووڕەیی مەسیحییەکانی هەڵ خزاند کە تێکهەڵچوونی توندوتیژانەشی بەدواوە بووە. بۆ وێنە لە ماوەی یەك دەیە شەڕ و پێکدادان لە نێوان موسوڵمانەکان و مەسیحییەکان دا شەست هەزار کەس کوژرا و نزیکەی ٣/٥ میلیۆن کەس ئاوارە بوون (Sharma, 1994: 212 – 13).

دوای کودیتای ١٩٨٩ پێگەی حیزبە ئیسلامگەراکان دیسان قایم تر بوو و ژمارەیەك لە چالاکە ئیسلامییەکان پۆستە کلیلیەکانیان بە دەستەوە گرت. لە سەرەتاکانی دەیەی نەوەددا، خارتووم بۆتە ناوەندێکی نێونەتەوەیی ئیسلامی و خەباتکاران و رێبەرانی سیاسی خوازیاری هەنگاوگەلی زیاتر و شێلگێرانەتر بۆ ئیسلامیتر کردنی کۆمەڵگە بوون. بۆ وێنە حەسەن تورابی یەکێك لە رێبەرانی ئیسلامیی سوودان پێی وایە کە سیکۆلاریزم سیستمێکی کافرانەیە و ئایین لە سیاسەت جیا دەکاتەوە (Mahmoud, 1996: 169).

لە ژمارەیەکی دیکە لە ولآتانی ئەفریقاش دا بزووتنەوەی ئیسلامیی تایبەتگەرا هەن. بۆ وێنە لە دەیەی هەشتادا ژمارەیەکی بەرچاو لە خوێندەواران، مامۆستایان و کارمەندە پلە نزمەکان و بازرگان و سنعەتگەرە بچووکەکان چوونە بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی رادیکاڵەوە. ئیسلامگەرا خەباتکارەکانی سێنگالیش کە زۆربەیان خوێندەوارن، جگە لە خەبات کردن لەگەڵ سیکۆلاریسم، هێندێك جار بە توندی رووبەرووی سوفیگەرییەك کە لە ولآت دا باوە دەبوونەوە. لە روانگەی ئەوانەوە ئیسلامی ناسیاسی لە بەرگی سۆفیگەریدا، جۆرێك کولتووری نەزانییە، خراپتر لە نەزانێتیی بەر لە ئیسلام (Loimeier, 1996: 192 – 95).

ئەفریقای رۆژئاوا لە دەیەکانی دواییدا گۆڕەپانی شکڵ گرتن و پەرەگرتنی بزووتنەوە بونیادگەرایانە ئیسلامییەکان بووە. دەکرێ بگوترێ ئەم بزووتنەوە وەهابییە لە دەیەی حەفتا دا پێك هات و سەرەڕای توندگرتن و سەرکوتی دەوڵەت، پەرەی گرت، بەڵام لە دەیەی هەشتا دا توێژەکانی دیکەی وەك رووناکبیران، کارمەندە پلە نزمەکان و جووتیارەکان پێیەوە پەیوەست بوون. لە نیوەی دووهەمی دەیەی هەشتادا وەهابییەکان لە شارەگرنگەکانی وەك باماکو دامەزراوەگەلی گەورەی راهێنانیان بەڕێوەدەبرد و ژمارەیەکی زۆر مزگەوتیان دروست کردبوو (Amselle, 1987: 81 – 2).

جگە لە ئاسیا و ئەفریقا، لە دوو وشکایی ئەمریکا و ئەورووپاش دا دەتوانین تایبەتگەرایی ئیسلامیی لێك بلاو دەس نیشان بکەین. بۆ وێنە گرووپی "نەتەوەی ئیسلام" لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەو گرووپانەیە کە بە توندی لەگەڵ مەسیحییە پارێزگارەکان، سیکۆلاریسم و تەواێتیی سیستمی سیاسیی ئەمریکا دژایەتی و خەبات دەکا و خوازیاری دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆیە. ئەندامانی نەتەوەی ئیسلام، ئەمریکاییە بە ڕەسەن ئەفریقاییەکانن و هێمای نەتەوەیی تایبەتیان وەك ئاڵا و سروود هەیە. دیارە دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ لە ڕوانگەی نەتەوەی ئیسلامەوە ڕێگاچارەیەکی کاتییە تا کۆتایی ڕۆژگار دەگاتێ و خوا کافرەکان و سپی پێستەکان لە نێو دەبا و زەوی دەکاتە بەهشتی هەتاهەتایی ڕەشەکان (Hallencreutz, 1996: 9).

## بونیادگەرایی جوولەکە (یەهوودی)

بونیادگەرایی جوولەکە لەگەڵ بونیادگەرایی مەسیحی هێندێك جیاوازیی هەیە. بونیادگەرا مەسیحییەکان ئیدیعای خاوەن حەقیقەت بوونی کتێبی پیرۆز دەکەن، بەڵام بونیادگەرا جوولەکەکان پێ لە سەر ڕاستیی ڕاڤە و لێکدانەوەکانی خاخامەکان لە کتێبی پیرۆز دادەگرن. دیارە لە نێو جوولەکانیش دا گرووپی وا هەن کە وەك بونیادگەرا مەسیحییەکان، کتێبی پیرۆز بە حەقیقەت دەزانن. بۆ وێنە کارایتەکان یان سامارتینەکان دەتوانین بە بەشێك لەم گرووپانە لە قەڵەم بدەین (Webber, 1987: 102).

هەر چۆنێك بێ ئەمڕۆکە دەتوانین لە یەهوودییەتی مۆدێڕن دا دوو بزووتنەوەی بەڵێندراو باوەڕانە (موعودباورانە) دەس نیشان بکەین کە لەگەڵ نموونەکانی بونیادگەرایانەی هزر و ئاکاری سیاسی دەگونجێن: سەهیۆنیستە مەزهەبییەکان ناسراو بە Gush Emunim و جوولەکە زۆر دەمارگرژەکان. سەهیۆنیستە مەزهەبییەکان دا زۆرتر لە ئیسرائیلن و جوولەکە ئۆرتدۆکسەکان جگە لە ئیسرائیل لە ولاتانی ئەورووپایی، کانادا و ولاتە یەکگرتووەکان دەژین. ئەگەرچی ئەم گرووپانە بە گشتی ئەندامەکانیان کەم ژمارن، بەڵام ڕێکخستنی خاوەن تەکووزی و توانای دارایی بەرچاویان هەیە.

بونیادگەرا توندڕۆیەکان لەم بڕوایە دان کە جوولەکەکانی وەك تیۆدۆر هێرتزل لە لایەن خواوە هاندراون تاوەکوو بزووتنەوەیەکی سیاسی وەڕێ بخەن و گرنگترین ئامانجی ئەم بزووتنەوەیەش بریتییە لە کۆکردنەوەی مەسیحیە [ناڕاست — جوولەکە] پەرشوبلاوەکانی جیهان



لە سەرزەویی بەڵێندراو و فەلستین دا. بەم پێیە ئەوان دەوڵەتی ئیسرائیل دەخەنە ژێر فشارەوە تا سەرزەویی زیاتر داگیر بکا. دیارە ئامانجی سەرەکیی بونیادگەرایی جوولەکە دەرکەوتنی ڕزگاریدەر و مەسیحێکە کە دوژمنانی نەتەوەی یەهوود لە نێو بەرێ و، یەکسانی لە سەرانسەری جیهان دا بڵاو بکاتەوە (Appleby, 1998: 286 – 87).

## بونیادگەرایی ئایینی لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا

تایبەتمەندیی زۆربەی ولاتانی هەڵکەوتوو لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بە تایبەت هیندووستان، فرەیی ئیتنیکی، زەمەنی و ئایینیی بەرچاوە. ئەم جۆراوجۆریی کولتوورییە هەمیشە بواری بۆ زۆر جۆری لە تایبەتگەرایی کولتووری— کۆمەڵایەتی ڕەخساندوە کە لە دەیەکانی دواییدا بەرینتر و بەگوڕتر بووە. بونیادگەرایی ئایینی یەکێك لە جۆرەکانی تایبەتگەراییە و بە شکڵی جۆراوجۆر دەردەکەوێ. لە باسی بونیادگەرایی مەسیحی و ئیسلامی دا ئاماژەمان بە ژمارەیەك لەم تایبەتگەراییانە کرد و ئێستا دەستەیەکی دیکە لە تایبەتگەراییەکان کە لە نێوان پێڕەوانی سێ ئایینی بوودایی، هیندوو و سیك هەیە تاوتوێ دەکەین.

ئامادەیی بەهێز و پێگەی بەربڵاوی حیزبی سیکۆلار و گشتگەرای "کۆنگرە" لە کۆمەڵگەی هیند دا کە چەندین ساڵ درێژەی هەبوو، لاوازبوون و بەرەو پەراوێزچوونی زێدەرووی بزووتنەوەو ڕێکخستنە تایبەتگەرایانە و بونیادگەرایانە جۆراوجۆرەکانی کردبووە چاوەڕوانییەکی شیاو و بەجێ لە لای کارناسانی پرسەکانی هیند. تەوەری زۆربەی ڕوانگە و پێش بینی یەکان ئەمە بوو کە کۆسپە کولتوورییەکانی دێمۆکراسی زیاتر لە پێشوو لە نێو دەچن و گشتگەرایی کولتووری پەرە دەگرێ. بەڵام ڕووداوەکان و گۆڕانکارییەکانی دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم نیشانیان دا کە توانایی کۆکردنەوەی توخمە جۆراوجۆرە کولتوورییەکانی وەك ئایین، زمان و ئیتنیسیتە زۆر زیاتر بووە.

هیند لە حاڵێك دا دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەمی بە جێ هێشت کە ئاڵۆزییەکان و دژبەری و تێکهەڵچوونە ئایینی و ئیتنیکیە زێدەڕوویەکان بەشە جۆراوجۆرەکانی ئەم سەرزەوییە پڕ لە جۆراوجۆری و جیاوازییە کولتوورییەی داگرتبوو. هیندووەکان هیندووستانێکی بە بێ ناهیندووەکانیان دەویست، سیکەکان بۆ پێکهاتنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی سیك خەباتیان دەکرد، موسوڵمانەکان و مەسیحییەکانیش ولات و دەوڵەتی سەربەخۆیان دەویست. دیارە هێشتاش شتێك لە گوڕی ئەم تایبەتگەراییە کولتوورییە پڕ شەڕ و توندوتیژییە کەم نەبۆتەوە.

ئایدیۆلۆژیی بزووتنەوەی بوژاندنەوەگەرایانەی هیندووەکان لە سەر بنچینەی کۆمەڵگەی هیندووەکان، بایەخەکانی ئایینی هیندوو و سەرزەویی هیند بونیادنراوە. بە پێی ئەم ئایدیۆلۆژییە موسوڵمان و مەسیحییەکان شوێنکەوتووانی ئایینە پلە دووهەمەکانن و بەتایبەت موسوڵمانەکان بە مەترسییەکی جیددی لە سەر ڕێگا خەبات بۆ پێکهێنانی نەتەوەیەکی هیندوو دەژمێردرێن. هیندووە بونیادگەراکان لەم بڕوایە دان کە هیندووستان هی هیندووە ڕەسەنەکانە و پاك کردنەوەی ئەم نیشتمانە پیرۆزە لە ناهیندووەکان ئەرکی سەرشانی هەموو هیندووەکانە. زۆر لە تێکهەڵچوون و ململانێ توندوتیژانەکانی ناوچە جۆراوجۆرەکانی هیند، بەرهەمی کارکردی ئەو هیندووانەیە کە خۆیان بە بەڕێوەبەری سەرەکیی ئەرکێکی ئەوتۆ دەزانن (Hallencreutz, 1996: 15 – 17).

ئەگەرچی یەکەمین قۆناخەکانی شکڵ گرتنی بزووتنەوەی بونیادگەرایانەی هیندوو بۆ دەیەی شەست و تەنانەت نیوەڕاستی دەیەی پەنجا دەگەڕێتەوە، بەڵام لە دەیەی نەوەد دا ئەم بزووتنەوەیە زۆر بەرینتر و بەتاوتر بوو کە سەرکەوتنە بەرچاوەکانی حیزبی باهاراتیا جاناتا لە نیشانە زەقەکانی پەرەگرتن و بەرەوپێش چوونی ئەم بزووتنەوەیە بوو. بە پێچەوانەی حیزبی کۆنگرە کە پێی لە سەر بنواشە و بایەخە گشتگەرایانەکانی وەك دیمۆکراسی و پلۆرالیسمی کولتووری دادەگرت، حیزبی باهاراتیا جاناتا ئایدیۆلۆژیی بوژاندنەوەی هیندوویسمی بۆ کۆکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵك بە کار دەهێنا و چالاکییەکانی لە ناوچە هیندوونیشینەکان دا چڕ کردبۆوە (Chopra, 1994: 73).

لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٢دا حیزبی باهاراتیا جاناتا لەگەڵ حیزبێکی دیکە (جانا سانگ) ٣/١ لە سەدی کۆی دەنگەکانیان وەدەست هێنا، بەڵام نزیکەی چل ساڵ دواتر (هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩١) ئەم حیزبە بە تەنیا ١٩/٩ لە سەدی دەنگەکانی هێنایەوە. زیادبوونی لایەنگرانی حیزب لە ساڵەکانی سەرەتای دەیەی نەوەد دا بە توندییەکی زۆرتر درێژەی هەبوو، بە چەشنێك کە ئەم حیزبە لە هەڵبژاردنەکانی دواتر دا پێگەی خۆی قایمتر کرد و سەرەنجام توانی حیزبی بە هێزی کۆنگرە شکست بدا و دەسەڵات بە دەستەوە بگرێ. گەشەی بزووتنەوەی بونیادگەرایانەی هیندوو تەنانەت حیزبە سیکۆلارەکانی وەك حیزبی کۆنگرەی ناچار کرد تاوەکوو لە سیاسەتەکانی خۆی دا سەبارەت بە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان پێداچوونەوە بکا و لەگەڵ حیزبە بونیادگەراو گرووپ گەراکان هاوبەندی پێك بێنێ (Chopa, 1994: 74).



سیکەکان بە بەراورد لەگەڵ هیندووەکان توندڕۆترن. سیکەکان کە زۆرینەی حەشیمەتی هەرێمی پەنجاب پێك دێنن، لە ساڵانی دوایی دا بەرەو بزووتنەوەی تایبەتگەرایانە کشاون و بۆ دامەزراندنی وڵات و دەوڵەتێکی سەربەخۆ (خالصتان) خەبات دەکەن. ئەوان دەڵێن کە زاڵێتیی دەوڵەتی هیندووستان و هیندووەکان مەترسییەکی گەورەن بۆ شوناسی سیکەکان. تەوەری بزووتنەوەی بوژانەوەگەرایانەی سیك، کولتووری پەنجاب و ئایینی سیکە کە دەبێ لە هەرچەشنە نارەسەنییەك پاك بێتەوە. لە ڕوانگەی بونیادگەراکانەوە ئەگەر دەوڵەت— نەتەوەی سیك پێك بێ، ئیتر پێویستییەك بە سیکۆلاریسم نابێ، چونکە ئایینی سیك و کولتووری پەنجاب توانای بەڕێوەبردنی هەموو کاروبار و لایەنەکانی ژیانیان هەیە(Hallencreutz, 1996: 17).

ئەم زیادبوونی وشیاری و تایبەتەگەراییە کولتوورییەی سیکەکان بۆتە بوار خۆشکەر و هۆکاری کردەوە و ئاکارە زۆر توندوتیژانەکان بووە. سیکە توندڕۆیەکان بێجگە لە تیرۆری نەیارانی خۆیان (لەوانە ئیندیراگاندی، سەرۆك وەزیری ئەو کاتی هیند) بەردەوام لەگەڵ پێڕەوانی ئایینەکانی دیکە بە توندی ڕووبەڕووبوونەتەوە کە تێکهەڵچوونە توندوتیژانەکان لە سەر پەرستگەی زێڕینی ئامریستار لە وێنە زەقەکانی ئەو توندوتیژییانەن. لەو تێکهەڵچوونەدا کە ساڵی ١٩٧٨ دەستی پێ کرد و بۆ ماوەی دەیەیەك بەردەوام بوو، هەزاران مرۆڤی بێ تاوان گیانیان لە دەست دا و زیانی ئابووریی گەورەش دروست بوو(Dietrich, 1987: 132 – 33).

ئەگەرچی بونیادگەرا سیکەکان دوای دە ساڵ ناکۆکی سەرەنجام دێر(پەرستگە)ی زێڕینیان بە دەستەوە گرت، بەڵام تایبەتگەرایی کولتووری لە پەنجاب نەك هەر نەنیشتەوە، بەڵکوو بەگوڕتریش بوو. بە تایبەت دوای مردنی ڕێبەری میانەڕۆی سیکەکان، ڕێبەری بزووتنەوە کەوتە دەست توندڕۆیەکان و ئێستاکە سیکەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەیان لە هیچ کردەوەیەك سڵ ناکەنەوە. کەواتە تەنانەت ئەو حیزب و ڕێکخراوانەش کە پێبەندی پاراستنی یەکیەتیی نەتەوەیی لە سێبەری پێکەوە ژیان و پلۆرالیسمی ئایینی و ئیتنیکی دان، ناتوانن لە مەیل و ویستە تایبەتگەرایانەکانی سیکەکان چاو بپۆشین (Singh, 1994: 132 – 34).

لە نێو پێڕەوانی ئایینی بووداییش دا بزووتنەوە تایبەتگەرایانە و بونیادگەرایانە هەیە. ئەگەرچی لایەنە گشتگەرایانەکان لەم ئایینەدا زۆر زەق و پڕڕەنگن، بەڵام تایبەتگەراییە کولتوورییەکانیش لەو سرووش وەردەگرن. ئەم دوو ڕووکارەی ئایینی بودایی بە باشترین شێوە لە کۆمەڵگەی بێرمەدا دەرکەوتوە. لەم وڵاتەدا ئایدیۆلۆژیی هەر دووك بزووتنەوەی نوێخوازانە و نەریتخوازانە لە سەر ڕووکارە جۆراوجۆرەکانی بودیسم بونیادنراوە. نوێخوازی لە سەر

پەرەپێدانی ئابووری، سیکۆلاریسم، دیمۆکراسی و ئازادیی تاکەکەسی پێ دادەگرێ و خوازیاری پێك هێنانی تەکووزیی جیهانیی نوێ لە ڕێگای پەرەگرتنی نوێبوونەوە و ئاکاری جیهانی وەك مافەکانی مرۆڤە (Gravers, 1996: 316).

بەڵام نەریت گەرایی نوێ کە نەریتگەرایی کلاسیك و باو (پێداگرتن لە سەر نێوەرۆکی هەتا هەتایی و نەگۆڕی کولتووری بێرمەیی) جیاوازە و لە سەر تایبەتگەرایی کولتووری پێ دادەگرێ. بە پێی ئایدیۆلۆژیی ئەم تایبەتگەراییە، کولتووری بوودایی بە شێوەیەکی جیددی لە مەترسی دایە و دەبێ ئەو لە بەرانبەر هێزە دەستێوەردەر و ڕووخێنەرە بێگانەکان دا بپارێزرێ. باشترین شێوەی بە جێ‌گەیاندنی ئەم گرنگە گرتنەبەری سیاسەتی گۆشەگیری و کەمکردنەوەی پێوەندی لەگەڵ جیهانی دەرەوەیە (Gravers, 1996: 317).

ئەگەرچی سیاسەتی فەرمیی دەوڵەتی بێرمە لە دەیەی نەوەددا جیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەت و کۆنترۆڵ کردنی گرووپە بونیادگەراکان بووە، بەڵام ئایینی بوودایی ڕۆڵێکی سەرەکی لە دیاری کردنی شوناسی ئیتنیکی و نەتەوەیی بیرمەییەکان دا دەگێڕێ و وەك ئامرازێکی بەهێز بۆ خەبات و دژایەتی لەگەڵ کولتوورە بێگانەکان بە تایبەت کولتووری ڕۆژئاوا و بایەخە گشتییەکانی (مافەکانی مرۆڤ) بەکاردەهێنرێ. بوودایییە بونیادگەراکانی بێرمە، چەمکەکانی وەك دیمۆکراسی و مافەکانی مرۆڤ لەگەڵ بایەخە کولتووری و ئایینییەکانی خۆیان بە بێگانە دەزانن و ئەوان ڕەت دەکەنەوە. ئەوان هەروەها لە هەرچەشنە ئاکارێکی ئاوێتە بە جیاوازیدانان و توندتیرانە لەگەڵ کەمایەتییە ئایینییەکان (مەسیحییەکان و موسوڵمانەکان) خۆنابوێرن. دەرکردنی دوو سەد هەزار کەس لە موسوڵمانەکان وێنەی بەرچاوی ئەم هەڵسوکەوتەیە (Hallencreutz, 1996: 18).

وڵاتێکی دیکە کە بە بەستێنی بزووتنەوەی تایبەتگەرایانەی بوودایی دەژمێردرێ، سریلانکایە. ئایینی بوودایی زیاتر لە دوو سەد هەزار ساڵە کە بە سریلانکاوە گرێ دراوە و بۆتە بەشێکی جیانەکراوەی کولتووری سینهالەکان (٣ لە ٤ی کۆی حەشیمەتی وڵات). ئێستاکە ئەم ئایینە هەم کارتێکەریی زۆری لە شەڕی نێوخۆیی سینهالەکان و کۆمەڵگەی تامیلی سەیلان دا هەبووە و هەم سرووش بەخشی ئەو تاك و گرووپانەیە کە لە نێو کۆمەڵگەی سینهالەکان دا بۆ بەهێزکردنی میرات و شوناسی نەتەوەیی لە بەرانبەر ئۆگرانی جیهانی سیکۆلار، ماددی و سەرمایەداریی ڕۆژئاوا دا هەوڵ دەدەن و خەبات دەکەن (Matthews, 1996: 284).





بونیادگەرا بوودایییەکانی سریلانکا لە دەیەی شەست دا چالاك بوون. ئاکامی چالاکییە تاڕادەیەك توندڕۆیانە و دژایەتیکارانەی ئەوان پەسندکردن و دەستەبەربوونی پێگەیەکی تایبەت و باڵاتر بۆ زمانی سینهالەکان و ئایینی بوودایی بوو. ئەوان هەروەها توانیان قوتابخانەکانی وانەبێژە مەسیحییەکان کۆبکەنەوە و وەزارەتخانەیەك دامەزرێنن کە سەرپەرستیی کولتووری سینهالەکان بکا. ئەم دەسکەوتە بزووتنەوەی بوودایی خاو کردەوە و ئەم بزووتنەوەیە چۆتە قۆناخی میانەڕەوییەوە، هەرچەند کە لە ساڵی ١٩٧١ لایەنی توندڕۆی بزووتنەوە بەوەرێ‌خستنی شۆڕشێکی توند ئەم دۆخەی بۆ ماوەیەکی کورت تێکدا (Matthews, 1996: 287).

بەڵام لە نێوەڕاستی دەیەی هەشتادا شەپۆلێکی دیکەی تایبەتگەرایی توندڕۆیانە کۆمەڵگەی سریلانکای داگرت و گرووپ گەلی توندڕۆ پێك هاتن و هاتنە مەیدان. توندڕۆترین گرووپ جاتیکاپرامون[54] بوو کە هەرچەشنە وتووێژێکی لەگەڵ جیاییخوازەکانی تامیل ڕەت دەکردەوە. لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا "بزووتنەوەی بەرگری لە نیشتمان" پێك هات کە ئامانجی ئەو یەکگرتووکردنی ئەنجوومەکان و گرووپە کولتووری— سیاسییە جۆراوجۆرەکانی سەر بە سینهالەکان بوو. ئەم بزووتنەوەیە نەتەنیا لەمەبەستەکەی خۆی دا تاڕادەیەك سەرکەوتوو بوو، [هەروەها] لە کۆکردنەوە تویژ و گرووپە جۆراوجۆرەکانیش دا سەرکەوتوو بوو (Matthews, 1996: 288).

هەر چۆنێك بێ ئێستاکە ئایینی بوودایی بەهۆی بەستراوەیی توند لەگەڵ کولتوور و زمانی زۆرینەی سریلانکاییەکان ژیانی کۆمەڵایەتی کولتووریی ئەم کۆمەڵگەیەی بە توندی خستۆتە ژێر باندۆرەوە. ئایدیۆلۆژیی نەتەوەیی[55] کە لە چوارچێوەی تایبەتگەرایی بووداییدا داڕێژراوە، بە جۆرێك بونیادگەرایی کولتووری دەژمێردرێ و ئەگەر کۆنترۆڵ نەکرێ دەمارگرژی و رادیکالیسمێکی مەترسیداری لـــێ‌دەکەوێتەوە. ئەم بونیادگەراییە کولتوورییە نەك هەر فەزای ژیانی کۆمەڵایەتی دەهورووژێنێ دەکا، بەڵکوو مەودای لێك گەیشتن و پێکەوەژیانی ئیتنیکی— لەگەڵ تامیلەکانیش زۆر کەم دەکاتەوە.

لە تاوتوێ کردنی بونیادگەرایی بوودایی دا دەبێ باس لە وڵاتاتی تایلەندیش بکرێ. لەم وڵاتە دا کە ئایین و سیاسەت پێوەندییەکی توند و تۆڵیان لەگەڵ یەکدی هەیە، خوێندنەوەیەکی بونیادگەرایانە لە ئایینی بوودایی بە سەر وڵات دا زاڵ بووە. هەر ئەم سیاسی بوونە زۆرەی

54- Jathica Peramuna
55- Jathika chintanaya

ئایین لە ساڵانی دوایی دا، پەرچەکرداری ژمارەیەك لە گرووپە ئیتنیکییەکانی بەدواوە بووە و بەهێزبوونی باوەڕە خۆجێییەکان و داکشان بە لای مەسیحایەتی دا وێنەی زەقی ئەم پەرچەکردارەیە. ئەم دۆخە هەروەها بوارێکی لەباری بۆ گەشە و پەرەگرتنی بزووتنەوە بەڵێندراو بڕواکان (موعودباور) ڕەخساندوە (Hallencreutz, 1996: 18).

## تایبەتگەراییە کولتوورییەکانی دیکە

زۆربەی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان کەم تا زۆر بە جۆرێك تایبەتگەرایی ئیتنیکی–نەتەوەیی یان بونیادگەرایی ئایینی دەژمێردرێن. لە زۆربەی بزووتنەوە تایبەتگەراکان دا تاك و گرووپەکان وەك باوە لە دەوری تەوەری ئیتنیسیتە و نەتەوایەتی و ئایین کۆ دەبنەوە، ڕێك دەخرێن و یان خەبات و بەربەرەکانی دەکەن. بەڵام زێدەتر لەم دوو دەستەیە تایبەتگەرایی کولتووریی دیکەش هەیە کە لە بزووتنەوە و ڕێکخراوە گەورە و بچووکەکانی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان دا دەردەکەون.

ئەم دەستەیە لە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان هەرچەند وێکچوونیان لەگەڵ بزووتنەوە ئیتنیکی، ناسیۆنالیستی و ئایینی‌یەکان هەیە، خاوەنی تایبەتمەندی گەلێکیشن کە ئەوان لەو دوو دەستە تایبەتگەراییەی باسیان کرا جیا دەکاتەوە. لەم تایبەتگەرایییانەدا توخمە جۆراوجۆرەکانی تایبەتگەرایی ئیتنیکی و ئایینی لەگەڵ توخم گەلی دیکە بە ڕێژەی جیاواز تێکەڵاو دەبن. هەر بەم هۆیەوە لە هێندێك وێنە وەك بزووتنەوەی میلیشیاکانی ئەمریکا دا لایەنی توندرۆیانەی نیشتمانپەروەری و ئیتنیسیتە زۆر پڕ ڕەنگە و لە هێندێك نموونەی دیکەدا وەك بزووتنەوەی ئایوم لە ژاپۆن، کولتووری ئایینی و عیرفانی بە تایبەتمەندیی بزووتنەوەکە دەژمێردرێ.

ئەم چەشنە ئاوێتە و تێکەڵاوییە ئاڵۆزانە، پۆلێن کردن و جۆرناسیی ئەم دەستەیە لە تایبەتگەراییەکانی زۆر دژوار کردوە. دەستەیەك لە توێژەران ئەم جۆرە تایبەتگەرایییانە لە ژێر ناوی "بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە دژە تەکوزییەکان" و یان "بەرگرییە کولتوورییە گرووپ تەوەرەکان"دا تاوتوێ دەکەن. ژمارەیەك لە کۆمەڵناسانیش ئەم بزووتنەوە و گرووپانەیان ناو ناوە "هۆزە نوێیەکان" و باس لە "هۆزگەرایی" پۆست مۆدێرن و "نژادپەرستیی نوێ" لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا دەکەن (Silverman, 1999: 54; Castells, 1997: 71 – 72).



لە ژێر هەر کام لەم ناوانەدا، تایبەتگەراییە کولتوورییە جۆراوجۆرکان تاوتوێ دەکرێ کە نیشانەی دژواریی پۆلێن کردنی ئەم جۆرە تایبەتگەرایییانەیە کە لەم بەشە دا بە بێ پۆلێن کردن، بە تاوتوێ کردنی چەند وێنە واز دێنین.

مانویل کاستێل سێ وێنە لە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە دژەتەکووزییەکان تاوتوێ دەکا: بزووتنەوەی زاپاتیستەکانی میکزیك، بزووتنەوەی نیشتمانپەروەرانی ئەمریکا و بزووتنەوەی ئایوم شینریکیۆ[56] لە ژاپۆن. ئەم سێ بزووتنەوەیە بەستێنی کولتووری، ئابووری و دامەزراوەیی زۆر جیاوازیان هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا هەر سێکیان هێماگەلێکن لە بەرگریی لە بەرانبەر پرۆسەی بەجیهانیبوون و تەکووزیی جیهانیی نوێ دا، بەرگرییەك بە پەنا بردن بۆ کولتوور و مێژوویەکی دیاریکراو و توندوتیژی تایبەتمەندییەکانیەتی.

لە یەکەمی ژانویەی ١٩٩٤ دا زاپاتیستە چەکدارەکان لەگەڵ هێزە هێمنایەتییەکان و پۆلیسی دەوڵەتی میکزیك تێك هەڵ چوون. ئەگەرچی زاپاتیستەکان ئیدعایان دەکرد و لە کردەوەشدا نیشانیان دا کە پێبەندی خەباتی هێمنانەن، بەڵام شەڕێکی نەخوازراوی لــێکەوتەوە. دیارە ئەم شەڕە زوو کۆتایی پێ هات و دەوڵەت ناچاربوو لە دەوری مێزێك لەگەڵ زاپاتیستەکان وتووێژ بکا. کۆتایی دەمودەستی شەڕ زۆرتر بەم هۆیە بوو کە ئەوان بە باشی توانیان لە ئامرازەکان و ڕایەڵکەی پێوەندییە جیهانییەکان کەڵك وەرگرن و بزووتنەوە بچووکەکەی خۆیان لە ئاستی جیهان دا بناسێنن (Castells, 1997: 73).

زۆربەی ئەندامان، چالاکەکان و لایەنگرانی ئەم بزووتنەوەیە لە خۆجێیە سوورپێستەکانی میکزیك پێك دەهاتن کە لە بەرانبەر لۆژیکی ڕەوتی جیهانیی سەرمایە دا دەستیان بە بەرگری کردبوو. لەوەڕا کە ئەم لۆژیکە لەگەڵ کولتووری جیهانی هاوشان بوو و شوناس و پێگەی نەریتیی سوورپێستەکانی بە شێوەیەکی جیددی دەخستە مەترسییەوە، بەربەرەکانی لە بەرانبەر ئەودا بە ئامرازی کولتووری بەڕێوە دەبرا: زاپاتیستەکان لە پلەی یەکەم دا خوازیاری ماف و سەرەتی گەلێك بوون کە دابین بوونی ئەوان بە مانای ناسران و شوناس پەیداکردن بوو (Castells, 1997: 77).

لە کۆکردنەوەی خۆجییەکانی میکزیك دا زۆرتر لە سەر غیرەت و شوناسی کولتووریی سوورپێستەکان پێداگیربوو. دیارە کولتوور و نەریتێك کە لە ئایدیۆلۆژیی زاپاتیستەکان دا کەڵکی لــێوەردەگیرا، گێڕانەوەیەکی نوێژەنکراوە بوو. لەم ئایدیۆلۆژییە دا پاڵنەری بزووتنەوە

56- Aum Shinrikyo

بریتی بوو لە راپەڕین لە دژی سووکایەتی پێ کردن و بێ ڕێزی دەرهەق بە خۆجێیە سوورپێستەکان کە بە هۆی ئاوێتەبوونی کۆمەڵگەی میکزیك لە سیستمی سەرمایەداری دا خولْقابوو. لە راستی دا لە ئایدیۆلۆژیی زاپاتیستەکان دا، مێژووی سوورپێستەکان بە جۆرێك دروست کرابۆوە کە پێگەی ئەوانی بەر لە هێرشی کولتوور و سەرمایەی جیهانی نیشان دەدا.

کەواتە رێگایەك بێجگە لە خەبات لە دژی کولتوور و تەکووزیی جیهانیی روو لە پەرەگرتن نیە. تەنیا لە رێگای خەباتێکی ئەوتۆوەیە کە دەتوانرێ غوروور، رەسەنایەتی، سەربەرزی و سەربەخۆیی رابردوو وەدەست بهێنرێتەوە و شوناسی رەسەن ببووژێندرێتەوە. دیارە لەم خەباتە دا، کولتووری ئایینییش دەورێکی کاریگەری هەبوو. بزووتنەوەی زاپاتیستەکان بەردەوام لە لایەن کاتۆلیسمی پۆپۆلیستیی باو لە ئەمریکای لاتین پشتگریی لێ دەکرا و بڕوادارەکانیش دەچوونە ریزی بزووتنەوەکەوە (Castells, 1997: 83). کەواتە ئەم بزووتنەوەیە هێمایەك لە تایبەتگەراییەکی کولتووری بوو کە ئیتنیسیتە و ئایین رۆڵێکی ژیانەکییان تێیدا هەبوو.

نزیك ساڵێك و وردەیەك دوای دەست پێ کردنی بزووتنەوەی زاپاتیستەکانی میکزیك، رووداوێکی گرنگ لە یەکێك لە شارەکانی دراوسێی باکووری میکزیك کەوتە سەرووی هەواڵەکانی رایەڵکە هەواڵییەکانی جیهانەوە. لە نۆزدەی ئاوریلی ١٩٩٥دا تەقینەوەی گەورەی ئۆکلاهماسیتی کۆمەڵگەی ئەمریکای راچڵەکاند و پەردەی لە سەر راستییەکی گرنگ لە بەهێزترین وڵاتی جیهان دا لادا. ئەم راستییە بوونی ئەو گرووپ و مەیلانە بوو کە تا ئەو کات پێگەیەکی پەڕاوێزییان هەبوو و ئەوەندە بە هێند وەرنەدەگیران. لە راستیدا تەقینەوەکە رووداوێکی ساکار نەبوو، بەڵکوو باسی لە رەوتێکی کولتووری — کۆمەڵایەتی دەکرد کە بە بزووتنەوەی نیشتمانپەروەریی ئەمریکا ناو دەبرا.

بە دوای ئەم تەقینەوەیەدا، بەرپرسە هێمنایەتییەکان و پۆلیسی ئەمریکا رێوشوێنی هێمنایەتیی توندیان گرتەبەر، بەڵام چالاکییەکانی ئەندامە چالاکەکانی بزووتنەوەکە کۆتایی نەهات. ئەوان لە ساڵی ١٩٩٤ تا ١٩٩٦ دەستیان کرد بە کردەوەی جۆراوجۆر وەك بۆمب دانانەوە، دزیی چەکدارانە لە بانکەکان، خراپ کردنی رێگای ئاسن و کردەوەگەلی توندوتیژانە و خراپکارانە. دزینی بۆمب و چەکی جۆراوجۆر (تەنانەت مووشەکی ستینگر)، هەوڵ دان بۆ بەرهەمهێنانی چەکی میکرۆبی، راهێنانی سوپایی و ... خراوتە ئەستۆی ئەندامانی ئەم بزووتنەوەیە(Castells, 1997: 85).



لە لایەنی ئایدیۆلۆژیکییەوە، بزووتنەوەی نیشتمانپەروەرانەی ئەمریکا گرووپ و رێکخراوگەلی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێ. لە سەرێکی بزووتنەوەکە رێکخراوە کۆنسێرواتیڤەکانی وەك کۆمەڵگەی Jahn Birch و لە سەرەکەی دیکەی دا گرووپە توندرۆ و دەمارگرژەکانی وەك گرووپی مەزهەبیی "شوناسی مەسیحی" و گرووپی دژە جوولەکە هەڵکەوتوون. ژمارەیەك لە گرووپە نەریتییە نژادپەرست و نیۆنازییەکان و گرووپەکانی دژی حکوومەتی فیدرالیش لە چوارچێوەی ئەم بزووتنەوەیە دان. هاوبەندییەکی مەسیحیی بەهێز و ژمارەیەك گرووپی چەکداریش دەکەونە چوارچێوەی بزووتنەوەی نیشتمانپەوەرانەی ئەمریکاوە (Castells, 1997: 85 – 6).

لە سەر ژمارەی دروستی ئەندامان یان شوێنکەوتووانی ئەم بزووتنەوەیە کۆدەنگی نیە، چونکە نایاسایی بوونی زۆربەی گرووپەکانی سەر بەم بزووتنەوەیە و نەبوونی ئەندام گرتنی فەرمی بەراوردکردنی وردی ئەندامان و شوێنکەوتووانی بزووتنەوەکەی زۆر دژوار کردوە. بەڵام سەرەڕای بوونی ئەم دژوارییانە بەراورد دەکرێ ئەندامانی بزووتنەوەی نیشتمانپەروەرانەی ئەمریکا بگاتە پێنج میلۆن کەس. ژمارەی کەسانی ژێر کاریگەریی ئایدیۆلۆژیی بزووتنەوە و لایەنگرەکانیشی بە میلیۆنان کەس مەزندە دەکرێ. دیارە دەبێ وەبیربێنینەوە کە رۆژ بە رۆژ بە ژمارەی ئەو کەسانەوە کە روودەکەنە ئەم بزووتنەوەیە یان لایەنگریی لێدەکەن زیاد دەبێ (Castells, 1997: 86 – 90).

ئەگەرچی ژمارەی ئەندامان و لایەنگرانی بزووتنەوە بە وردی دیار نیە و گرووپەکانی سەر بەویش جۆراوجۆرن، بەڵام دەکرێ بگوترێ کە بنواشەکان و بنەما ئایدیۆلۆژیکییەکانی بزووتنەوەی نیشتمانپەروەری روونن. بە پێی ئەم ئایدیۆلۆژییە، دوژمنێك بە ناوی حکوومەتی فیدراڵی ئەمریکا کە نوێنەری تەکووزیی نوێی جیهانی و دابینکەری بەرژەوەندییەکانی دەستەبژێرێکی جیهانییە، کولتوور، مافی سەروەری و سەربەخۆیی ئەمریکای بە توندی خستۆتە مەترسییەوە. بێجگە لە حکوومەتی فیدراڵ، فیمینیستەکان، هۆموسیکسوالەکان و کەمایەتییەکانیش بە دوژمنی نەتەوە و نیشتمانی ئەمریکا دەژمێردرێن.

لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا کە تەکووزی و کولتوورێکی کفراوی بە سەر جیهان دا زاڵ بووە و گەیشتنی کۆتایی دنیا نزیکە، دەبێ خەباتێکی نەبڕاوە و شەڕێکی پیرۆز دەست پێ بکرێ. بەڕێوەبردنی ئەم ئەرکە مەزنە لە پلەی یەکەم دا لە ئەستۆی شوێنکەوتووانی راستەقینەی عیسا مەسیح و هاووڵاتییە رەسەنە ئەمریکاییەکانە کە هەموویان سپی پێستن. کەواتە لە

ئیدیۆلۆژیی بزووتنەوەی ناوبراو دا، هەم باڵادەستیی سپی پێستەکان سەلمێنراوە و پێی لە سەر داگیراوە و هەم بنواشە و بایەخە ئایینییەکانی مەسیح (Castells, 87 – 94).

بە گشتی لە بزووتنەوەی نیشتمانپەروەرانەی ئەمریکادا وەك بزووتنەوە تایبەتگەرایانە کولتوورییەکانی دیکە لە سەر توخمە تاڕادەیەك جێگیرەکانی وەك خاك، ئیتنیسیتە، ڕەگەز، ئایین و مێژوو پێ داگیراوە. "نیشتمانپەروەرانی" ئەمریکا لە ڕاستی دا پرۆسەی بەجیهانیبوون لە هێندێك ڕووەوە بە زیانبار دەزانن و چارەیەك بێجگە لە دروست کردنەوەی کۆمەڵگەی بە پێی کولتوور و نەریت شك نابەن. بە دەربڕینێکی دیکە ئەوان لە خاکی خۆیان لە بەرانبەر بایەخە گشتی و جیهانگەرایانەکان دا بەرگری دەکەن و ئۆگرییان بە کۆمەڵگەیەکی خۆبەڕێوەبەر و تاڕادەیەك داخراو هەیە.

سێهەمین بزووتنەوەی دژە تەکووزی کە کاستێل تاوتوێی دەکا، بزووتنەوەی ئایومی ژاپۆنە. هەروەك بزووتنەوەی نیشتمانپەروەرانەی ئەمریکا، ئەم بزووتنەوەیەش بە هۆی ڕووداوێکی سامناکەوە دەرکەوت. لە بیستەمی مارسی ١٩٩٥دا لە سێ خاڵ لە هێڵی ژێرزەویی تۆکیۆ دا، خەڵك بە گاز کەوتنە بە پەلامار کە مردنی دوازدە کەس و زیان لـێ کەوتنی پێنج هەزار کەسی لـێکەوتەوە. چەند مانگ پێشتریش ڕووداوێکی هاوشێوە ڕووی دابوو و پۆلیسی ژاپۆن ئەم هێرشەی خستە ئەستۆی گرووپی ئایوم (Castells, 1997: 98).

گرووپی ئایوم کە لە بەستێنی یەکێك لە دەوڵەمەندترین، میانەرەوترین و هاوچەشنترین کۆمەڵگەکانی جیهان دا پێك هات، ئەندام و لایەنگرانی جۆراوجۆری سەر بە توێژ و چینە جۆراوجۆرەکان لە خۆ دەگرت. دامەزرێنەر و ڕێبەری گرووپەکەش شوکو ئاساهارا بوو. ئەگەرچی ئاساهارا زوو دەست بە سەر کرا، بەڵام گرووپەکە درێژەی بە ژیانی خۆی دەدا و بیرو بۆچوونەکانی ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤەکان دەخاتە ژێر کارتێکەرییەوە. ئەم بیرو بۆچوونانە لە ڕاستی دا ئایدیۆلۆژی بزووتنەوەی ئایوم پێك دێنێ.

ئەندامان و شوێنکەوتووانی بزووتنەوە لەم بڕوایە دان کە لە ئاکامی ڕکەبەرایەتیی کۆمپانییە ژاپۆنییەکان و ئیمپریالیسمی ئەمریکا بۆ دامەزراندنی تەکووزییەکی نوێی جیهانی و حکوومەتێکی جیهانیی یەکگرتوو، کۆمەڵگەی جیهانی، یەك لەوان ژاپۆن، بەرەو تێداچوون دەڕوا و گەندەڵی و بێ ڕەوشتی هەموو جێگایەك دەگرێتەوە. مرۆڤەکان ڕەسەنایەتیی خۆیان دەدۆڕێنن و پیس دەبن، ژیانی ئاساییش جۆرێك گومانە و پڕە لە دەرد و ڕەنج و ئازادی و



بەختەوەری ڕاستەقینە بوونی نیە. کەواتە بڕوادارە ڕاستەقینە ژاپۆنییەکان دەبێ ڕاپەڕن تاوەکوو سەرەتا ژاپۆن و دواتر هەموو جیهان ڕزگار بکەن (Castells, 1997: 99).

بۆ بە جێ گەیاندنی ئەم ئەرکە گرنگە لە بەرەبەری کۆتایی دنیا دا و لە ڕێگای شەڕێکی خوێناوی و توندەوە، دەبێ جۆرێك لە مرۆڤ پەروەردە بکرێ کە ڕیشەی لە مەعنەویەت و خۆدروستکردن دابێ. لەم پەروەردە و خۆدروست کردنە دا لە سەر دۆزینەوە و پەوەردەکردنی لایەنی ڕۆحی و هەروەها چەمکی deliverance، بە واتای ئازادی و بەختەوەریی ڕاستەقینە پێ داگیراوە. بە پێی ئایدیۆلۆژیی بزووتنەوەی ئایوم وەدەستهێنانی حەقیقەت تەنیا لە ڕێگای دۆزینەوە و چلەکێشانەوە (ریاضت) دەلوێ و بڕوا بە توانایی بان سروشتی ڕێنوێنیکەریش پێویستە (Castells, 1997: 101).

ئەگەرچی ئەم سێ بزووتنەوەیە لە لایەنی بەستێنی مێژوویی و کولتوورییەوە جیاواز و ناوێکچوون، بەڵام وێکچوون گەلێکیشیان هەیە کە هەر سێکیان دەکەونە ڕیزی تایبەتگەراییە کولتوورییەکانەوە. هەر سێ بزووتنەوەکە دوژمنێکیان دەس نیشان کردوە کە نوێنەری تەکووزی و کولتووری جیهانییە. زاپاتیستەکان ئیمپریالیسمی ئەمریکا و حکوومەتی دەستکردی ئەو بە دوژمن دادەنێن، دوژمنی ژمارەیەکی بزووتنەوەی نیشتمانپەوەرانە ئەمریکا، حکوومەتی فیدرالی ئەم وڵاتە و دامەزراوە نێونەتەوەییەکانە و بە پێی ئایدیۆلۆژیی بزووتنەوەی ئایومیش کۆمپانیا فرە نەتەوەییەکان و ئیمپریالیمسی ئەمریکا کۆمەڵگەی ژاپۆن لە نێو دەبەن. ئەم دوژمنانە لە ڕاستی دا نوێنەرانی تەکووزیی نوێی جیهانین کە هەوڵ دەدەن بە پێك هێنانی حکوومەتێکی جیهانی، سەروەری و سەربەخۆیی و ڕەسەنایەتیی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان لە نێو بەرن (Castells, 1997: 105).

لە هەرسێك بزووتنەوە دا لە سەر شوناسی ڕەسەن پێ دادەگیرێ؛ زاپاتیستەکان خۆیان بە "خۆجێیە سوورپێستە میکزیکییەکان" دەزانن؛ "نیشتمانپەوەر"ەکان خۆیان بە "هاووڵاتیی ڕەسەنی ئەمریکایی" لە قەڵەم دەدەن؛ و ژاپۆنییەکانی شوێنکەوتووی بزووتنەوەی ئایوم، کۆمەڵی خۆیان بە "کۆمەڵێکی مەعنەوی پێکهاتوو لە بڕوادارە سەربەست و ئازادەکان" دادەنێن. لە ڕاستی دا ئەم بزووتنەوەیە لە سەر شوناسی ڕەسەن، تایبەتمەنێتی کولتووری و پێویستیی پاراستن و پاڵاوتنی ئەم شوناس و کولتوورە بونیاد نراون. ئەوان لە ڕاستی دا شوناس دەکەونە تەوەری کۆکردنەوەی لایەنگرانیان بۆ پەرچەکردار نیشان دان لە بەرانبەر دوژمنێکی دیاریکراو دا (Castells, 1997: 105 – 106).

گرووپ و بزووتنەوەی واش هەن وێکچوونیان لەگەڵ ئەم بزووتنەوانە هەیە، بەڵام لە ئاستێکی بەرتەسك دا کار دەکەن و ئەندام و شوێنکەوتوویان کەمە: جیاییخوازە بوودابییەکانی تەبەت لە چین، توندرۆیە بوودابییە سینهالەکان لە سریلانکا، سوپای بەرگریی جۆزێف نوی لە ئوگاندا و چەکدارە مائۆئیستەکانی "رێگای درەوشاوە" لە پێرۆ. ئەوانە بزووتنەوەگەلێکی تایبەتگەران کە هەرچەند نێوەرۆکی ئایینیان نیە، بەڵام بۆ ئامانج و مەبەستەکانی خۆیان لە دەمامکی ئایینیش کەڵك وەردەگرن و توندو تیژیش بە کار دێنن (Peterson, 1999: 90).

دەستەیەکی دیکە لە گرووپەکان کە ئێستاکە پێیان دەگوترێ گرووپ گەلی بێزاری[57]، دەبێ بە هێماکانی تایبەتگەرایی کولتووری لە قەڵەمیان بدەین. ئەم گرووپانە لە بیاڤە جۆراوجۆرەکان دا ئامادەییان هەیە و تاکەکان و کۆمەڵە ئایینی، ئێتنیکی یان نەتەوەییەکانی دیکە دەترسێنن. ئەگەرچی هەموو ئایینە گەورەکانی دنیا کارکردی ئەم جۆرە گرووپ و رێکخراوانە مەحکوم دەکەن، بەڵام شوێنکەوتوانی ئەم گرووپانە کارکردی خۆیان بە بەرێوەبردنی ئەرك و پێ ئەسپێردراوی ئایینی دەزانن. دیارە گرووپەکانی بێزاری لە چوارچێوە سیستمە ئایدیۆلۆژیکییەکانی وەك نازیسم، ستالینیسم و یان مائۆئیسم دا پێك دێن (Peterson, 1999: 91).

زۆر لەو گرووپانە نەریت و رێورەسمی ئەوتۆیان هەیە کە بە هۆی ئەوانەوە دەبنە خاوەن مانا و ئامانج و هەست بە گرێدراوی بە گرووپ و کۆمەڵەیەکی گەورەترەوە دەکەن. بۆ وێنە نێۆ نازییەکان رێپێوانی رەشاییانە بەرێوە دەبەن، پەرستنی رێبەرانی رابردوو لە نێو ژمارەیەك لە گرووپە سەرەکییەکانی دا بۆتە باو و گرووپ گەلێکیش خاوەنی دەقی پیرۆزی وەك **شەڕی من**ـی هیتلێر یان کتێبی **سووری بچووکی** مائۆن. زێدەڕۆیی و پەنابردن بۆ توندو تیژیش بۆ ئەندامانی زۆربەی ئەم گرووپانە کارێکی ئاسایی و تەنانەت پێویستە. بۆ وێنە ژمارەی کردەوە توندوتیژانەکانی گرووپە توندرۆیەکان لە ماوەی حەوت ساڵدا ( لە ١٩٨٩ تا ١٩٩٦) نزیکەی دە هێندە (لە ٢٥٤ جارەوە بۆ ٢٥٣٥ جار) زیادی کردوە (Peterson, 1999: 92).

ژمارەیەك لە تیۆریستەکان، نژادپەرستییە نوێیەکان بۆ وێنە لە ئەورووپاش بە جۆرێك تایبەتگەرایی کولتووری دەژمێرن. تایبەتگەرایی ئەم جۆرە نژادپەرستییە بە تایبەت کاتێك دەردەکەوێ کە لەگەڵ نژادپەرستیی کلاسیك بەراوردی بکەین. نژادپەرستی کلاسیك دەی گوت کە پێ ئەسپێردراوی جیهانی کردن و شارستانی کردنی لە سەر شانە کە لە رێگای کلۆنیالیسم

57- hate groups





لە دەرەوە و ئەندازیاریی کۆمەڵایەتیی هاوشێوەسازانە لە نێو خۆدا جێ بە جێ دەبێ. لە راستیدا ئامانجی سەرەکیی ئەم نژادپەرستییە ئەوە بوو کە بە گۆڕینی جیاوازی بە وێکچوون، "ئەوی دیکە" لە نێو ببا (Silverman, 1999: 41).

بەڵام نژادپەرستیی نوێ تایبەتگەرایانەیە و چەمکی جیاوازیی دەروونی و بێ ئەملاو ئەولای نێوان گرووپەکان لە ناوەندی ئەم نژادپەرستییە دایە. لە روانگەی نژادپەرستە نوێیەکانەوە، جیاوازی گرفتێکە کە یان دەبێ بۆ هەمیشە جێگیر بێ یان بە تەواوی لە نێو بچێ. هەر بەم هۆیە لە نژادپەرستیی نوێ دا کە نژادپەرستیی پۆست مۆدێرنیشی پێ دەگوترێ، بیانە دەبێ بچێتە دەرەوە. بە گوتنێکی دیکە نژادپەرستیی پۆست مۆدێرن لە سەر دەروون باوەڕیی کولتووری دامەزراوە کە پێناسەکردن و سنووردارکردنی خۆی و دەرکردنی "بیانە" بە گرنگترین پێ ئەسپێردراو ئەرکی خۆی دەزانێ (Silverman, 1999: 47).

* * *

هەموو ئەو بزووتنەوە و ئاکارە کۆییانەی کە لە ژێر ناوی بزووتنەوەی ئێتنیکی، نەتەوایەتی، ئایینی، نژادپەرستانە و هی وەك ئەوان دا تاوتوێمان کردن بە جۆرێك تایبەتگەرایی کولتووری – کۆمەڵایەتی دەژمێردرێن. دیارە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بەو نموونەی ناومان بردن کورت نابنەوە. بێ گومان ژمارەی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی جیهان دا زۆر زیاتر لەم ژمارەیەیە و ساڵ لەگەڵ ژمارەیان زیاد دەکا. بەڵام لەم بەشەدا بە پێی باسەکە و ئەو سەرچاوانەی لەبەردەست دان تەنیا ئاماژە بەو تایبەتگەراییانە کراوە کە لە لایەنی جۆراوجۆرەوە گرنگییان هەیە یان ئەوە کە بە پێی هۆکارگەلێك، زیاتر لە تایبەتگەراییەکانی دیکە ناسراون.

خاڵێکی دیکە کە لە کۆتایی ئەم بەشەدا دەبێ وەبیری بێنینەوە و لە نێوەرۆکی باسەکەش دا دەردەکەوێ، جۆراوجۆریی بەرچاوی تایبەتگەراییە کولتوورییەکانە. هەروەك باس کرا بەشی بەرچاوی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان لە بزووتنەوەکان، ئالۆزییەکان و بەگژداچوونەوە ئێتنیکی و ناسیۆنالیستیەکان پێك دێ کە ئەم دەستەیە لە تایبەتگەراییەکان بە جۆر و دەستەی لاوەکیتر شیاوی دابەش کردنە. بەشی بەرچاوی دیکەی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بزووتنەوە بونیادگەرایانە ئایینییەکانن کە جگە لە جۆرەکانی بونیادگەرایی لە چوارچێوەی ئایینە گەورەکانی جیهان دا، بونیادگەرایی دیکەش لە خۆ دەگرن. لە کۆتایی دا لە پەنا ئەم

دوو دەستەیە لە تایبەتگەراییە پڕئەژمار و جۆراوجۆرەکان دا باسی تایبەتگەرایی کولتووریی دیکەش کرا کە بۆ خۆیان هەلگری چەشنی جیاواز و جۆراوجۆرن.

بەستێنی کۆمەڵایەتیی تایبەگەراییەکانیش جیاوازە. هێندێك لە تایبەتگەراییەکانیش لە کۆمەڵگە پێشکەوتوو و دەوڵەمەندەکان دا پێك دێن و ژمارەیەکی دیکەش لە کۆمەڵگە هەژار و پەرەنەگرتووەکان دا. هەم وڵاتانی تازە دامەزراو و بەستێنی تایبەتگەراییە کولتوورییەکانن و هەم وڵاتە کۆنەکان. جاری واشە ئەو کۆمەڵگایانەی خاوەنی فرەیی ئیتنیکی و ئایینین گۆڕەپانی کاری تایبەتگەراییە کولتوورییەکانن و هێندێك جار ئەو کۆمەڵگایانەی تاڕادەیەك هاوچەشن و یەکدەسن. هۆکار و نیشانە کۆمەڵایەتی— ئابوورییەکانیش پێوەندییەکی ماناداریان لەگەڵ تایبەتگەرایی کولتووری دا نییە.

تەوەرێکی دیکەی جۆراوجۆریی تایبەتگەراییەکان، بیاڤ و خێرایی کارکردنیانە. بیاڤی کار و کارتێکەریی زۆر لە تایبەتگەراییەکان، بەربڵاو (نەتەوەیی، ناوچەیی و تەنانەت جیهانی)ە و تایبەتگەرایی گەلێکی پڕژماریش لە پانتاییەکی بچووك دا سنووردار دەکرێن. هەروەها هێندێك جار توندرۆیی و توندوتیژی تەوەری کاری تایبەتگەراییەکان پێك دێنێ و ئەم رووکارە لە ئایدیۆلۆژییەکانیشیان دا رەنگ دەداتەوە. نموونەی واش هەیە کە میانەرەوی و خەباتی ئاشتیخوازانە لە رۆژەڤی تایبەتگەراییەکان دایە و توندو تیژی و زێدەرۆیی— ئەگەر هەشبێ— لاوەکییە.

تایبەتگەراییە کولتوورییەکان لە لایەنێکی دیکەشەوە جیاوازن. ئەگەرچی نزیکەی هەموو تایبگەراییەکان جۆرێك هەڵسوکەوتی کۆیی پەرچەکردارانە و بەرگرییانەن، بەڵام هێندێك جار ئەم کردار و بەرگرییە گرێدراوی پاراستنی شوناس، رەسەنایەتی و خاکێکی دیاریکراوە. لە زۆربەی تایبەتگەراییە ئیتنیکییەکان دا دەتوانین ئەم تایبەتمەدییە ببینین. بەڵام لە ژمارەیەکی دیکە لە تایبەتگەراییەکان دا باس لە ئەرکێکی جیهانی دەکرێ و تایبەتگەراکان لە سەر خۆیان بە پێویست دەزانن دوای رزگارکردنی ئایین، خاك یان نەتەوەی خۆیان، باقیی جیهانیش رزگار بکەن. لە بونیادگەراییە ئایینییەکان دا ئەم تایبەتمەندییە پڕڕەنگ ترە.

ئەم تایبەتمەندییە هاوبەشانە کە ژمارەیان زیادتریشە بکەین، هەموویان نیشانەی ئەوەن کە تایبەگەراییە کولتوورییەکان پەرچەکردار بەرانبەر بە پرۆسەی بەجیهانیبوون. ئەگەرچی بگۆڕی دیکەش لە پێکهاتن و پەرەگرتنی ئەم تایبەگەراییانەدا کاریگەرن، بەڵام ئەم تایبەتمەندییانە نیشان دەدەن کە لە روانگەی گشتییەوە دەتوانین پرۆسەی بەجیهانیبوون بە بگۆڕی سەرەکی لە





قەڵەم بدەین. لە بەشی سێهەمی ئەم توێژینەوەیەدا بە پشت بەستن بەو تایبەتمەندییانەی ناویان برا دەری دەخەن کە ئەم پێوەندییە چۆن دادەمەزرێ.

# بونیادنانەوەی کولتووری خۆ

هەروەك لە بەشی دووهەمدا باس کرا، نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەم، بە تایبەت دەیەکانی کۆتایی ئەو دەتوانین بە خاڵێکی وەرچەرخان لە مێژووی کولتووریی جیهان دا بژمێرین. لەم قۆناغەدا، بە پێچەوانەی وێناکردن و پێش بینیی زۆر لە تیۆریستە لیبراڵ و مارکسیستەکان کە وادەی کەمڕەنگتر بوون و پووکانەوەی بێ ئەملاو ئەولای کولتوورەکانیان دەدا، دەکرێ بڵێین لە هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دا، توخم و هێزە کولتوورییەکان جێگایەکی بەرز و بەرچاویان وەدەست هێناوە. زەقتر بوونی کولتوور نەك هەر لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا، بەڵکوو لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمیش دا درێژەی بووە.

بەم پێیە ژمارەیەك لە تیۆریستەکان و کولتوورتوێژەکان رۆڵ و گرنگیی بەرچاوی کولتوور بە یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگەی هاوچەرخ دادەنێن. ئالێن تۆرێن، کۆمەڵناسی دیاری فەڕانسەیی، گرنگترین لایەنی جیاکەرەوەی کۆمەڵگەی سنعەتی لە کۆمەڵگەی پاش سنعەتی لە نێوەرۆکی دژایەتی لەم دوو جۆرە کۆمەڵگەیەدا دەبینێ. لە روانگەی ئەوەوە کۆمەڵگەی سنعەتی لەگەڵ دژایەتی لە سەر بڵاوکردنەوە(دابەش کردن) راهاتوە، بەڵام کۆمەڵگەی پاش سنعەتی تایبەتمەندییەکەی دژایەتییە کولتوورییەکانە (Foweraker, 1995: 13). لە تیۆری پێکدادانی ژیارەکان و تیۆرە هاوشێوەکانی دا قسە لە رۆڵی تەوەریی کولتوور کراوە. هەروەها پۆست مۆدێرنەکان، گرنگترین لایەنی ژیانی کۆمەڵایەتی لە سەردەمی پۆست مۆدێرن دا بە لایەنی کولتووری دەزانن (Dalby, 1999: 133). لە بەرهەمەکانی تیۆریستەکانی بەجیهانیبوونیش دا جیهانی کولتووری و کولتووری جیهانی بە بابەتی گرنگ دەژمێردرێن.





ئەم گرنگی پەیداکردن و زەقبوونەوەیەی کولتوور کە لە لایەن زۆر لە تیۆریستەکانەوە سەلماوە و پێی لە سەر داگیراوە، بە گشتی سێ لایەن لە خۆ دەگرێ. لایەنی یەکەم، هاوچەشن و یەکدەست بوونی کولتووری جیهانە کە پێوەندیی بە پرۆسەی بەجیهانیبوونەوە هەیە. بە گوتنێکی دیکە، لە جیهانی هاوچەرخ دا کولتوور لەم رووەوە گرنگیی هەیە کە پرۆسەی بەجیهانیبوون کولتوورێکی دیاریکراو جیهانی دەکا و کولتوورەکانی دیکە ناچار دەکا بەرگری و بەرەنگاری بکەن. توخمەکان و بەشە سەرەکییەکانی ئەم کولتوورە بەجیهانی بووە لە کولتووری رۆژئاوایی و بەتایبەت جۆرە ئەمریکاییەکەی پێك دێ.

لایەنی دووهەمی گرنگیی کولتوور لە جیهانی ئێستادا پێوەندیی بە چڕی یا زێدە بەرهەمی کولتوورییەوە هەیە. پرۆسەی بەجیهانیبوون لە هەمان کاتدا کە هەڵگری هێزە هاوچەشنکەرەکانە جیهان دەکاتە مەیدانێك بۆ خستنە بەرچاوی کاڵا کولتوورییە جۆراوجۆرەکان. لەم بازاڕە بەرینە دا هەرچەند هێندێك لە کولتوورەکان ئامادەییەکی بەرچاویان هەیە، بەڵام کۆسپێکی جیدی لە سەر رێگای ئامادەیی کولتوورەکانی دیکە دا نیە. مرۆڤی ئێستا لە هەر جێگایەکی ئەم جیهانە بەرینەش بێ، کەم تا زۆر دەتوانێ بەرهەمە کولتوورییە جۆراوجۆرەکان بە کار بێنێ. هێنرز گوتەنی مرۆڤ سەرەنجام پێی ناوەتە جیهانێکەوە کە وەك موزاییکێکی کولتووری وایە کە پارچەی جۆراوجۆری لە خۆگرتووە (Hannerz, 2000: 331).

زانیارییە کۆکراوەکانی پێوەندیدار بە گشتگەرایی کولتوورییەوە باس لەوە دەکەن کە هێندێك جار تاك و گرووپەکان دنیای کولتووریی خۆیان بە تێکەڵاوکردن و ئاوێتەکردنی توخم گەلێك لە کولتوورە جۆراوجۆرەکان دروست دەکەن و کولتوورەکان پێکەوە ژیانێکی ئاشتییانە و دانوستاندنێکی بونیادنەر ئەزموون دەکەن. بەڵام زۆرجار، مرۆڤەکان لە ئاوێتەبوونی کولتووری دەترسێن و کولتوورەکانیش هەوڵ دەدەن بە هەر نرخێك کە بکرێ سنوورەکانی خۆیان لە سەر کولتوورەکانی دیکە دابخەن و هەر چەشنە نیشانەیەکی کولتووری بێگانە بسڕنەوە. بەم پێیە چەشنی جۆراوجۆری ئاڵۆزی، دژایەتی و بەرەنگاربوونەوەی کولتووری (تایبەتگەراییە کولتوورییەکان) سەر هەڵ دەدەن کە سێهەمین لایەنی گرنگایەتی و زەقێتیی کولتووریی پێك دێنن.

ئەم گرنگی پەیدا کردنە زێدەرروویە، پێشوازیی توێژەران لە پرس و بابەتە کولتوورەکانی بە دواوە بووە. لە دەیەکانی دوایی دا هەوڵی بەربڵاو بۆ بونیادنانەوەی نموونەکان و تیۆرە کولتوورییە باوەکان و دروست کردنی تیۆری نوێ دراوە تاوەکوو ئاڵۆزیی بابەتی کولتووری باشتر هەست پێ بکرێ و روون بکرێتەوە. توێژینەوەی بابەتیانەی پڕ ژماریش لە بیاڤە

جۆراوجۆرە کولتوورییەکان دا ئەنجام دراوە. یەکێك لە بابەتە بەرچاوەکان لە پانتایی ئەم جۆرە تیۆری دارشتن و توێژینەوانەدا، تایبەتگەرایی کولتوورییە.

لەم توێژینەوەیەدا، بێجگە لە دەس نیشان کردن و لێ دوان سەبارەت تایبەتگەراییە کولتوورییە جۆراوجۆر و پڕ ئەژمارەکان هەوڵیش دراوە ئەوان شی بکرێنەوە. بەڵام لە بەر ئەوەی کە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان یەکێك لە ئاڵۆزترین دیاردە کولتوورییەکانن، بە شێوەی جۆراوجۆر شی دەکرێنەوە. ئەم شیکردنەوانە بە هیچ شێوەیەك بێبەری لە حەقیقەت نین و لە پێوەندی لەگەڵ ژمارەیەك لە تایبەتگەراییەکان دا کارایی و توانای باشیان هەیە. لە دێڕەکانی خوارەوەدا ئاماژە بە شیکاریی دوو جۆری سەرەکی دەکەین.

## تایبەتگەراییە کولتوورییەکان پەرچەکردارێك بەرانبەر بە کەموکووڕییەکانی جیهانی هاوچەرخ

### پەرچەکردارێك لە ئاست نایەکسانی و جیاوازیدانانەکان دا

دەستەیەك لە کولتوورتوێژەکان و تیۆریستە کۆمەڵایەتییەکان بەردەوامی و تەنانەت توندتربوونی نایەکسانی و جیاوازیدانانەکان لە کۆمەڵگەی جیهانی دا بە هۆکاری سەرەکیی تایبەگەراییە کولتوورییەکان دەزانن. لە روانگەی ئەوانەوە نوێبوونەوە و سیستمی سەرمایەداری زۆر پێشکەوتووە و گۆڕانی بە سەرداهاتوە، بەڵام هێندێك لە بنچینەییترین پرسەکانی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی جیهان هەروەك خۆیان مانەتەوە. لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا کە نوێبوونەوە و سەرمایەداری دەکرێ بگوترێ بەجیهانیبوون و ئاوەزمەندێتیی ئامێری بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر بەرەو پێش چووە و نایەکسانی و جیاوازیدانانە کۆمەڵایەتییەکان دیاردەیەکی ئاسایی و جیهانداگرن.

لە راستی دا لۆژیکی نایەکسانیهێنەر و جیاوازیخوڵقێنی سیستمی سەرمایەداری لە نێو نەچووە و هەر وا چالاك و بەهێزە. گۆڕانکاری و رووداوە مێژووییەکانی چەند دەیەی دوایی دەری دەخەن کە بە هەر رادەیەك سیستمی سەرمایەداری لە ئاواتی لە مێژینەی خۆی کە بوون بە سیستمێکی جیهانییە نزیك بۆتەوە، نایەکسانی و جیاوازیدانانە ئابووری—کۆمەڵایەتییەکانیش بە شێوازی جۆراوجۆر هەم دیسان بەرهەم هاتوونەتەوە و درێژەیان کێشاوە. ئەگەرچی ئەم نایەکسانی و جیاوازیدانانە بە شێوازی جۆاروجۆر لە وڵاتەکان، ناوچەکان و





وشکاییەکان بڵاوبۆتەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك کە تایبەت بە ناوچە یان وشکاییەکی دیاریکراو نین و یەکێك لە تایبەتمەندییە زەقەکانی جیهانی هاوچەرخ پێك دێنن.

ژمارەیەك لە توێژەران تەنانەت واوەتریش هەنگاویان ناوە، لە روانگەیەکی بەراوردکارییانەوە دەڵێن نایەکسانی و جیاوازیدانان لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا زیادی کردوە. بە رای ئەوان، بە پێچەوانەی بۆچوون و بڕوای باو، ئەو نایەکسانی و جیاوازیدانانەی کە ئێستاکە لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی جیهانی دا هەیە، بە بەراورد لەگەڵ دەیەکان و سەدەکانی رابردوو زیاتر و بەگوڕتر بووە. لە کۆمەڵگە ساکارەکانی رابردوودا، رادە و پێوانە و جۆری نایەکسانییەکان لە خوارەوە و کەم ژمار بوون. لەو کۆمەڵگایانە دا تایبەتمەندییە ژیانەکی و پێداویستییە سەرەتاییەکانی مرۆڤ نموونەی بەکارهێنانی خەڵکیان دیاری دەکرد، بۆ وێنە هەبوون یان نەبوونی ئەسپێك یان بەرینایی زەوییەکی کشتوکاڵی و ژمارەی ئاژەڵەکان و... گرنگترین نیشانەکانی نایەکسانی بوون.

بەڵام لە کۆمەڵگەی جیهانیی ئێستادا کە لە ژێر زاڵێتیی کولتووری بەرخۆی(بەکارهێنەکی) دایە، هۆکارە جیاوازی خوڵقێن و نایەکسانی هێنەرەکان پڕ ژمار و جۆراوجۆرن. ئێستاکە بەشی مەزنی ئابووریی جیهان ئەو "سنعەتانە" پێکی دێنن کە گرێدراوی پێداویستییە دووهەمەکانی مرۆڤن. بەم پێیە ژمارەیەکی زۆر لە خزمەتگوزاری، کەرەستە، ئامراز و کاڵا بەرهەم هاتووەکانیش بۆ دابین کردنی ئەم چەشنە پێداویستییانەن. لە راستیدا ئەرکی سەرەکیی ئابوورییەکی ئەوتۆ دابین کردنی ئەو پێداویستییە زێدەروویانەیە کە کولتووری بەرخۆری دروستی دەکا. لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکان دا کە تەنانەت شوناس پەیداکردنیش لە سەر بنەمای بەکارهێنان راوەستاوە، بێ توانایی لە دابین کردنی ئەم پێداویستییانە زۆر دژوارە.

هەرچەند بە شێوەیەکی گشتی خەڵکی جیهان بە بەراورد لەگەڵ رابردوو دەوڵەمەندتر و بەتواناتر بوون، بەڵام رادەی هەژاران و بێ توانایان بە بەراورد لەگەڵ کۆی حەشیمەتی جیهانیش هەر بەو رادەیە و تەنات زیادتر زیادی کردوە. بە هەر رادەیەك کە بە ژمارەی پێداویستییەکان و ئەو کاڵایانەوە کە خراونەتە رووە زیاد بێ، ژمارەی دەست رانەگەیشتووەکان و بەو کاڵا و خزمەتگوزارییانەش زیاتر دەبێ. لەم جیهانە دا کە تێی دا دەژین، کەلەبەری نێوان پێداویستییە پێکهاتووەکان و پێداویستییە دابین کراوەکان بەشێوەیەکی بەرچاو بەرینتر و نایەکسانی و جیاوازیدانانە کۆمەڵایەتییەکان پڕ ژمارتر و جۆراوجۆرتر دەبن.

ئەگەر بتوانین گومان بخەینە سەر ئیدعای پێوەندیدار بە زیادبوونی ڕێژەیی نایەکسانی و جیاوازیدانانەکان، گومان کردن لە تاقەت پڕووکێنتر بوونی ئەوان سانا نیە. لە بەر ئەوەی کە نایەکسانی شتێکی ڕێژەییە و مرۆڤەکان زۆرتر لە ڕێگای بەراوردکردن و هەڵسەنگانەوە لە نایەکسانییەکان ئاگادار دەبن، هەرچەند ڕادەی پێوندییەکان و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کەمتر و سنووردارتر بێ، ڕادەی ئاگادار بوون و هەست کردن بە نایەکسانییەکان کەمتر و هەڵکردن لەگەڵیان ساناتر دەبێ. لە ڕابردوو دا کە مرۆڤەکان لە فەزایەکی کۆمەڵایەتیی زۆر بەرتەسك و تاڕادەیەك داخراو دا دەژیان ڕادەی وشیاری سەبارەت بە نایەکسانی و جیاوازیدانانەکان لە خوارەوەتر لە ڕادەی نایەکسانی و جیاوازیدانانەکان بوو. ئەم دۆخە لە کەم کردنەوەی ناڕازیبوون لە دۆخی باو و شیاوی هەڵکردنترکردنی نایەکسانی دا دەورێکی بەرچاوی هەبوو.

بەڵام لە جیهانی هاوچەرخ دا کە پێوەندییەکان و ڕاگوازتنی زۆر خێرا لە پانتایی جیهانی دا تایبەتمەندییەکەیەتی، ئاگاداریی خەڵك لەو نایەکسانی و جیاوازیدانانەی هەن زۆر زیاتر بووە. بوونی ئامێر و ئامراز زۆر پێشکەوتووەکانی پێوەندی، ئەو توانایە بە تاك و گرووپە جۆراوجۆرەکان دەدا کە نەك هەر لەگەڵ کەرەستەکان، خزمەتگوزاری و کاڵا زۆر و جۆراوجۆرە بەرهەمهاتووەکان ناسیاویان هەبێ، بەڵکوو توانای کڕینی خۆشیان بە بەراورد کردن لەگەڵ توانای کڕینی دیتران هەڵسەنگێنن. زۆر لەو وشیارییانەی لە سەر نایەکسانییە نەتەوەیی، ئیتنیکی، ئایینی، ناوچەیی و تەنانەت وشکاییانە(کیشوەری) بونیادنراون، ئاکامی ئەم چەشنە هەڵسەنگاندن و پێك پێوانە کردنانەن.

بەردەوامی، توندتر بوون و گۆڕانی نایەکسانی و جیاوازیدانانەکان لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا لە رووکارگەلی دیکەشەوە لە لایەن توێژەرانەوە تاوتوێ کراوە. بۆ وێنە جۆرەکانی نایەکسانی و جیاوازیدانانە ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان، ئاستە جۆراوجۆرەکانی نایەکسانی و جیاوازیدانانەکان و شێوەی دووبارە بەرهەمهاتنەوەی ئەم جۆرە نایەکسانی و جیاوازیدانانە بابەتەکانی توێژەرانی بواری زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکان پێك دێنن. سەرەڕای جیاوازی و جۆراوجۆریی بەرچاو، ئەم دەستەیە لە توێژەران سەبارەت بە نایەکسانی و جیاوازیدانان لە کۆمەڵگەی جیهانیدا قسە دەکەن کە لە دێڕەکانی دواتردا ئاماژە بە هێندێك لە ڕاو بۆچوونەکانیان دەکەین.





دوورین ماسی بە سوود وەرگرتن لە چەمکی "هەندەسەی دەسەڵات"* ئەم دیاردە گرنگە تاوتوێ دەکا. ئەو پەستێوتراویی زەمەن– فەزا بە زەقترین تایبەتمەندیی جیهانی هاوچەرخ دادەنێ کە بەرهەمی پێشکەوتنە سەرسووڕهێنەرەکانی تێکنۆلۆژیی پێوەندییەکان و ڕاگوازتنە. ئەم پەستێوتراوییە ئەگەرچی مرۆڤەکان لێك نزیك دەکاتەوە، بەڵام نایەکسانی و جیاوازیدانەکان نەك هەر لە نێو نابات، بەڵکوو ئاڵۆزتر و زیاتریشیان دەکا. بە دەربڕینێکی دیکە پەستێوتراویی زەمەن و فەزا دەستەبەرکەری جۆرێك جیاکردنەوە و هەڵاواردنی کۆمەڵایەتییە کە لە پێوەندییە لێك جیا و جیاوازەکانی تاکەکان و گرووپەکان لەگەڵ هێزەکان و هۆکارەکانی پەستێوتراویی زەمەن – فەزاوە سەرچاوە دەگرێ (Massey, 1996: 320).

بە دەربڕینێکی ڕوونتر، لە بوارە جۆراوجۆرەکانی دنیای پێوەندییەکاندا، پێگە و هەڵکەوتوویی تاکەکان و گرووپەکان جیاوازە. وەك دەبینرێ ژمارەیەکی کەم لە خەڵك بەرهەمهێنەر و کۆنترۆڵکەری بزاوتەکان، شەپۆلەکان و پێوەندییەکانن و ژمارەیەکی زیاتریش تەنیا بەرخۆر و چاولێکەرن. ماسی لەم ڕوانگەیەوە سێ ئاست یان پلە دەس نیشان دەکا. بە ڕای ئەو چێ کەرانی جێت، نێرەرانی فاکس و ئیمایل، پێکهێنەرەکانی کۆنفڕانسە نێونەتەوەییەکان، بڵاوکەرەوەکانی فیلم، هەڵسووڕێنەرانی ڕایەڵکە هەواڵییە بەربڵاوەکان، ڕێکخەرانی سەرمایەدانانە گەورە نێونەتەوەییەکان و...لە [پلەی یەکەم] دان.

پلەی دووهەم هی ئەو تاك و گرووپانەیە کە پرۆسەی پەستێوتراویی فەزا– زەمەن کۆنترۆڵ و ڕێنمایی ناکەن، بەڵکوو تەنیا کەلکی لـێوەردەگرن. لە پلەی سێهەمیش دا کۆمەڵانی بێ بەش و هەژار هەڵکەوتوون کە چاولێکەری ئەم پرۆسەیەن و تەنانەت لە ژێر کارتێکەریی نەرێتیی ئەو دان. دیارە ئەم پێکهاتە زنجیرە پلەییە لە بیاڤێکی دیاریکراو دا کورت نابێتەوە و لە هەموو بیاڤەکان دا هەیە، چونکە لە ڕێگا و بە شێوازی جۆراوجۆر و جیاوازەوە دەکەونە چوارچێوەی پەستێوتراویی زەمەن– فەزاوە (Massey, 1996: 321).

خوازە (ئیدعا)کەی ماسی بە شێوەی دیکە لە لایەن تیۆریستەکانی "کۆمەڵگەی زانیاری تەوەر"ەوە دووبارە کراوەتەوە. تیۆریستەکانی وەك دانیەل بێل کە پێشکەوتنی تێکنۆلۆژیی پێوەندییەکان لە دەیەکانی دوایی دا بە بوارخولقێنی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان و شکڵ گرتنی کۆمەڵگەیەکی زانیاری تەوەر دەزانێ، لە تاوتوێ کردنی تایبەتمەندییەکان و دەرکەوتەکانی ئەم جۆرە ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییە نوێیەدا باس لە نایەکسانی دەکا. لە بەر

* Power - geopmetry

ئەوەی کە لە کۆمەڵگەیەکی ئەوتۆ دا زانیاری لە ریزی کاریگەرترین و کارامەترین ئامراز و کەرەستەکانی ژیاندا هەڵکەوتووە، نایەکسانی لە رادەی دەستراگەیشتن بە زانیاری، نایەکسانیی کۆمەڵایەتی– ئابووریی توندتر و بەربڵاوتر پێك دێنێ. دیارە بە بێ ئەوە شتێکی روونە کە دابەش کرانی زانیاری لە ئاستە جۆراوجۆرە ناوچەیی، نەتەوەیی، هەرێمی و جیهانییەکان دا زۆر نایەکسانە (Lyon, 1999: 51).

مارتین ئالبرۆ لە روانگەیەکی جیاوازەوە دەڕوانێتە بابەتی جێگای باس و بە رەخنەگرتن لە ژمارەیەك لەو روانگە و رایانەی گرێدراوی نێوەڕۆکی گۆڕانی کۆمەڵگەی جیهانی(بەجیهانیبوون)ن، زیاتر و ئاڵۆزتربوونی نایەکسانی و جیاوازیدانان لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا دەسەلمێنێ. لەم جۆرە بۆچوونانەدا ئیدعا دەکرێ کە پووکانەوەی شوناس و بەڵێنداریتیی چینایەتی لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی جیهان دا نیشانەی کەمبوونەوەی نایەکسانییە چینایەتییەکانە. بەڵام ئالبرۆ بڕوای وایە کە هەرچەند توانایی و لێهاتوویی شوناسبەخشی چین بە رادەیەکی بەرچاو کەم بۆتەوە، بەڵگە و هۆکاری زۆر هەن کە دابەش کردنی نایەکسانی سامان و دەرەتان رۆژ بە رۆژ زۆرتر بووە و دەبێ (Albrow, 1996: 159).

تیۆریستەکانی دیکەش قسە لە بەردەوامی و توندبوونی نایەکسانی لە دەیەکانی دوایی‌دا دەکەن. سکلێر، تیۆریستی نێومارکسیست باس لە پێکەی نزمی کۆمەڵانی خەڵك لە بیاڤە ئابووری، سیاسی و کولتوورییەکانی سیستمی جیهانیی سەرمایەداری دا دەکەن (Skair, 1998: 297). کی بیرنا بڕوای وایە پرۆسەی بەجیهانیبوون ئەگەرچی دەرەتان بۆ پێوەندیی نێوان مرۆڤە زۆر لێك دوورەکان دەخولقێنێ، پەردە لە سەر ئەم راستییەش لادەدا کە جیهانی ئێستا نایەکسانە (Guibernau, 1996: 135). تاملێنسۆنیش گۆڕانکارییە جیهانییەکانی دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم بە لەخۆگری براوەکان و دۆڕاوەکان، دووبارە بەرهەمهێنەرەوەی جۆرە وێکچووەکانی زاڵێتی و شوێنکەوتوویی و نایەکسانی لە دابەش کردنی کاڵا و خزمەتگوزارییە کولتوورییەکان دەزانێ (Tomlinson, 1999b: 131).

هەر چۆنێك بێ ئەم دەستەیە لە تیۆریستەکان کە کەم ژماریش نین، لە روانگەگەلی جۆراوجۆرەوە، نایەکسانییەکان و جیاوازیدانانە زێدەرووییەکان دەسەلمێنن و پێی لە سەر دادەگرن. بە بۆچوونی ئەوان سەرمایەداری و نوێبوونەوە هەرچەند هەمە لایەنەتر، ئاڵۆزتر و پێشکەوتووتر دەبن، نایەکسانی و جیاوازیدانانی توندتر و ئاڵۆزتر دەخولقێنن. لەو جێگایانەی کە ئەم نایەکسانی و جیاوازیدانانە لەگەڵ سنووربەندی و کەلێنە سیاسی و کولتوورییە



جۆراوجۆرەکان یەك بگرنەوە و بکەونە سەریەك، وشیاری و رێکخراو هەڵگریی نەتەوەیی، ئیتنیکی و ئایینیی جۆراوجۆری لـێ دەکەوێتەوە. بەم چەشنە بەستێنێکی لەبار بۆ تایبەگەراییە کولتوورییەکان دەخولقێ.

لەم روانگەیەوە چەشنە جۆراوجۆرەکانی ئاڵۆزییەکان، دژایەتییەکان و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە بچووك و گەورەکان کە لە چوارچێوەی کولتوور و نەریتە بە ئایدیۆلۆژی بووە ئایینی، ئیتنیکی و نەتەوەییەکان دا شکڵ دەگرن، لە راستی دا پەرچەکردارگەلێك لە بەرانبەر نایەکسانی و جیاوازیدانانە زێدەروویەکان دان. بزووتنەوەکان ئەگەرچی بەرگی کولتوورپیان هەیە، بەڵام لە راستی دا بە رابوون و نارەزایەتیی توندوتیژانەی سەرچاوەگرتوو لە هەلومەرجی نالەبار و دژواری ئابووری کۆمەڵایەتی دەژمێردرێن. هەروەها نێومارکسیستەکانی وەك والرشتین و تارادەیەك سەمیر ئەمین شیکارییەك لە تایبەتگەرایی کولتووریی زێدەروو لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی جیهان دەخەنە بەرچاو.

والرشتین کە کەم تا زۆر لە چوارچێوەی نەریتی هزریی مارکسیسم دا بیر دەکاتەوە، سیستمی جیهانی لە بنەما دا بە ئابوورییەکی سەرمایەداریی جیهانی دەزانێ. ئەم سیستمە لە نێوەڕۆك دا نایەکسانی خولقێنە و ئەم نایەکسانییە بە باشترین شێواز لە دابەش کردنی جیهان بە ناوەند، شێوە پەراوێز و پەراوێز و لە پێوەندیی نایەکسانی نێوان ئەوان دا رەنگ دەداتەوە. ئەگەرچی سیستمی سەرمایەداریی جیهانی لە دەیەکانی دوایی دا زۆر گۆڕاوە و کارکردی ئەو ناسك تر و ئاڵۆزتر بووە بەڵام پێکهاتەی نایەکسانیی جیهان نەگۆڕاوە و رێفۆرمی تێدا پێك نەهاتوە. تەنانەت دەتوانین بڵێین کە پێشکەوتووترین قۆناخی گۆڕانی سیستمی سەرمایەداری توندتر بوون و زیاتر و ئاڵۆزتر بوونی نایەکسانییە ئابوورییەکانی لەگەڵ دا بووە(Beyer, 1998: 306).

لە بەر ئەوەی کە شێوە بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لە ناخی خۆیدا نایەکسانی خولقێنە، سیستمی جیهانی هەمیشە لەگەڵ بزووتنەوە جۆراوجۆرە دژە سیستمەکان بەرەوروو بووە. بە رای والرشتین تایبەتگەراییە سیاسی (ناسیۆنالیسم) و کولتوورییەکانی ئەم دواییانەش جۆرێك بزووتنەوەی کۆمەڵایەتیی دژە سیستمن و لەو سنووردارکردن و فشارانەوە سەرچاوە دەگرن کە پرۆسەی کەڵەکەکردنی سەرمایەی جیهانی سەپاندوونین. لە لایەنی مێژوویی و لۆژیکییەوە، کولتوور زۆرتر لە خزمەت سیستمی سەرمایەداری و ساماندارەکان دا بووە، بەڵام هێندێك

جاریش بۆتە ئامرازی بێ تواناکان بۆ خەبات دژی نایەکسانی و جیاوازیدانانەکان (Wallerstein, 1991: 139).

تایبەتگەراییە کولتوورییە زێدەروویەکانی دەیەکانی دوایی لە ریزی ئەم نموونە کەمانە دایە کە لەون دا کولتوور ئەرکێکی جیاواز و ناباو بەڕێوەی دەبا و نەك بەستێن خۆشکەری ئارام گرتن و خەوتنی کۆمەڵایەتی نیە، بەڵکوو دەبێتە هۆکاری بزووتنەوە و شۆڕشی کۆمەڵایەتی. لەم روانگەیەوە بزووتنەوە نەتەوایەتی و ئیتنیکییەکان هەوڵ گەلێکن بۆ دەرچوون لەو سنووردارێتیانە کە لۆژیکی ئابووریی سەرمایەداری بە سەر کرداری سیاسی دا دەیسەپێنێ. ژمارەیەك لە بزووتنەوە ئایینییەکانیش بە راشکاوی نارەزایەتیی سیاسی لە پێکهاتەی بەستووی سیستمی جیهانین و نێوەڕۆکێکی دژە سیستمیان هەیە (Wallerstein, 1991: 193; 13 Beyer, 1998: 306).

هەروەها سەمیر ئەمین لە باسی ناسیۆنالیسم و جیهانی کردن دا، شیکارییەکی هاوشێوە لە شەپۆلی دوایی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان و بە تایبەت تایبەتگەراییە نەتەوەیی و ئیتنیکییەکان دەخاتە روو. ئەو سێ جۆرە نەتەوەگەرایی دەس نیشان دەکا کە هەر کام لەوان لەگەڵ قۆناخێکی مێژوویی دیاریکراو دا یەك دەگرنەوە. ناسیۆنالیسمی جۆری یەکەم— کە دەتوانین لەو وەك ناسیۆنالیسمی نەتەوەسازی نێوبەرین— بە بنچینەی ئایدیۆلۆژیکی نەتەوە مێژووییە مۆدێڕنەکان دەژمێردرێ. جۆری دووهەم، ناسیۆنالیسمی دژە ئیمپریالیستییە کە لە بزووتنەوە رزگاریدەرە نەتەوەییەکان لە وڵاتانی جیهانی سێهەم دا دەرکەوتوە. ناسیۆنالیسمی جۆری سێهەمیش دەتوانین بە "توخمی بەرگری، نارەزایەتی یان سەرکێشی لە بەرانبەر رەوتی ئێستای جیهانی کردن" دانێین (سەمیر ئەمین، ١٣٧٩: ٢٦).

لە روانگەی ئەمینەوە، جۆری سێهەمی ناسیۆنالیسم دیاردەیەکی نوێیە کە نەك تەنیا لە ئەفریقا، لە وڵاتە کەم تا زۆر دەستکردەکان، لە سنوورە کەم تا زۆر دەستکردەکان و جێگاکانی دیکەدا، بەڵکوو لە یەکیەتیی سۆڤیەتی پێشوو و یۆگسلاویی پێشوو و تەنانەت لە کانادا دەبینرێ. ئەگەرچی ئەم دەستەیە لە تایبەتگەراییەکان زۆر ناهاوچەشنن، بەڵام هەموویان بە دژکردوەگەلێك لە بەرانبەر پرۆسەی بەجیهانیبوون دا دەژمێردرێن. بە رای ئەو لە بەر ئەوەی کە سەرمایەداری سیستمێکی نایەکسانی خولقێنە و لە پێشکەوتووترین قۆناخی خۆشی دا (جیهانی کردن) هەم نایەکسانی و جیاوازیدانانەکان بەگوڕتر دەکا، شەپۆلێك لە تایبەتگەرایی کولتووری لە چوارچێوەی بزووتنەوە و دژایەتییە ئیتنیکی و نەتەوەییەکان دا دروست دەکا (سەمیر ئەمیر، ١٣٧٩: ٢٧ — ٢٦).



تیۆریستی واش هەن کە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بە پەرچەکردارێك بە کەم و کووڕی و دژوازییەکانی رێکخراوی ئابووری — کۆمەڵایەتیی مۆدێڕن دادەنێن. هابرماس بڕوای وایە کە فشاری سەرچاوەگرتوو لە کارکردی ئابووریی بازاڕ و ئاوەزمەندێتیی بوروکراتیك، بەستێن خۆشکەری شکڵ گرتنی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانە. ئەم بزووتنەوە کۆمەڵایەتییانە زۆرتر کۆنەپەرستانە، بەرگرییانە و تایبەتگەران و لە دەرەوەی پانتایی جیهان ژین دان. بە پێچەوانەی فیمینیسم کە هابرماس ئەو بە تەنیا بزووتنەوەی مۆدێرن دەزانێ، ئەم بزووتنەوە کۆمەڵایەتییانە هیچ جۆرە ئیدعایەکی رەوشتی و حوقووقیی گشتی ناهێننەگۆڕێ و دەستەوداوێنی کولتوورە تایبەتەکان دەبن (Foweraker, 1995: 9 – 10).

بە رای کلاوس ئوفە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان و لەوانە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان، لە ئاستی نەهاتوویی سەرمایەداری و دیمۆکراسیی رەشۆکییانەوە سەرچاوە دەگرن. لە پێشکەوتووترین قۆناخی سەرمایەداریدا، دەوڵەت تا رادەیەکی زۆر لە بەڕێوەبردنی ئەرکە خۆش بژی خولقێنەکانیدا وەدوا دەکەوێ. کەواتە رەوایی دەوڵەت و سیستمی سەرمایەداری زۆر دادەبەزێ. گەشەی کورپوراتیسم بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی دەوڵەتی مۆدێرنیش عاقلە و پێوەندییە دێموکراتیکەکانی نێوان هاووڵاتی و دەوڵەت لە نێو دەبا و بەم چەشنە بواری گەشەی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان خۆش دەبێ (Foweraker, 1995: 10).

## پەرچەکردارێك بەرانبەر کەموکورتییەکان و دژوازییەکانی دیکەی نوێبوونەوە

هەروەك گوترا، تیۆرە ناوبراوەکان لە روون کردنەوەی تایبەتگەراییە کولتوورییەکانی دواییدا لە سەر ئەو کەموکووڕی و دژوازییە زۆرتر ئابوورییانەی لە جیهانی ئێستا دا هەن بە تایبەت نایەکسانییەکان و جیاوازیدانانە زێدەروویەکان پێ دادەگرن. بەڵام تیۆری واش هەن کە تەوەری باس کردنی ئەوان نەك تەنیا سیستمی سەرمایەداری، وەك یەکێك لە توخمە سەرەکییەکانی نوێبوونەوە، بەڵکوو خودی نوێبوونەوەیە. لەم جۆرە تیۆرانەدا کە زۆرتر لەلایەن پۆست مۆدێرنەکان و رەخنەگرانی نوێبوونەوە دەخرێنە روو، ئەو کەموکووڕی و دژوازییانەی لە ناخ و نێوەڕۆکی نوێبوونەوە دان بە بەستێن خۆشکەری چەشنە جۆراوجۆرەکانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، لەوانە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان لە قەڵەم دراون.

بە شێوەیەکی گشتی لەم تیۆر و شیکارییانەدا لە سەر تایبەتمەندیی قەیران خولقێنی نوێبوونەوە پێ دادەگیرێ و تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بە پەرچەکردارگەلێك لە بەرانبەر

قەیرانی نوێبوونەوەدا دەژمێردرێن. لە زۆر لەم نموونانەدا ئیدعا دەکرێ کە ئەم قەیرانە لە بێ توانایی نوێبوونەوە لە هێنانەدی بەڵێن و ئامانجە زۆر بایەخدارەکانی وەك ئازادی و یەکسانییەوە سەرچاوە دەگرێ. بە دەربڕینێکی دیکە نوێبوونەوە لە جیاتی ئەوەی کە هێزێکی رزگاریدەر بێ، ئاوەزمەندێتیی ئامرازی و ئامرازگەرایی دەرهەستانەی لە کۆمەڵگەی مرۆییدا زاڵ کردوە و ئەوی کردۆتە قەفەسێکی زێڕین. لە کۆمەڵگەیەکی شێوە رایەڵکەی پێڕەوی رەوتە جیهانییەکانی هێز و زانیاریی، کەسایەتی، مرۆڤایەتی، ئازادی، سەربەخۆیی و دیمۆکراسی جێگایەکی نیە و تایبەتگەراییە کولتوورییەکان لە راستی دا هەوڵ گەلێکن بۆ بوژاندنەوە و پەروەدەکردنی ئەم جۆرە بایەخانە (Castells, 1996: 3, 23).

تایبەتمەندییەکی دیکەی قەیران خولقێنی نوێبوونەوە کە لە شیکاریی تایبەتگەرایی کولتووری دا پێی لە سەر داگیراوە، ئیتنیك تەوەربوونی نوێبوونەوەیە. لەم روانگەیەوە، ئەگەرچی نوێبوونەوە بەردەوام خۆی بە لە خۆگری بنواشە و بایەخە گشتی و جیهانگرەوەکان نیشان دەدا، لە راستیدا لە سەر کولتوورێکی تایبەت و دیاریکراو بونیاد نراوە. ئەم کولتوورە تایبەتە هەمان کولتووری رۆژئاواییە کە لافی گشتی و جیهانگرەوە بوونی هەیە. لە دەیەکانی دوایی دا کە پێگەی هێژمۆنیك و بالادەستی نوێبوونەوەی رۆژئاوایی گومانی خراوەتە سەر، کولتوورە نارۆژئاواییەکانیش کەوتوونەتە بەرەنگارییەکی شێلگیرانە لەگەڵ زاڵێتیی هەلایەنەی کولتووری رۆژئاوایی. تایبەتگەراییە کولتوورییە جۆراوجۆر و زێدەروویەکان هێماکانی ئەم بەرەنگاربوونەوە و ململانێیەن بۆ وەدەست هێنانی پێگەیەکی باشترە و لەبارتر (Firedman, 1994: 78 – 86, 192).

لە پانتایی بەرینی توێژینەوە کولتووری و کۆمەڵایەتییەکان دا، شیکاریی هاوشێوەیی دیکەش دەتوانین بدۆزینەوە کە بە شێوازگەلی جۆراجۆر، تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بۆ کەموکووڕییەکان و دژوازییەکان و کارلـێنەهاتووییەکانی نوێبوونەوە دەگەڕێننەوە، بە پێی ئەم جۆرە روانینانە چەشنە جۆراوجۆرەکانی ئالۆزییەکان، دژایەتییەکان و بزووتنەوە ئیتنیکی و ئایینییەکان هەوڵ گەلێکن بۆ لە نێو بردن و کەم کردنەوەی ئەو کەموکووڕی و شێواوییەی کە نوێبوونەوە بە دیاریی هێناون و تەنانەت دامەزراندنی سیستمێکی نوێ.



## تایبەتگەراییە کولتوورییەکان، دیاردەیەکی سیاسی

لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسمان لە تیۆرێك کرد کە بە پێی ئەو تایبەتگەراییە کولتوورییەکان پەرچەکردارگەلێك لە بەرانبەر کەموکووڕی و کار لـێنەهاتوییەکانی سیستمی کۆمەڵایەتیی مۆدێرن دان. بەشێك لەو کەموکووڕییانە لە ئاکامی بەردەوامی و توندتر بوونی نایەکسانی و جیاوازیدانانە جۆراوجۆرەکان لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا دەرکەوتوون و لە لۆژیکی کەڵەکەکردنی سەرمایەوە سەرچاوە دەگرن. بەشێکی دیکە لە کەموکووڕییەکان و نالەبارییەکانیش ریشەیان لە ناخ و نێوەڕۆکی خودی نوێبوونەوەدا هەیە. هەر چۆنێك بێ لە هەموو ئەو شیکاریانەدا کە کەم تا زۆر بەم تیۆرانە پێبەندن، تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بە شتێك بێجگە لە خەبات لەگەڵ چەشنە جۆراوجۆرەکانی کەموکووڕی و دژوازییەکان و هەوڵ دان بۆ دامەزراندنی سیستم و رێکخراوێکی کۆمەڵایەتیی جیاواز لەوان ناژمێردرێن.

لە تیۆرگەلی هەڵگری ئەم جۆرە شیکاریانە دا لە رووکاری کۆمەڵایەتییەوە چاو لە دیاردەی تایبەتگەرایی کولتووری دەکرێ. ئەم دەستەیە لە تیۆریستەکان هەوڵ دەدەن نیشانی بدەن کە ئەگەرچی هەلومەرج و هۆکارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، توێژ و گرووپە جۆراوجۆرەکان رێك دەخەن و ئەوان بۆ لای ئایدیۆلۆژییەکان و بزووتنەوە تایبەتگەراکان رادەکێشن، بەڵام تیۆریستی واش هەن کە نەك لە بنەمای هەرەمی کۆمەڵایەمەتی، بەڵکوو لە سەری هەرەمەکەوە لە تایبەتگەرای کولتووریی دەڕوانن. بە بۆچوونی ئەوان تێگەیشتن و تەتەڵەکردنی وردتری ئەم دیاردەیە کاتێك کردەییە کە ئەو بە دیاردەیەکی سیاسی دابنێین. لە دێڕەکانی دواتردا باس لە دوو دەستە لە تەتەڵەکردنە سیاسییەکانی تایبەتگەرایی کولتووریی دەکەین.

کولتوور لە نەریتی هزریی مارکسیسم دا بە جۆرێك ئایدیۆلۆژی دادەنرێ. بە گوتەیەکی دیکە هەر جۆرە توخمێکی کولتووری لە خزمەتی بەرژەوەندییەکی دیاریکراو دایە، هەرچەند کە بەردەوام هەوڵ دەدا ئەم ئەرکەی خۆی بشارێتەوە. کەواتە کولتوور و کولتوورسازی بێ لایەنانە بوونی نیە و پانتایی کولتوور بەردەوام گۆڕەپانی دژایەتی و رووبەڕووبوونەوەی بەرژەوەندییە جۆراوجۆرەکان بووە. لە سیستمی سەرمایەدارییش دا کولتوور بەردەوام لە خزمەتی ئەم سیستمەدا بووە و هەروەك ئامرازێك بۆ شاردنەوە یان پاساودانی ناتەبایی و دژوازییەکانی ئەم سیستمە بەکار هێنراوە (Wallerstein, 1991: 166).

والرشتین بە پێی ئەم تیۆرە خەریکی شیکاریی چەشنەکانی تایبەتگەرایی کولتووری دەبێ. لە روانگەی ئەوەوە بێجگە لە هێندێك نموونەی کەم کە تایبەتگەرایی کولتووریی لە خزمەت

بەرژوەندیی گرووپەکان و چینەکانی خوراروەوە و لاوازەکان دابووە بۆ ئەوەی دۆخی باو بگۆڕێ، ئەم دیاردەیە پاساودەرو بەردەوامیدەری سیستمی سەردەم و بەرژەوەندییە زاڵەکان بووە. سیستمی جیهانیی سەمایەداری بەردەوام هەوڵی داوە بە کولتوورسازی و هاندانی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان، نایەکسانییەکان پاساو بدا و کۆمەڵانی ناڕازی کۆنترۆڵ بکا. تایبەتگەراییە کولتوورییەکانی دوایی لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی جیهانیش شتێك بێجگە لە هەنگاوگەلی بەرنامە بۆ داڕێژراو بە مەبەستی پاساودانی کارکردی سیستمی جیهانیی سەماریەداری نین (Wallerstein, 1991: 174 – 78; Clark, 1997: 28 – 9).

هەر چۆنێك بێ والرشتین لە رەخنەگرتن لەو روانگە و تیۆرانەی کە جۆرێك سەربەخۆیی بۆ کولتوور لە بەرچاو دەگرن و دیاردە و پێوەندییە کولتوورییەکان بە ئاڵۆز دادەنێن، هەر جۆرە رێکخستنێکی کولتووری بە جۆرێك ئایدیۆلۆژیی پارێزگارانەی بەردەوامیدەر بە سیستمی جیهانیی بونیادنراو لە سەر نایەکسانی و چەوساندنەوەی شێوازمەند دادەنێ. بە دەربڕینێکی ساناتر ئەو قسە لەوە دەکا کە تایبەتگەراییە کولتوورییەکانی وەك نژادپەرستی، یارمەتی بە سیستمی سەرمایەداری دەکەن تاوەکوو ئاژاوە بنێتەوە و حکوومەت بکا و بزووتنەوەکانی وەك نەتەوەخوازی و بونیادگەرایی کارتێکەری و ئاکامێکیان بێجگە لە لاوازکردنی بەرگرییە دژە سیستمەکان نابێ (Holton, 1998: 171).

دەستەیەکی دیکە لە تیۆریستەکانیش تایبەتگەراییە کولتوورییەکان لە پلەی یەکەم دا بە دیاردەیەکی سیاسی لە قەڵەم دەدەن. بە پێی ئەم جۆرە تیۆرانە کە زۆرتر دەکەونە چوارچێوەی پێش گریمانە ئامرازگەراکانەوە و زۆرتر گرێدراوی دژایەتی و بزووتنەوە نەتەوەیی و ئیتنیکیەکانن، تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بە تایبەت تایبەتگەراییە ئیتنیکی و نەتەوەگەرایانەکان بە دیاردەیەکی شوێنهەڵگرتوو لە سیاسەت دەژمێردرێن. هەروەك کە والرشتین تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بە خزمەتکاری بەرژەوەندی چینێکی دیاریکراو و بەهێزکەری سیستمی جیهانیی سەرمایەداری دەزانێ، تیۆریستەکانی پێبەندی ئەم پێش گریمانەیەش بەشێکی بەرچاوی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان هەروەك ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانج گەلێکی دیکە لەوانە ئامانجەکانی دەستەبژێرە سیاسییەکان لە قەڵەم دەدن (سمیت، ١٣٧٩: ١٨١).

ئەم دوو پێش گریمانەیەی ناویان براو ئەو شیکارییانەی لە سەر ئەوان بونیادنراون بۆ وەسف و شیکاری لایەنە جۆراوجۆرەکانی تایبەتگەرایی کولتووری لەبارو کاران. [دیارە] سەبارەت بە تایبەتگەراییە کولتوورییە دیاریکراوەکانیش کاراییان هەیە. بێ گومان ناتوانین نکۆڵی لەوە



بکەین لە ژمارەیەك لە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان پەرچەکردای کۆمەڵانی خەڵك بەرانبەر بە کارکردی پڕ لە کەموکووڕی و پشێوی خولقێنانەی سیستمی سەرمایەداری و ناکارامەیی نوێبوونەوەن. ئەوە کە دەگوترێ تایبەتگەراییە کولتوورییەکان سەرمایەداریی جیهانی و دەستەبژێرە سیاسی و ناسیاسییەکان لە کولتوور و تایبەتگەراییە کولتوورییەکان سوود وەردەگرن و ئەوان دەکەنە ئامرازی دابین کردن و دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییە دیاریکراوەکان یان گەیشتن بە ئامانجێکی تایبەتیش ئیدعایەکی بە جێ و شیاوە، بەڵام هەمووی ئەوانە تەنیا بەشێك لە راستین.

تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بە هیچ شێوەیەك تایبەت بە کۆمەڵگە هەژارەکان یان چینە ژێر دەستەکان نیە. تاوتوێکردن و ئامارە جۆراوجۆرەکان دەردەخەن کە لێك بلاویی جوغرافیایی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان لە جیهان دا، پێوەندییەکی واتاداری ئەوتۆیان لەگەڵ ئاستی پەرەگرتوویی ئابووری کۆمەڵایەتی، رادەی داهات و پێگەی کۆمەڵایەتی دا نیە. تەنانەت لە پەرەگرتووترین و دەوڵەمەندترین وڵاتانی جیهانیش دا کە سامان و پێداویستییەکان بە شێوازێکی تاڕادەیەك یەکسان دابەش دەکرێ، (وەك ژاپۆن) جۆرێك تایبەتگەرایی کولتووری هەیە. کەواتە ئەگەر نایەکسانی و جیاوازیدانانی زێدەروو بە هۆکاری تایبەتگەراییە کولتوورییەکان دابنێین، ناتوانین شیکاریی بەشێکی بەرچاوی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بکەین. لە ئایدیۆلۆژیی زۆربەی تایبەتگەراییە کولتوورییەکانیش دا گرنگی بە نایەکسانیی ئابووری نەدراوە.

شیکاریی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان وەك پەرچەکردارێك لە بەرانبەر کەموکووڕییەکان و دژوازی و ناکارامەییەکانی دیکەی نوێبوونەوەش دا لە ئاست رەخنەیەکی هاوشێوە دا خەسارهەڵگرە. ئەگەرچی ناتوانرێ نکۆڵی لەوە بکرێ کە نوێبوونەوە لە جێ بە جێ کردنی بەڵێنییە بایەخدارەکانی وەك یەکسانی، ئازادی، سەربەخۆیی، دیمۆکراسی و مافەکانی مرۆڤ دا ئەوەندە سەرکەوتوو نەبووە، بەڵام تایبەتگەرایانی کولتووری ئەم ناکامییە — بەو جۆرە کە ئەو تیۆریستانەی کە روونکردنەوەی ئەوتۆ دەخەنە روو پێیان وایە — ناکەنە بیانوویەك و مایەی ئۆگریشی نین. بە دەربڕینێکی روونتر، لە ئایدیۆلۆژیی زۆربەی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان، نە بە هۆی ئەم ناکامییەوە رەخنە لە دۆخی هەبوو دەگیرێ و نە لە کۆمەڵگەی خەیاڵیی هێڵکاری کراوی ئەم ئایدیۆلۆژییە دا، شوێنێکی بەرزتر و زەقتر بۆ ئەم جۆرە بنواشە و بایەخە گشتی و جیهانگرەوانە تەرخان کراوە.

لە رەخنەگرتن لە تیۆرێك کە تایبەتگەرایی کولتووری بەستراوە بە سیاسەت و بەم پێیە بە دیاردەیەکی سیاسی دەزانێ، دەبێ وەبیر بێنینەوە کە تایبەتگەرایی کولتووریی لە پلەی یەکەم دا گوزارە و لە سەربەخۆیی کولتووری دەکا. بێ گومان تایبەتگەراییە کولتوورییە زێدەروویەکان لە دەیەکانی دوایی دا بە شێوەیەکی جیددی هەڕەشە لە تەکووزی و دۆخی هەبوو دەکەن: تەکووزییەك کە لە سەر بنچینەی نوێبوونەوە و سیستمی جیهانی سەرمایەداری دامەزراوە. ئەگەرچی ئەم تایبەتگەراییانە لە هێندێك حاڵەت دا بە قازانجی "ناوەند" بووە، وەك لێك بڵاوبوونی یەکیەتی سۆڤییەت و دەرکەوتنی نەتەوەگەراییە نوێیەکان، زۆر جار قازانجی بژاردە جیهانییەکانی هێز و سامانی خستۆتە مەترسییەوە.

ئەم روونکردنەوە ئامێربینانەیەش کە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بە دروستکراوی دەستی بژاردەکان بۆ گەیشتن بە مەبەست و ئامانجەکانی دیکەیە، ئەوەندە بە جێ و لۆژیکی نایەتە بەرچاو. بێ گومان ئەو بژاردانەی وەشوێن هێز و سامانەوەن بەردەوام هەوڵیان داوە بە هەر شێوەیەك کە کراوە کۆمەڵانی خەڵك رێك بخەن، لە پێناوی خواست و بەرژەوەندییەکانی خۆیان دا کەڵکیان لـێوەرگرن و دەستەوداوێن بوونی کلتووری ئیتنیکی، نەتەوەیی و ئایینیش لەم بوارەدا ئاساییە. بەڵام ئەم راستییە بە هیچ شێوەیەك پێکهاتنی شەپۆلێکی دیکە لە تایبەتگەراییە کولتوورییە زێدەرووەکان لە دەیەکانی دوایی دا روون ناکاتەوە. بە دەربڕینێکی دیکە بە پێی روانگە و شیکارییەکی ئەوتۆ ناتوانین لەوە بگەین کە بۆچی و چۆن توێژ و گرووپە جۆراوجۆرەکان لە قۆناخێکی دیاریکراودا رێکخراوتر و ئامادەتر دەبن.

کەواتە بە شێوەیەکی گشتی دەتوانرێ بگوترێ کە ئەو تیۆرانەی لە سەر ئەم دوو روانگەیەی باسیان لێوەکرا و تیۆرەکانی دیکە لە لە ناوهێنانیان خۆمان پاراست، لەگەڵ ئەوەی کە توانای روونکردنەوەیان زۆرە بەڵام لە تەتەڵەکردنی تایبەتگەرایی کولتووری وەك دیاردەیەکی سەربەخۆ بێتوانان. کەواتە پێویستیمان بە تیۆرێك هەیە کە زیاتر لە رووکارەکانی تایبگەرایی کولتووری بدوێ و شیان کاتەوە و توانای روونکردنەوەی زۆربەی تایبەتگەراییە کولتوورییەکانی هەبێ، لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین بە تێکەڵاوکردن و تەتەڵەکردنی جۆراوجۆر، ئەم پێداویستییە دابین بکەین.



## بونیادنانەوەی کولتووری خۆ

لە لایەنی شێوازناسییەوە لەو تیۆر و تەتەڵەکردنەوانە دا کە پێشتر تاوتوێمان کردن هۆکارەکانی وەك نایەکسانی و جیاوازیدانانە زێدەروویەکان، ناکارامەیی و کەموکووڕییەکانی دیکەی نوێبوونەوە، دژوازییەکانی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری و بژاردە سیاسی و ناسیاسییەکان وەك بگۆڕە سەربەخۆکان یان هۆکارە سەرەکییەکانی دیاردەی تایبەتگەرایی کولتووری لە قەڵەم دراون. بەڵام ئیدعای ئەم توێژینەوەیە ئەمەیە کە دەتوانرێ پرۆسەی بەجیهانیبوون بە هۆکاری سەرەکی دابنرێ. بە وتەیەکی دیکە بە هانابردن بۆ هۆکارێکی ئەوتۆ دەتوانرێ بەشێکی بەرچاو لە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بە باشی روون بکرێنەوە. کەواتە بگۆڕی سەربەخۆ بریتییە لە پرۆسەی بەجیهانیبوون و بگۆڕی بەستراوەش، دیاردەی تایبەتگەرایی کولتوورییە.

لە بەشی یەکەم دا بە درێژی سەبارەت بە بگۆڕی سەربەخۆ (بەجیهانیبوون) قسەمان کرد، تیۆرە جۆراوجۆرەکانی بەجیهانیبوونمان بە کورتی باس کرد و رووکارە جۆراوجۆرەکانی ئەومان دەرخست. بەشی دووهەمیشمان بۆ شیکردنەوەی نێوەڕۆك و جۆرەکانی تایبەتگەرایی کولتووری تەرخان کرد و بۆ باشتر تێگەیشتن لەم دیاردەیە ئەومان لەگەڵ گشتگەرایی کولتووری بەراورد کرد. ئێستا لە پاژی دووهەمی بەشی سێهەم دا کە لە لایەنی شێواز ناسییەوە بە گرنگترین بەشۆکەی(جزء) ئەم توێژینەوەیە دەژمێردرێ، دەمانهەوێ دەری خەین کە پێوەندیی نێوان ئەم دوو بگۆڕە چۆن دادەمەزرێ. بە وتەیەکی دیکە دەبێ هەوڵی ئێمە لەم بەشەدا دۆزینەوەی وڵامێکی شیاو و پەسندکراوی بۆ ئەم پرسیارە لـێ بکەوێتەوە کە پرۆسەی بەجیهانیبوون چۆن تایبەتگەرایی کولتووریی لـێدەکەوێتەوە یان ئەمە کە چۆن دەتوانرێ نیشان بدرێ کە تایبەتگەرایی کولتووری درەکەوتەی بەجیهانیبوون یان دەرهاویشتەی ئەوە.

روونکردنەوەیەك کە لەم بەشە دا خراوەتە روو دەتوانرێ بەم چەشنە کورت بکرێتەوە؛ پرۆسەی بەجیهانیبوون لە رێگای هۆکار و میکانیزم گەلێکەوە، جۆرێك قەیرانی شوناس و مانا لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی جیهان دا دروست دەکا. کەواتە تاکەکان و توێژە جۆراوجۆرەکان بۆ چارەسەر کردنی ئەم قەیرانە شێواز و رێکار گەلێك دەگرنە بەر کە تایبەتگەرایی کولتووری یەکێك لەو رێگایانە. دەس نیشان کردنی ئەم هۆکار و میکانیزمانەی ناویان برا، شیکردنەوەی تایبەتمەندی و هێماکانی قەیرانی شوناس و مانا و رەنگدانەوەی ئەم قەیرانە لە تایبەتگەرایی کولتووری دا، بابەتە سەرەکییەکانی باسی لاپەڕەکانی دواترە. بەڵام بەر لە هەمووی ئەوانە

سەرەتا بزانین شوناس چیە، چ پێداویستی و ئەرکێکی هەیە و گرنگتر لە هەمووان، چۆن دروست دەکرێ؟

## شوناس

لە لایەنی وشەییەوە وشەی شوناس (identity) لە وشەی identitas وەرگیراوە و بە دوو مانای بە روالّەت دژواز بە کار دەبردرێ؛ ١) وەك یەکی و یەك چەشنیی رەها: ٢) لێك جیایی کە هەلّگری جێگیری و بەردەوامییە لە درێژایی زەمەن دا. ئەگەرچی ئەم دوو مانایە دژواز و دژ بە یەك دێنە بەرچاو، بەلاّم لە راستیدا گرێدراوی دوو لایەنی سەرەکی و تەواوکەری شوناسن کە لە باسی چیەتیی شوناس روون دەکرێتەوە. بەلاّم سەرەتا پێویستە قسە لە بابەتێك بکەین کە دەروونناسان و کۆمەلّناسانی ئۆگری ناسینی شوناس لە سەری ناکۆکن؛ تاکەکەسی یان کۆمەلاّیەتی بوونی شوناس.

ئەگەرچی زۆربەی نزیك بە تەواوی تیۆریستەکانی شوناس لە سەر ئەم دوو مانایەی شوناس کۆدەنگییان هەیە، بەلاّم هێشتا لە سەر بەکارهێنانی ئەو مانایانە بە رێککەوتنێك نەگەیشتوون. زۆربەی دەروونناسان و تیۆریستەکان کەسایەتی بە شتێکی تاکەکەسی و کەسێنی دەزانن و رایان وایە کە دوو مانا و لایەنە سەرەکییەکانی شوناس گرێدراوی تایبەتمەندییەکانی کەسایەتی و هەستی تاکن. دیارە زۆربەی ئەم دەستەیە لە تیۆریستەکان، نکۆلّی لە شوناسی کۆمەلاّیەتی ناکەن، بەلّکوو ئەم دوو شوناسە جیاواز و سەربەخۆ لە یەکدی لە قەلّەم دەدەن. بە هەر حالّ لەم روانگەیەوە شوناس بریتییە لە "هەست کردن بە جیاوازیی کەسێنی، هەستی بەردەوامیی کەسێنی و هەستی سەربەخۆیی کەسێنی" (Jacobson, 1998: 9).

بەلاّم دەروونناسانی کۆمەلاّیەتی و کۆمەلّناسان دەیانهەوێ لە سەر ئەم راستییە پێ دا بگرن کە هەستی شوناس [ی تاکەکەسی] لە رێگای دیالکتیکی نێوان تاك و کۆمەلّگەوە پێك دێ. ئەوان کەم تا زۆر قەبوولّ دەکەن شوناس زۆرتر لە روانینەکان و هەستەکانی تاکەکان دا رەنگ دەداتەوە، بەلاّم بەستێنی پێك هاتنی ئەو ژیانی کۆمەلاّیەتییە. شوناسی کۆمەلاّیەتیی دەرکەوتوو لە شوناس دا، لە دەرەوەی دنیای کۆمەلاّیەتیی تاکەکان مانایەکی نیە. تاکەکان بێ هاوتان و لە گۆڕان دان، بەلاّم کەسایەتی بە تەواوی بە شێوەی کۆمەلاّیەتی و لە رێگای قۆناخە جۆراوجۆرەکانی کۆمەلاّیەتیبوون و کردارە درەوونییە کۆمەلاّیەتییەکانەوە دروست دەبێ (Jacobson, 1998: 9 ; Jenkins, 1996: 20). دیارە ئەم کێشە و ناتەباییە تیۆرییانە



زۆر بەربلاّون، بەلاّم ئێمە بەم باسە کورتە واز دێنین و شوناسی کۆمەلاّیەتی کە تەوەری ئەم توێژینەوەیە پێك دێنێ دەخەینە بەرباس.

ئالاّهەلّگری تیۆری شوناسی کۆمەلاّیەتی جۆرج هێربێرت میدە کە پرۆسەی دەستراگەیشتنی تاکەکان بە هەست و خوێندنەوەی تەواوی تاك لە خۆی تاوتوێ دەکا. لە روانگەی میدەوە، هەر تاکێك شوناس یان "خۆ"[58]یەکەی لە رێگای رێکخستنی روانینە تاکەکەسییەکانی دیتران لە چوارچێوەی روانینە رێکخراوە کۆمەلاّیەتی یان گرووپییەکان دا دروست دەکا. بە وتەیەکی دیکە وێنەیەك کە تاك لە خۆی دروست دەکا و هەستێك کە سەبارەت بە خۆی دەیبێ رەنگدانەوەی روانینێکە کە دیتران سەبارەت بەو هەیانە (Mead, 1964: 222). دواتر تاجفێل بە پشت بەستن بەم روانگەیە، رێگای بۆ تاوتوێ کردنی شێوازمەندی لە پێوەندیی نێوان خوێندنەوەکانی تاکەکان لە خۆیان و لەو چینە کۆمەلاّیەتییانەی کە ئەوان و دیتران سەر بەون خۆش کرد.

تاجفێل شوناسی کۆمەلاّیەتی بە ئەندامەتیی گرووپییەوە دەبەستێتەوە و ئەندامەتیی گرووپی بە پێکهاتوو لە سێ توخم دەزانێ؛ توخمی ناسیارانە (وشیاری لەوە کە تاك سەر بە گرووپێکە)؛ بە توخمی بەهایی (گریمانەگەلێك سەبارەت بە دەرکەوتە بەهاییە ئەرێنی یان نەرێنییەکانی ئەندامەتیی گرووپی)؛ و توخمی هەستەکی (هەستی تاك سەبارەت بە گرووپ و سەبارەت بە کەسانی دیکە کە پێوەندیەکی تایبەتیان لەگەلّ ئەو گرووپە هەیە). بەم پێیە، شوناسی کۆمەلاّیەتی لە روانگەی تاجفێلەوە بریتییە لە خوێندنەوەی تاکێك لە خۆی کە لە وشیاریی ئەو سەبارەت بە ئەندامەتی لە گرووپی (گرووپەکانی) کۆمەلاّیەتییەوە سەرچاوە دەگرێ، وێڕای گرنگیی بایەخیانە و هەستێکی رێکخراو لە بەرانبەر ئەو ئەندامەتییەدا" (Tajfel, 1978: 63).

بە سەرنجدان بە واتایەکی ئەوتۆ دەتوانرێ شوناسی کۆمەلاّیەتی بە جۆرێك خۆناسینی تاکەکەسی لە پێوەندی لەگەلّ دیتران دا بزانین. ئەم پرۆسەیە دیاری دەکا کە کەس لە لایەنی دەروونناسانە و کۆمەلاّیەتییەوە کێیە و چ پێگەیەکی هەیە، بە وتەیەکی دیکە پرۆسەی شوناس سازی ئەم دەرفەتە بۆ بکەرێکی کۆمەلاّیەتی پێك دێنێ کە بۆ پرسیارە بنچینەییەکانی پێوەندیدار بە کێیی و چییەتی خۆی وەلاّمی شیاو و رازیکەر بدۆزێتەوە. لە راستی دا شوناس پێوەندیی هەیە بە دووبارە ناسینەوەی سنوورەکانی نێوان خۆیی و بێگانە کە زۆرتر لە رێگای هاوجۆرییە کۆمەلاّیەتییەکان و جیاکردنەوەی

58- the self

دەروون گرووپ لە دەرەوەی گرووپەوە پێك دێ. گرنگیی جیاوازییەکان، ئالۆزییەکان و دژایەتییە گرووپییەکان، تەنانەت لە هەلومەرجێك دا کە بەرژوەندییەکان ناتەباییان نیە، لەم لایەنەی شوناسەوە سەرچاوە دەگرێ (Brown, 1999: 790).

کەواتە هەروەك لە سەرەتای باسی شوناس دا ئاماژەی پێ کرا، ئەم چەمکە وەك پێداویستییەك دوو واتای دژوازی لــێدەکرێ؛ وەك یەکی و جیاوازی. ئەم ئیدعایە کە شتێك یان تاکێك شوناسێکی تایبەتی هەیە، بەم مانایەیە کە ئەو شت یان تاکە وەك بووەکانی دیکە خاوەنی ئەم شوناسەیە و لە هەمان کات دا وەك شت یان تاکێکی جیاواز، شوناس و تایبەتمەندێتی هەیە. بە دەربڕینێکی روونتر شوناس واتە چۆنایەتیی وەك یەك بوون لە ناخ، پێکهاتە و نێوەڕۆك دا و هەروەها وەك یەك بوون لە هەر کات و لە هەموو دۆخێك دا. هەر چۆنێك بێ خاوەن شوناس بوون واتە تاقانە بوون، بەڵام لە روو رووکاری جیاوازەوە: وەك دیترابوون لە چینی خۆدا و وەك خۆبوون لە تێپەڕینی زەمەن دا (Hekman, 1999; 5, 11).

مانایەکی ئەوتۆ لە شوناس، ئێمە بەرەو باس کردن سەبارەت بە پێویستیی و ئەرکەکانی شوناس پاڵ پێوە دەنێ. بێ گومان دەتوانرێ بگوترێ کە شوناس لە پێداویستییە دەروونییەکانی مرۆڤ و پێداویستییەکی بەرایی هەر چەشنە ژیانێکی کۆمەڵایەتییە. ئەگەر تەوەر و بنەمای ژیانی کۆمەڵایەتی بە دامەزراندنی پێوەندیی بەردەوام و مانادار لەگەڵ دیتران بزانین، شوناسی کۆمەڵایەتی دەرەتانێکی ئەوتۆ پێك دێنێ. بە وتنێکی دیکە بە بێ چوارچێوەیەك بۆ دیاری کردنی شوناسی کۆمەڵایەتی، تاکەکان وەك یەکدی دەبوون و هیچ کام لەوان ناتوانن بە شێوەیەکی مانادار و بەردەوام لەگەڵ دیتران پێوەندی بگرن. کەواتە بە بێ شوناسی کۆمەڵایەتی لە راستیدا کۆمەڵگەیەك بوونی نەدەبوو (Jenkins, 1996: 6).

شوناسی کۆمەڵایەتی نەك تەنیا دەرەتان بۆ پێوەندیی کۆمەڵایەتی دەرەخسێنێ، بەڵکوو مانا بە ژیانی تاکەکانیش دەدا. شوناس نەك هەر پرۆسەیەکە بۆ خۆناسینی کردەگەرە کۆمەڵایەتییەکان، بەڵکوو ماناسازییش بە هۆی ئەوەوە ئەنجام دەدەرێ. لەم رووەوە ژمارەیەك لە تیۆریستەکان لە واتاکردن و چەمکبەندیی شوناس دا لە سەر ئەم ئەرکە پێ دادەگرن. بۆ وێنە مانوئێل کاستێل شوناس وەك "پرۆسەی دروستبوونی مانا لە سەر بنەمای تایبەتمەندییەکی کولتووری یان دەستەیەك تایبەتمەندیی کولتووری کە باڵادەستیان بە سەر



سەرچاوەکانی دیکەی مانادا هەیە"، واتا دەکا. بە رای ئەو هەروەك کە دەورەکان ئەرکەکان رێك دەخەن، شوناسەکانیش مانا رێك دەخەن (Castells, 1997: 7).

لەم روانگەیەوە شوناس چەمکێکە کە دنیای دەروونی یان کەسێتی لەگەڵ فەزای گشتی فۆڕمە کولتووری و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان تێکەڵ دەکا و خەڵك لە رێگای ئەوانەوە سەبارەت بە رووداوەکان و گۆڕانکارییەکانی ژینگەی خۆیان هەستیار دەبن. خەڵك بە دیتران دەڵێن کێن و گرنگتر لەمە بە خۆشیان دەڵێن کێن و دواتر هەوڵ دەدەن بە جۆرێك هەڵسوکەوت بکەن کە لەو کەسەی وێنای دەکەن هەن، چاوەڕوانی دەکرێ (Holland, 1998: 3- 6).

ماناسازبوونی شوناس نیشانەی دروستکراو بوونی ئەوە. مانا تایبەتمەندێتیی دەروونیی وشەکان و شتەکان نیە، بەڵکوو هەمیشە ئاکامی رێککەوتن یان نەبوونی رێککەوتنە. بەم پێیە مانا دەتوانێ بابەتی رێککەوتننامە بێ و لە سەر ئەو وتووێژ بکرێ. کەواتە شوناسیش شتێکی سروشتی و هەر بوو نیە، بەڵکوو هەمیشە دەبێ دروست بکرێ. مرۆڤەکان دەبێ بەردەوام شتەکان و کەسەکان چین بەندی بکەن و خۆیان بخەنە نێو ئەو چینەوە. بە دەربڕینێکی دیکە تەنیا دەتوانرێ لە رێگای نکۆڵی کردنی وشیارانە لە ناڕوونی و وەلانانی جیاوازییەکانەوە دەتوانرێ شوناس وەدەست بهێنرێ (Howarth, 1995: 118).

بە پێچەوانەی روانگەی ئەو پێکهاتەگەرایانەی هەوڵ دەدەن شوناس وەك شتێکی سروشتی و جێگیر نیشان بدەن، دەبێ بگوترێ کە شوناس شتێکی مێژوویی و پێش بینی کراوە. ئەم دیاردەیە هەروەك زۆر لە شتەکانی دیکە، بەرهەمی "زەمەن و رێکەوت" و بە هۆی لۆژیك یا بنواشەیەکی بان مێژوویی دیاری ناکرێ. هەر ئەم مێژوویی بوونە نیشانەی ئەوەیە کە شوناس و مانا گۆڕان هەڵنەگرن و لەم بیاڤە دا هیچ سنوورێکی سروشتی بوونی نیە. ئەم سنوورە تەنیا دەبێ پێك بهێنرێ تاوەکوو شوناسێکی هەرچەند کاتیش وەدەست بهێنرێ (Howarth, 1995: 118).

ئەگەر سنوور، جیاوازیی و شوناس دیاردەگەلێکی سروشتی و بان مێژوویی نین و بەردەوام بەرهەم دێن و بەرهەم دێنەوە، بێ گومان بەڕێوەبردنی ئەرکێکی گرنگی ئەوتۆ بە بێ ئامادەیی دەسەڵات و پێوەندییە هێز تەوەرەکان جێ بە جێ نابێ. شوناس پێوەندییەکی نەپچڕاوی لەگەڵ جیاوازی هەیە و جیاوازییەکان هەمیشە لە خۆگری دەسەڵاتن کە بە هۆی کۆمەڵگەکان، حکوومەتەکان و هێماکان دروست دەکرێ و لە رێگای ئەوانەوە دەپارێزرێ و بەهێز دەکرێ. کەواتە لە هەر جێگایەك جیاوازی هەبێ، دەسەڵات هەیە و کەسێك کە دەسەڵاتی هەیە، سەبارەت بە مانای جیاوازی بڕیار دەدەن (Jordan, 1994: 197).

هێزێك کە جیاوازی و بەم پێیەش شوناس دروست دەکا و دەی پارێزێ، هەمیشە لە نێوخۆ و دەرەوەی سنووره جیاوازی و شوناس خولقێنەکان دا لە هەوڵ دایە. ئەم سنوورانە رەنگە بە هۆی دەسەڵاتی هێژمونیکەوە جێگیر بێنە بەرچاو، بەڵام قەت تەواو روون و دزەهەڵنەگر نین. بۆ وێنە سنووره نژادی، رەگەزی، نەتەوەیی و ئیتنیکی‌یەکان کە بە شێوەی کۆمەڵایەتی دروست دەکرێن، لە لایەنی شوناس سازییەوە بە هیچ شێوەیەك خاوەنی بنەمای سروشتی نین، هەرچەند کە دەسەڵات بەدەوام هەوڵ دەدا ئەوان بە سروشتی نیشان بدا و لەگەڵ هەر چەشنە هۆکارێکی خەوشدارکەری ئەم سنوورانە بە توندی هەڵسوکەوت دەکا (Natter, 1997: 146).

بەڵام لە بەر ئەوەی کە سنوور، جیاوازی و شوناس لە نێوەرۆك دا چوارچێوەهەڵنەگر و رەوانن، هەوڵی دەسەڵات بۆ رەق کردنی ئەوان سەرکەوتوو نەبووە. جیاوازی و شوناسن هەمیشە دەرەتان و پتانسیەلێکیان بۆ خۆبواردن و بەرگری پێك هێناوە و دەسەڵاتە نەیارەکانیش بە کەڵك وەرگرتن لە دەرەتانێکی ئەوتۆ، هەوڵدان بۆ لەقاودانی دەستکرد بوون، رێکەوتیانە و دزەهەڵگر بوونی جیاوازی و شوناسیان دەخەنە رۆژەڤی خۆیانەوە. کەواتە سنووره جیاوازی و شوناس بەردەوام خاڵی ناکۆکیی هێژمونییەکان و دەسەڵاتە رکەبەرەکانە. لە راستی دا "سیاسەتی شوناس" تارادەیەك پێوەندیی بە ململانێی هێزە دژبەرەکانە لەگەڵ سنووربەندی و شوناس سازیی دەسەڵاتی هێژمونێکەوە هەیە کە دەرکران و پەراوێز کەوتنی ژمارەیەك لە شوناسەکانی بەدواوەیە (Hetherington, 1998: 17).

دیارە شکڵ گرتن و زاڵ بوونی روانگەیەکی ئەوتۆ سەبارەت بە مانا، جیاوازی و شوناس بەرهەمی دابڕانەکان و گۆڕانکاریی گەورە لە چەمکی سووژە، خود و شوناس دایە کە لە سەر گوتاری نوێبوونەوە بونیادنراوە. بە پێچەوانەی سەردەمی بەر لە نوێبوونەوە کە تاك بە هۆی نەریتەکان و پێکهاتەکانەوە شوناسی پەیدا دەکرد، مرۆڤی مۆدێرن سەربەخۆ لە گرێدراوییە کولتوورییەکان پێناسە دەکرێ. گۆڕانکارییەکانی وەك چاکسازیی ئایینی، رێنسانس، شۆڕشە زانستی و رووناکبیرییەکان، تێگەیشتن و خوێندنەوەیەکی نوێی لە مرۆڤ بردەو پێداوە و هەڵسەنگاندنی جیاوازیان لە توانایی و کارامەییەکانی ئەو خستە بەرچاو.

مرۆڤی جێگای مەبەستی کانت بریتی بوو لە سووژەیەکی ئاوەزمەند و وشیار. لاکیش قسە لە "سووژەی بە دەسەڵات" دەکا و دەڵێ ئەو بە شوناسێك دا دەزانێ کە هاوچەشن و جێگیر دەمێنێتەوە. فیلسوفە دیارەکانی دیکەی رۆژئاواش لە سەر چەمکی مرۆڤی دەسەڵاتدار، خاوەن هێژمونی و ئاوەزخواز و شوناسی یەکپارچە و دابەش نەبوو پێ دادەگرن. بەڵام لە درێژایی



سەدەی بیستەم بە تایبەت لە نیوەی یەکەمی ئەو دا، روانگەیەکی ئەوتۆ کەوتە بەرپرسیار. لەم پێوەندییە دا ستوارت میل باس لە پێنج دابڕان یا گۆڕانکاریی گەورە لە گوتاری ناسینی مۆدێرن دا دەکا کە بەستێن مەندبوونی شوناس و چەند پارچە و دژوازبوونی سووژە دەردەخەن.

مارکسیسم هەر چەشنە چەمکێکی بەڕێوەبەریی تاکەکەسی وەلانا و گرنگی بە بەستێن و پێکهاتەی کردار بەخشی. ئەم تیۆرەی فرۆید کە شوناسەکان لە سەر بنەمای پرۆسەکانی بیاڤی نەست شکڵ دەگرن و ئەو نەستە بە لۆژیکێکی جیاواز لە لۆژیکی خۆی کار دەکا، چەمکی سووژەی زانا و خاوەن شوناسی تاقانە و جێگیری خەسارهەڵگرتر کرد. زمانناسیی پێکهاتەیی سوسۆر ئەم ئاکامە لۆژیکییەی لێ‌کەوتەوە کە ئەگەرچی شوناسەکان مەیلیان بە لای داخران و رەقبوون دا هەیە، بەڵام بەردەوام بە هۆی جیاوازییەکان دەشێوێن، چونکە جیاوازی لە ناخ دا رەوان و سنوورهەڵنەگرە (Hall, 1996: 286 – 88).

هزر و بەرهەمەکانی فوکۆش لە سەر متمانە پێ نەکراویی روانگەی مۆدێرنیستیی شوناس و تاك زۆر شوێندانەر بوو. فوکۆ لە رەچەڵەکناسیی سووژەی مۆدێرن دا باس لە هێزی تەکووزی خولقێن دەکا کە دەیهەوێ بە بێ چاوەدێری بە سەر تەواوی حەشیمەت و تاك، فەرمانڕەوایی بکا. ئەو پێی وایە ئەم روانگەیەش لە خزمەت هێز دایە. پێنجەمین دابڕان یا گۆڕانکارییەك کە هاڵ باسی دەکا، فیمنیسمە کە وەك بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی، دەستکرد و رەوان و دەسەڵات تەوەربوونی شوناس دەردەخا. بە هەر حاڵ لە ژێر کارتێکردنی ئەم پێنج گۆڕانکارییە دا، سووژەی رۆشنگەری کە خاوەنی شوناسێکی جێگیر و بەردەوام بوو، بوو بە شوناس گەلێکی کراوە، دژبەیەك، ناتەواو چەند پارچە (Hall, 1996: .289_291).

خوێندنەوەیەکی ئەوتۆ لە شوناس نیشانەی گەرۆکی ، جۆراوجۆری و فرەیی سەرچاوەکانی شوناس دۆزینەوەی تاکە کە تایبەتمەندیبەخشی ژیانی کۆمەڵایەتی لە جیهانی هاوچەرخ دایە. زۆر لەو تیۆریستانەی کە قسە لە داهاتنی قۆناخ یان سەردەمێکی نوێ دەکەنو باس لە" پۆست مۆدێرنیتە"، **"سەردەمی جیهانی "و" نوێبوونەوەی پێشکەوتوو"** دەکەن، شوناسسازی جیاوازیش بە تایبەتمەندیی ئەم سەردەمە نوێیە لە قەڵەم دەدەن. دیارە ئەم شوناس سازییە جیاوازە زۆرتر قەیرانی جیددیی لەگەڵ دایە و هێندێك جار جۆرێك تایبەتگەرایی کولتووریی لێدەکەوێتەوە، لەم پاژەی باسە کە دا هەوڵ دەدەین دەریخەین کە ئەم قەیرانانە چۆن شکڵ دەگرن و رۆڵی پرۆسەی بەجیهانیبوون لە پێوەندییە دا چیە.

## بەجیهانیبوون و شوناس سازیی نەریتی

ئیدعای ئەم توێژینەوەیە ئەمەیە کە پرۆسەی بە بەجیهانیبوون بە هۆکاری سەرەکیی تایبەتگەرایی کولتووری دەژمێردرێ.  ئەم پێوەندییە هۆکردانەیە بەم شێوەیە دادەمەزرێ کە پرۆسەی بەجیهانیبوون بە گۆڕینی هەلومەرج و چوارچێوە نەریتییەکانی شوناس سازیو لاواز کردن و تێك رووخاندنی هۆکارو سەرچاوە نەریتییەکانی شوناس، پرۆسەی شوناس سازی لە جیهانی ئێستا دا دژوازیان بە واتایەك " پرابلمتیك" دەکا . ئەم دۆخە دژوارو " پرابلمتیك"ە ، بەستێنی زۆر لە تایبەتگەراییە کولتوورییەکانە. بۆ روونتر کردنەوەی ئەم قسەیەو شیکاریی پێوەندیی هۆکردی نێوان پرۆسەی بەجیهانیبوونو تایبەتگەراییە کولتوورییەکان وێرای دەس نیشان کردنی هەلومەرج و هۆکارەکانو سەرچاوەکانی شوناس سازیی نەریتی (و) کارتێکەریی قەیران خولقێنی پرۆسەی بەجیهایبوون لە سەر ئەوان تاوتوێ دەکەین.

پێشتر باسمان کرد کە شوناسەکان هەموویان دروست دەکرێن و هەرچەند سروشتی بێنە بەر چاو ، بەڵام لە راستی دا سروشتی و هەربوو (ژاتی) نین . دەسەڵاتە هێژموونیکەکان بەردەوام خەریکی شوناس سازین و بۆ پاراستنی ئەم شوناسانە هەوڵ دەدەن. کەواتە ئەگەر شوسانەکان دروست دەکرێن دەبێ سەرچاوە و کەرەستە گەلێك بۆ دروست کردنی ئەوان هەبێ. بە وتەیەکی دیکە هەر کۆمەڵگەیەك دەبێ سەرچاوە گەلێکی شوناسبەخش و ماناخولقێن بخاتە بەر دەست ئەندامەکانی خۆی تاوەکوو ئەوان بتوانن شوناسیان هەبێ و ژیانی خۆیان مانادار بکەن. هەلومەرجو چوارچێوەی پێویست بۆ ئاوێتە کردن، پەرداخت کردن و دووبارە واتا کردنی سەرچاوە شوناس بەخشەکانیش بە هۆی کۆمەڵگەو گوتارە زاڵەکانەوە دابین بکرێ.

دیارە زۆربەی خاوەنڕایان لە سەر دەس نیشان کردنی سەرچاوەکانی شوناس جیاوازیی بۆچوونیان هەیەو دیاردە جۆراوجۆرەکان  بە سەرچاوەو کەرەستەکانی شوناس لە قەڵەم دەدەن. پلەبەندی و گرنگیی سەرچاوەکانیش بابەتێکی دیکەی جیاوازیخولقێنی  نێوان ئەوانە. بەڵام سەرەڕای ئەم چەشنە جیاوازیی بۆچوونانە لە سەر ژمارەو گرنگیی سەرچاوەکانی شوناس ، لە روانگەیەکی گشتییەوە دەس نیشان کردنی سەرچاوەکانو هەلومەرجە سەرەکییەکانی شوناس ئەوەندە دژوار نیە. لە دێڕەکانی دواتردا باس لە ژمارەیەك لە سەرچاوەو ئامرازە سەرەکییەکانی شوناس دەکەین.



## شوێن و فەزا

چەمکبەندیی دەرهەستی شوێنو فەزاو خەریکبوون بەم چەمکە سەرەکییانەوە  لە روانگەی فەلسەفییەوە، لە توانای ئەم توێژینەوەیە دا نیەو پێویستییەکیش بە کارێکی ئەوتۆ نیە. کەواتە بۆ چوونە نێو ئەم باسەوە و تێگەیشتن لە چیەتیی ئەم چەمکانە، بە پێکەوە بەراورد کردنی کورتی شوێنو فەزا واز دێنین. دواتر سەبارەت بە گرنگیی شوێنو فەزا بۆ شوناس سازی دەدوێین. لە درێژەی باسەکەش دا روونی دەکەینەوە کە پرۆسەی بەجیهانیبوون چۆن بە تێك دانی پێگەو پێوەندیی شوێنو فەزا، میکانیزمی شوناس سازیی شوێن لە کار دەخات.

بێ گومان یەکەمین لایەنی جیاواز کە لە رەوتی بەراورد کردنی شوێن و فەزا دا زەق دەبێتەوە، ئاستی دەرهەست بوونی ئەو دوو چەمکەیە. دەکرێ بڵێین هەر مرۆڤێك کە ئاوەزێکی ساخلەمی هەبێ ساناتر فەزا هەست بە شوێن دەکا و ئەزموونی دەکا و بە بەراورد لەگەڵ فەزا، پێویستیی شوێن بۆ ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی بە سانایی هەست پێ دەکا. ئەوان تەنانەت بە هۆی شوێنەوە هەست بە فەزا دەکەن و فەزایەکی جیا لە شوێن لە لای ئەوان وێنا نەکراوە. ئەم جیاوازییە لە هەست کردن بە شوێن و فەزا لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە فەزا لە راستی دا دەرهەستر لە شوێنە (Taylor, 1999: 97).

دەرهەست بوونی فەزا بە بەراورد لەگەڵ شوێن لە لایەنی دیکەشەوە شیاوی باسە. فەزا بریتییە لە هەموو جێگایەك، بەڵام شوێن دیاری کراوەو بێ گومان وێنا کردنی هەموو جێگایەك دەبێ دژوارتر لە وێنا کردنی شوێنێکی دیاری کراو بێ. شوێن نێوەرۆکی هەیە، بەڵام فەزا جۆرێك بۆشاییەو فەزایەکی بەتاڵ وەك چەمکێکی ئەندازەیی بە سانایی شیاوی وێنا کردنە. شوێن دوولای هەیە لە حاڵێك دا کە فەزا سێ لای هەیە. خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە شوێن زۆر ساناتر لە فەزا سنوور هەڵگرو شیاوی سنووردارکردنە، لە کاتێك دا کە فەزا بێ ناوەندەو مەیلی بە لای بێ کۆتاییبوون دا هەیە (Morley and Robins, 1996: 115; Sack,1996: 830). هەروەها دەبێ بگوترێ کە شوێن جێگیر دەمینێتەوە، بەڵام فەزا دەتوانێ لە چاو ترووکاندنێك دا ، بە هۆی جێت، فاکس یا مانگیلەوە تێپەرێ (Hall , 1996: 302) .

ئەگەرچی باسی شوێنو فەزا ئاڵۆزترو لێڵ تر لەوەیە کە بتوانین ئاکامێکی گشتگیری لێ وەرگرین، بەڵام  گرنگیی ئەوان بۆ شوناس سازی زۆر روونو گومان هەڵنەگرە. کۆمەڵناسانو بەتایبەت مرۆڤناسان بەردەوام لە سەر ئەم خاڵە پێیان داگرتووە کە شوێن ، ناوچەو خاك بۆ خەڵك زۆر گرنگیی هەیە، چونکە ئەوان توانای شوناسسازییان لە ئاستێکی بەرز دایە. بە

وتەیەکی دیکە شوێن و فەزا لەو ڕووەوە بۆ تاکەکانو گرووپە جۆراوجۆرەکان گرنگە کە توخمەکانو بەشە سەرەکییەکانی شوناس دابین دەکەن .

بێ گومان خاوەن شوناس بوون لە پلەی یەکەم دا بە مانای تایبەتو جیاوازبوون، جێگیرو بەردەوام مانەوە و گرێدراوی بە کۆوەیە. هەر تاکێك کاتێك خۆی بە خاوەنی شوناس دەزانێ کە لەوە دڵنیا بێ جیاواز، بەردەوامە و لە کۆ دایە. شوێن و فەزا گرنگترین هۆکارگەلێکن کە ئەم پێداویستییە شوناسییانە دابین دەکەن. بە وتنێکی ڕوونتر سنوور هەڵگری و شیاوی سنووردارbوونی شوێن و بە هۆی ئەویشەوە فەزا، ئەم دەرەتانە بۆ ئەوان پێك دێنێ کە مرۆڤەکان بە هەست کردن بە جیاواز بوون، جێگیر بوون و گرێدراوی بە گرووپەوە، هێمنایەتی و تەناهیی بۆ ژیان وەدەست بێنن. لە ڕاستی دا هەر کام لە سێ تایبەتمەندییە شوناس خوڵقێنەکانی شوێن لە سەر تایبەتمەندییەکی سەرەکیی ئەو ( سنوور هەڵگری وجێگیر بوون ) ڕاوەستاون.

هەستی جیاواز بوون (کە دیتران)، وەك بەشێکی جیانەکراوەی شوناس (Guibernau, 1996: 134) پێویستی بە بوونی سنووری بەردەوام و کەم تا زۆر دزەهەڵنەگرە. بە هەر ڕادەیەك ئەم سنوورانە و ئەو جیاوازییانەی لە سەر ئەوان بونیادنراون ، ڕوونترو وردتر بن، پێویستیی جیاواز بوون لە دیتران بە باشی دابین دەبێ و شوناسی تاکەکان و گرووپەکان خەسارێکی جیددیی پێ ناگا. لە بەر ئەوەی کە کێشانەوەی ئەم سنوورو جیاوازیانە لە سەر ڕووبەری شوێنو دووبارە بەرهەمهێنانەوەی ئەوان لە گوتاری زاڵ دا ساناترە، شوێن و سەر زەوی (خاك) دەبنە بەستنێکی لەبار بۆ شوناس سازی و بەردەوامیدان بە شوناس.

شوێن و خاك نەك تەنیا بە کردەیی کردنی سنووربەندییە بینراوەکان لە ڕێگای تایبەتمەندییە جوغرافیاییەکانی وەك چۆم ، زنجیرە چیا، دەریا و... پێویستی بە جیاوازیی کۆمەڵایەتی دابین دەکەن و بەڵکوو بە بەهێز کردنی سنوورە سروشتی، کۆمەڵایەتی وکولتوورییەکان شوناس سازیی ساناتر دەکەن. لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا ئەم سنوورانە کەم تا زۆر دەکەوتنە سەر یەك و بەردەوام یەکتریان بە هێز دەکرد. تەنانەت سنوورە سیاسی و نەتەوەییەکانیش ئەگەر لەگەڵ سنوورە شوێنی و سەرزەوینی یەکان دا یەك بگرنەوە، توانایی شوناسبەخشیی زۆرتر وەدەست دێنین.

شوێن نەك تەنیا سنوورهەڵگر و شیاوی سنووردارکردنە، بەڵکوو جێگیریشە. کەواتە بە دابین کردنی پێویستی بە بەردەوام بوونو ڕاوەستاو بوون، لەم لایەنەشەوە بە سەر چاوەیەکی گرنگ بۆ دابین کردنی شوناس دەژمێردرێ . تیۆریستە جۆراوجۆرەکان پێیان وایە کە مرۆڤەکان



کاتێك هەست بە بەردەوامیو جێگیری دەکەن کە لە ژیانی خۆیان دا سەرچاوەگەلێکی نەگۆڕو جێگیریان هەبێ. شوێن و خاك لە ڕیزی باشترین دابینکەرەکانی ئەم جۆرە سەرچاوەو ئامرازانە دان. بە پێچەوانەی فەزا کە دنیایەکی گەرۆكو بێ ناوەند بۆ تاکەکان دابین دەکا، شوێن لەبەر ئەوەی ڕووکارەکانی دیاریکراوە و توخمگەلێکی نەگۆڕی هەیە، دنیایەکی جێگیر بەدی دێنێ (Morley and Robins, 1996: 121).

سێهەمین ئەرکی شوناسسازی شوێن پێوەندیی بە دابین کردنی یەکگرتوویی و لێك گرێدراویی کۆمەڵایەتییەوە هەیە کە هەستی گرێدراو بوون بە کۆوە دابین دەکا. لە ڕاستی دا توانای شوێن بۆ بەڕێوەبردنی ئەم ئەرکەی بۆ جێگیری و سنوورهەڵگریی ئەو دەگەڕێتەوە.. هەروەك کە شوێن بە دروست کردن و پاراستنی سنوورە دیاریکراو و دزەهەڵنەگرەکان پێویستیی جیاوازبوون دابین دەکا، بە هۆی سنووردارکردنی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕووبەرێکی تارادەیەك بچووك و داخراو دا، هەستی گرێدراوبوون بە گرووپ دەخوڵقێنێ. شوێن و خاك لەورووەوە کە پانتایی پێوەندیی کۆمەڵایەتی سنووردار دەکەن چڕیی ئەو پێوەندییە بێ گرێدرە و ڕووبەڕوویەکان زیاد دەکەن و جۆرێك لێك گرێدراوی و یەکگرتوویی کۆمەڵایەتیی بەهێز دەخوڵقێنن.

کەواتە بە شێوەیەکی گشتی ڕۆڵی تەوەریی شوێن و فەزای شوێنمەند لە شوناس سازی و پاراستنی و دووبارە بەرهەمهێنانەوەی شوناس دا دەتوانین بەم شێوەیە کورت بکەینەوە: شوناس لە پلەی یەکەم دا بریتییە لە جیاوازبوون لە تاکەکان و گرووپەکانی دیکە، هەستی بەردەوامی و جێگیری لە درێژایی زەمەن دا و هەستی گرێدراوی بە کۆوە. کەواتە هەر چەشنە شوناس پەیدا کردنو شوناس سازییەك پێویستی بە دانانی سنوورو گرێدران بە سەرچاوە جێگیرو بەردەوامەکانە و شوێنی سنوورهەڵگرو جێگیر ئەم پێداویستیە بەباشی دابین دەکا. بە وتنێکی دیکە، شوێن دنیایەکی تارادەیەك بچووك، جێگیر و ناسیاو بۆ تاکەکان و گرووپە مرۆییەکان دابین دەکا.

بە سەرنجدان بەم تایبەتمەندی و تواناییانەی شوێن بە سانایی دەتوانین تێ بگەین کە بۆ لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا و بەر لەوەی پرۆسەی بەجیهانیبوون پرتاو و گشتگیر بێ، قەیرانی شوناس گرینگییەکی ئەوتۆی نەبوو. ئەگەرچی هۆکاری دیکەش لەم پێوەندییە دا دەتوانین دەس نیشان بکەین، بەڵام بە پێی ئەم توێژینەوەیە پێگەی شوێن ( ناوچەو خاك) لە ژیانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگە نەریتییەکان دا دەبێ بە گرنگترین هۆکار بژمێرین. لەبەر ئەوەی کە لەم

کۆمەڵگایانە دا ژیانی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی بنەمایی شوێنمەندو سەرزەوی تەوەر بوو، پرۆسەی شوناس پەیداکردنو پاراستنی شوناس ئەوەندە دژوار نەبوو.

لە رێگای تاوتۆی کردنی پێوەندیی شوێن و فەزا لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا بە سانایی دەتوانین لە شوێنمەند بوونی ژیانی کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵگە نەریتییەکان دا بسەلمێنن. بەپێچەوانەی کۆمەڵگە مۆدێرنەکانو ئەو کۆمەڵگانەی کە لە ژێر کارتێکەریی پرۆسەی بەجیهانیبوون دان ، لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا فەزا بە تەواوی لە ژێر زاڵێتیی شوێن دابووو بەستراوە بەو بوو. لەم رووەوە فەزای نەریتی لەگەڵ پانتایی شوێن یەکیان دەگرتەوە و بە نیشانەکانی شوێن پڕ دەبۆوە. ئەو کردەوەو کردارانەی کە ئەم فەزایەیان پڕ دەکردەوە، هەموویان شوێنمەند بوون. ئەم فەزایە، فەزایەیی سنووردار بوو بۆ ژیان کردن لە چوارچێوەی ئەو دا نەك بۆ بزووتن لە پانتایی ئەو دا (Lash and Urry, 1994: 55) .

هەروەك گیدێنز بە جوانی باسی دەکا، لەو کۆمەڵگایانەدا فەزا لە شوێن جیا نەبووو زەمەن و فەزا لە بەستێنی شوێن دا ( پێکەوە) پێوەند دەبوون (Giddens, 1991: 16). ئەم پێوەندییە چڕەی فەزاو زەمەن لەگەڵ شوێن پانتایی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان زۆر بەرتەسك و سنووردار دەکردەوەو زەمینە سازی دروست بوونی یەکە کۆمەڵایەتییە بچوکترەکانی وەك هەریم ، ناوچە ، هۆز بوو. لەم کۆمەڵگایانەدا هەموو پێوەندییەکان و کردارە دەروونییە کۆمەڵایەتییەکان لە ژێر زاڵێتیی" ئامادەیی" دابوونو رووکاری باڵادەستی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە پێوەندیی راستەوخۆ و رووبەروو پێك دەهات.

ڕۆڵی تەوەریی شوێن لە رێکخستنی فەزاو زەمەن دا و بەم پێیە رێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا، ئەگەرچی پانتایی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی زۆر بەرتەسك دەکردەوە، ئەگەرو بواری قەیرانی شوناسی دەگەیاندە نزمترین ئاست. لەم هەلومەرجەدا نەك تەنیا سنووره سەرزەوینییە بینراوەکان دیار و دیاریکراو بوون، بەڵکوو فەزای کۆمەڵایەتیش سنورگەلێکی کەم تا زۆر دزە هەڵنەگر و ئەستووری هەبوو. رادەی لێك گرێدراویو یەکگرتوویی کۆمەڵایەتیش زۆر لە سەرێ بوو. لە راستی دا کۆمەڵگە نەریتییەکان دنیاگەلێکی بچووکو یەکگرتوو بوون کە هەموو هۆکارو سەرچاوە شوناسبەخشەکان لە رێگای شوێنەوە، ئەرکی شوناس سازیان بە باشی بەرێوە دەبرد. کەواتە هەر هۆکارێکی کە لە کارخەری ئەرکی شوناس سازی شوێن بێ، بێ گومان بوار بۆ قەیرانی شوناس خۆش دەکا.





ئەگەرچی بە فۆرم گرتن و گەشە و پەرەگرتنی نوێبوونەوە لە کارکەوتوویيەکی ئەوتۆ دروست بوو، لەکارکەوتوویی سەرچاوەگرتوو لە پرۆسەی بەجیهانیبوون زۆر بەر بڵاوترو بەر چاوتر بوو. پرۆسەی بەجیهانیبوون بە هۆی پێشکەوتنی سەرسووڕهێنەری تیکنۆلۆژیی پێوەندییەکان، رەوتی دابڕانی شوێنو فەزای بە تاو کردو هەوداکانی بەستنەوەی فەزای کۆمەڵایەتی بە شوێنو سەرزەویی دیاریکراوی زیاتر لە پێشوو پچراند. بەم چەشنە بابەتی کۆمەڵایەتی لە بازنەی بەرتەسکو سنووورداری شوێن دەرباز دەبێ و لە فەزایەکی زۆر بەریندا پەرەدەگرێ.

ئەم لایەنە لە پرۆسەی بەجیهانیبوون کە پێوەندیی نێوان شوێنەکانی ژیانی تاکەکان لەگەڵ شوناسەکانیان بەتەواوی دەگۆڕێ، سەرنجی تێۆریستە جۆراوجۆرەکانی راکێشاوە. بۆ وێنە ئاپادورای و فیزرستون قسە لەسەر زەوی سڕینەوە دەکەن[59] ، تامپسۆن ناوچەسڕینەوە[60] بە دەرهاویشتەیەکی گەورەی بەجیهانیبوون دادەنێ و گیدێنزیش وشەی جێگۆڕکێ[61] بەکاردێنی. ئەگەرچی ئەم وشانە باری مانایی تا رادەیەك جیاوازیان هەیە، بەڵام لە راستی دا هەموویان پێوەندییان بە گۆڕانی پێوەندیی نێوان شوێن لەگەڵ کولتوور و شوناسەوە هەیە، گۆڕانکارییەك کە دەرهاویشتەی راستەوخۆی بەجیهانیبوونە (Tomlinson, 1999b: 106).

مرۆڤناسێکی فەرەنسی ئەم بابەتەی خستۆتە بەر باس ، قسە لە جێگۆرکێی ناوچە و شوێنەکان لەگەڵ "ناشوێنەکان[62]" دەکا: ئەگەر بتوانرێ شوێنێك وەك بابەتێکی خاوەن نزیکایەتی یان مێژوویی یان پێوەندیدار بە شوناسەوە پێناسە بکەین، فەزایەك کە ناتوانین ئەو وەك بابەتێکی خاوەن نزیکایەتی یان مێژوویی یان پێوەندیدار بە شوناسەوە پێناسە بکەین، دەبێتە ناشوێنێك. بەرای ئەو نوێبوونەوەیە ئێستا لە پێشکەوتووترین قۆناغی خۆی دا، پێوەندییەکانی مرۆڤەکان لەگەڵ ئەم ناشوێنانە زیاتر دەکا. ئەمانە جێگاگەلێکی سۆپێر مۆدێرنن کە لە شوێنە مرۆڤناسییەکان جیاوازن(Auge`, 1995: 78,94).

ئووژە پێداگری دەکا کە لە قۆناغەکانی پێشووی نوێبوونەوە دا، پێوەندیی نێوان ئێستا و رابردوو، نوێ و کۆن و بە تایبەت شوێنو بیرەوەری و شوناس پتەو بوو، بەڵام سوپێر مۆدێرنیتە ئەم دۆخە بە توندی دەخاتە مەترسیەوە و ئەم پێوەندییە لاواز دەکا. لە نا شوێنەکان دا، کردارە

59- deterritorialization
60- delocalization
61- dis-placement
62- non- place

دەروونییە ئۆرگانیکە دیالۆگ تەوەرەکان جێگای خۆیان دەدەن بە نیشانەی بێدەنگەکان کە پێویستی وتووێژ ڕەت دەکەنەوە. بە وتەیەکی دیکەی ناشوێنەکان شوێنەکانی تەنیایی، بێدەنگی، ون ناوی، لە خۆبێگانەیی (نامۆیی) و ناجێگیریین کە پێوەندیی ئۆرگانیکی لەگەڵ کۆمەڵگەیەك کە لە درێژایی زەمەن دا بەردەوام بووە خەوشدار دەکا (Auge`, 1995: 92-97).

دیارە نابێ لەم چەشنە باسانە ئاکام وەرگرین کە پرۆسەی بەجیهانیبوون، شوێن، ناوچە و سەرزەوی لە نێودەبا و تیۆریستەکان لە زۆربەی باسەکانی پێوەندیدار بە سەرزەوی سڕینەوەش دا ماناو خوێندنەوەیەکی ئەوتۆ یان لەبەر چاو نیە. باس لە گۆڕانی پێوەندیی نێوان شوێن و شوناس دەکرێ، نەك پچڕانی ئەم پێوەندییە بە هۆی لە نێوچوونی شوێنەوە. ئەگەر قسە لە پچڕانی پێوەندیش بکرێ، جۆری نەریتیی پێوەندییە. بە وتنێکی دیکە ئەوەی ئیدعا دەکرێ ئەمەیە کە پرۆسەی بەجیهانیبوون لە ڕێگای سەرزەوی سڕینەوە، پێوەندیی سروشتیی نێوان کولتوور و شوناس لەگەڵ پانتاییە جوغرافیاییەکان تێك دەدا و لە نێوی دەبا.

گیدێنز لە باس کردن سەبارەت فەزا، زەمەن و کارتێکەرییە دوولایەنە کۆمەڵایەتییەکان دا، ئەم خاڵە بە باشی روون دەکاتەوە. هەروەك لە باسی تێۆرەکانی بەجیهانیبوون دا روونمان کردەوە، یەکێك لە تەوەرەکانی باسەکەی گیدێنز ئەمەیە کە نوێبوونەوە هۆکاری دەربازبوونی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە سنووردارێتییەکانی کارتێکەرییە دوولایەنە راستەوخۆکان لە چوارچێوەی ناوچەکانو سەرزەوییە سنووردار و دیاریکراوەکان و بەرینکردنەوەی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە رووبەری زەمەن و فەزا دایە. بەڵام ئەم دیاردەیە کە جەوهەری پرۆسەی بەجیهانیبوونە، بە هیچ شێوەیەك ڕێگا لە بەردەوامیی ژیان لە ناوچە دا ناگرێ. بەڵکوو خەوشدارکەری کارکردی نەریتییەکانی شوێن، ناوچە و سەرزەوی لە بواری شوناسو کولتوورە (Tomlinson, 1999b: 107).

دەوری نەریتیی شوین، ناوچەو سەرزەوی لە دروست کردن و پاراستنی شوناس دا لەم رووەوە زۆر کەمڕەنگ دەبێ کە پرۆسەی بەجیهانیبوون زیاتر لە پێشوو بوار بۆ فەزامەندبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی پێك دێنێ. هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێ کرد، لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا، مرۆڤەکان پێوەندییەکانی خۆیان لە چوارچێوەی زەمەن و فەزایەك دا کە سەر بە شوێن و سەرزەوییەکی دیاریکراو و سنووردارە ، رێك دەخات و دادەمەزرێنێ و گرنگتر لەمە لەو کۆمەڵگایانەدا، شوێنەکان بەباشی لە شوناس پشتیوانی دەکەن(Morley and Robins, 1996: 87).



بەڵام پرۆسەی نوێبوونەوە و بە تایبەت بەجیهانیبوون ئەم دەرەتانە پێك دێنن تاوەکوو مرۆڤەکان لە زاڵێتیی سنووردارکەر و بازنەی تەنگەبەری شوێن رزگار بن و لە پانتایی زۆر بەرینی فەزا و زەمەن دا پێکەوە پێوەندی بگرن. ئەگەرچی لە کۆمەڵگە نەریتییەکانیش دا پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە چوارچێوەی فەزاو زەمەن دا فۆرمیان دەگرت، بەڵام ئەم پێوەندییانە بە هۆی بەستراوەیی فەزا و زەمەن بە شوێنەوە، سنووردار و شوێنمەند بوون. کەواتە شوێن بە تەواوی لە خزمەت کولتوور و شوناس سازیی نەریتی دا بوو. لە حاڵێك دا کە پرۆسەی بەجیهانیبوون بە فەزامەندکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەم توانایییەی شوێن بەتوندی کەم دەکاتەوە. بە روانینێکی دووبارە لە تواناییەکانی شوێن و فەزا لە لایەنی شوناسسازی و شوناس دۆزییەوە، تێگەیشتن لەم خاڵە ساناتر دەبێ.

ئەگەر شوناس بریتی بێ لە جیاواز بوون، بەردەوامی و جێگیری و لە کۆ دا بوون و لەگەڵ دیتران بوون، توانایی شوێن بۆ پاراستنی شوناس زیاتر لە فەزایە. بێ گومان ئەم توخمانەی شوناس لە هەلومەرجێك دا باشتر و ساناتر دابین دەبن کە بتوانرێ سنووری روونتر و دزەهەڵنەگرتر بکێشین، چونکە سنوورەکان دەبنە هۆی ساناتر بوونی بەرهەم هاتنی جیاوازی و یەکگرتوویی و، هاوپێوەندیی گرووپی زیاتر دەکەن. جیاوازی خولقێنیو هاوپێوەندیش مەرجە پێویستەکانی لێك جیاوازبوون و لە کۆ دا بوونن. سەرچاوە جێگرو جێگیرتووەکانیش بۆ بەردەوامی پێویستن، بەڵام فەزا توانایەکی ئەوتۆی بۆ دابین کردنی ئەم پێداویستییانەی شوناس نیە.

لەحاڵێك دا لە شوێن سنوورهەڵگر و سنووردارکراوە، فەزا ناوەند بەزێن و سنووردار نەکراوە. شوێن بەردەوام مەیلی بەلای جێگیری و ڕەقبوون دا هەیە، بەڵام فەزا کاروبار گەڕۆکترو ئازادتر دەکا. شوێن، مەوداو جیایی دەخولقێنێ، بەڵام فەزا نزیکیو تێکەڵاوی. هەروەها لەبەر ئەوەی کە سنوورهەڵگریو توانایی سنووردار کردنی فەزا لە شوێن کەمترە، فەزا ناکۆکی هەڵگرتر لە شوێنە ، لە راستی دا هەر بەم هۆیەیە کە شوێن شیاوی کۆنترۆڵتر لە فەزایە (Natter, 1997: 149-150) .

هەر ئەم تایبەتمەندێتییە جیاوازانەی شوێنو فەزا، بنەمای تواناییە نایەکسانەکانی ئەوان لە بواری دروست کردن و پاراستنی شوناس دایە. لە بەر ئەوەی کە فەزا سنووربەزێن و سنوورهەڵنەگرترە ، ناتوانێ چوارچێوەیەکی پاوانکارانە و تارادەیەك دزەهەڵنەگر بۆ شوناسەکان پێك بێنێ. کەواتە فەزا بە سانایی دەبێتە گۆڕەپانی رمبازێنی شوناسەکان و دەرەتانی

شوناسخوازیی ناچالاکانەی نەریتی کەم تا زۆر لە نێو دەبا. بەڵام چوارچێوەهەڵگری و سنوورهەڵگریی شوێن، دنیاگەلێکی سنووردار، دیاریکراو و تارادەیەك جێگیری بە دیاری هێنا بوو کە دانیشتووانی ئەو [(شوین)] لە باری شوناسەوە کەڵکەڵەیەکی ئەوتۆیان نەبوو.

کەواتە بە سەرنجدان بەم خاڵانە دەتوانرێ بگوترێ کە سەرزەوی سڕینەوەی سەرچاوەگرتوو لە پرۆسەی بەجیهانیبوون، جۆرێك قەیرانی شوناس دەخولقێنێ، چونکە توانایی شوناس سازیی شوێن لە نێو دەباو ناوچە دەکاتە فەزایەکی کولتووریی ئاڵۆز. لە ژێر کارتێکەری پرۆسەی بەجیهانیبوون دا، فەزا، کە ناشوێنێکە دەبێتە بەستێنی ژیانی کۆمەڵایەتی و پێوەندیی ڕاستەوخۆو ساکاری نێوان شوێن، کولتوور و شوناس تێك دەچێ. ئەوەی دەبێتە جێگیرەوەی ئەو پێوەندییە ڕاستەوخۆ و ساکارە، بریتیە لە پێوەندیی ئاڵۆزو دیالکتیکیی نێوان شوناس فەزا. بێ گومان فەزایەك کە مل بۆ جێگیری، وەستانو گشتێتی ڕانەکێشێ، بەستێنێکی دڵنیا بۆ شوناس سازیی پێك ناهێنێ (Natter,1997:153-54) .

## زەمەن

زەمەن یەکێکی دیکە لە هۆکارە شوناس سازەکانە. دەکرێ بگوترێ زۆربەی تێۆریستەکان ئەم خاڵە قبووڵ دەکەن کە زەمەن و فەزا مەرجی پێویستی شوناس پەیدا کردنن و بە بێ ئەوان دروست کردنو پاراستنی شوناس جێبەجێ نابێ. بە واتایەك هەروەك ستوارت میل ڕوونی دەکاتەوە، ئەگەر شوناس بە جۆرێك سیستمی دووبارە دەرخستنەوە بزانین، زەمەن و فەزا بە تایبەتمەندێتیی سەرەکیی ئەم سیستمە دەژمێردرێن. هەموو شوناسەکان دەکەونە فەزا و زەمەنی هێماییەوە و ئیدوارد سەعید گوتەنی، جوغرافیای خەیاڵیی خۆیان دەوێ (Hall, 1997: 301).

دیارە بۆ ڕوونکردنەوەی گرنگیی زەمەن لە شوناس سازی دا دیسان دەبێ بگەڕێینەوە بۆ چەمکی شوناس. هەروەك کە لە شیکردنەوەی ڕۆڵی تەوەریی شوێنو فەزای شوێنمەند لە شوناس سازیی نەریتی دا باسمان کرد، بەردەوامی یەکێك لە توخمە بنەماییەکانی شوناسە. تاك کاتێك دەتوانێ بڵێ شوناسم هەیە کە لە بەردەوامیی خۆی دڵنیا بێ. ئەم بەردەوامییە شتێك نیە بێجگە لە هەست کردن بە جێگیریی کەسایەتی لە درێژایی زەمەن دا. شوناس لە سەر بەردەوامی جێگیرەو بەردەوامیش لە چوارچێوەی زەمەن دا مانای دەبێ، تەنانەت ئەگەر بەردەوامی بە مانا لۆژیکییەکەی بێ (Jenkins, 1996: 27).





شیکاریی نیوەرۆك و لایەنەکانی خود(self) یش پێگەی تەوەریی زەمەن دەردەخا. یەکێك لە مانا سەرەکییەکانی خود، تاکێتی یان جەوهەری کەسێك یان شتێك و جێگیری (وەك یەکیی دەروونی) لە درێژایی زەمەن دایە. وەك یەك بوون لە ناخ، پێك هاتەو تایبەتمەندێتییە تاکەکەسییەکان دا، بە بێ بەشداریی توخمی زەمەن شیاوی ئەزموونو هەڵسەنگاندن نیە، هەروەك کە گۆڕانکارییش شتێکی زەمەنمەندە (Hekman, 1999: 5; Jenkins, 1996: 29) .

کەواتە هەر چەشنە شوناسێکی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی پێویستی بە بەردەوامیی تاکەکەسیو کۆمەڵایەتی هەیەو هەست بە بەردەوامییەکی ئەوتۆ ناکەین، مەگەر بوونی ڕابردوویەکی مانادار گریمانە بکەین. لە لایەنی تاکە کەسییەوە، ئەم ڕابردوویە هەمان "یادەوەری"یە و لە لایەنی کۆییشەوە، "مێژوو"یە. هەر تاك و گرووپێك بەردەوامیی خۆی لە سەر یادەوەریو مێژوو دامەزراندوە (Jenkins, 1996: 27). لەم ڕووەوە دەکرێ بگوترێ لە کولتووری هەموو کۆمەڵگەکان دا بە شێوەی جۆراوجۆر لە سەر گرنگیی ژیانەکیی مێژوو پێ دادەگیرێو وشیاریی دراوە کە نەتەوەی بێ مێژوو مەحکووم بە لە نێو چوونە. ئەگەرچی ئەم بەردەوامییە زەمەنییە شوناسبەخشە ڕاستیی نیە، بەڵام ئێمە ئەو لە چوارچێوەی مێژوو دا دروست دەکەین. مرۆڤ لە زەمەنە جۆراوجۆرەکان دا، شوناس گەلێکی جۆراوجۆر وەدەست دێنێ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە لە گۆڕانو ناجێگیری ڕادەکا، گێڕانەوەیەکی ئارام بەخش لە خۆی دروست دەکا تا لە چوارچێوەی ئەودا هەست بە شوناسێکی تاقانە بکا (Hall, 1996: 277).

بێ گومان یەکێك لە ئامرازە بنەماییەکانی ئەم جۆرە گێڕانەوەسازییە، خوێندوەی میکانیکیو هێڵیی زەمەنە. ئەم هێڵە زەمەنییە، ئێستای تاكو کۆمەڵگە بە ڕابردووەوە گرێ دەداو لە چوارچێوەی یادەوەریو مێژوودا یەکگرتوویيو گشتێتی دەدا بە ئەزموونە پڕ ژمارو جۆراوجۆرەکانی ژیانی تاکەکەسیو کۆمەڵایەتی.

لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا، زەمەن بەباشی دەیتوانێ ئەم ئەرکە شوناییەی خۆی بەڕێوە بەرێ، چونکە شوێنمەند بوو. هەروەك گیدێنز بە باشی شیدەکاتەوە، لەو چەشنە کۆمەڵگایانە دا لێکدانەوەو پانتایی زەمەن زۆر سنووردار بوو، چونکە زەمەن پێوەندیی بە شوێنەوە هەبوو. ئەگەرچی هەموو کۆمەڵگە نەریتییەکان شێوازی تایبەتیان بۆ پێوانی کات هەبوو، بەڵام بەر لە داهێنانو برەو ئەستاندنی کاتژمێری میکانیکی، دیاریکردنی زەمەن بە بێ بەکارهێنانی تایبەتمەندی و تایبەتمەندێتییە ناوچەییە دیاریکراوەکان، بەتایبەت نیشانە فەزایی- زەمەنییە سروشتیەکان، نەدەگونجا بۆ وێنە نیشانەکانی وەك دەرکەوتن ، ئاوا بوونو نیوەڕۆ، نەك تەنیا

وردو هەڵسەنگێنراو نەبوون، بەڵکوو پێوەندییەکی توندیان بە شوێنی بە کارهێنانەوە هەبوو و نەدەکرا ئەوان بۆ هەڵسەنگاندنی گشتیی زەمەن بە کار ببرێن (Tomlinson, 1999b: 49).

لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا مرۆڤەکان بە سانایی دەتوانن رابردووی خۆیان دووبارە دەس نیشان بکەنەوەو بە ئێستاوەی گرێ بدەن تا بە جۆرێك هەستی بەردەوامیو جێگیریی تاکەکەسیو کۆیی لە درێژایی زەمەن دا بگەن. زەمەنی شوێنمەند، زەمەنێکی هێڵی بوو کە تاك وێرای ئەندامانی دیکەی کۆمەڵگە بە شێوەیەکی وشیارانە و هاوبەش تێپەڕینی ئەویان ئەزموون دەکرد. کەواتە لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا بە هۆی زەمەنی شوێنمەندەوە، دڵنیایی لە بەردەوامیو بوونی رابردوویەکی هاوبەش ئەوەندە دژوار نەبوو و زەمەن ئەرکی شوناسسازیی خۆی بە باشی بەرێوە دەبرد.

پێگەی بەرچاوی نەریت لە کۆمەڵگە نەریتییەکانیش دەربڕی ئەم خاڵەیە " لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا، رابردوو رێزی لێ [دەگیرا] نەریت ئامرازێك [ بوو] بۆ دەستێوەردان لە زەمەن و فەزا دا " چونکە" هەر چالاکی یان ئەزموونێکی تایبەت[ دەخرایە] چوارچێوەی بەردەوامیی رابردوو، ئێستاو داهاتووەوە" (Giddens, 1990: 37_8) .

بەڵام نوێبوونەوەو پرۆسەی بەجیهانیبوون، هەروەك فەزا وەکوو چوارچێوە لە نێو دەبا، زەمەنیش وەکوو بەردەوامی لە نێو دەبا. لە ژێر کارتێکەریی ئەم پرۆسەیە دا، زەمەن ئەوەندە دەپەستێوترێ کە ئیتر ناتوانێ لە خزمەت شوناسە تایبەتەکان دا بێ.

ئەم پەستێوتراوییو گۆڕانە دیاردە ناسانەیە، زەمەن لە بابەتێکی هێڵی و کرنۆلۆژیکەوە دەکاتە ئێستای بێ کۆتایی. جیهان لە چوارچێوەی فەزایەکی روونو جیانەکراوەدا دەپەستێوێ و جۆرێك دنیای کاتەکی دەخوڵقێنێ. پێوەندیی نێوان رابردوویەکی هاوبەشو ئێستایەکی هاوبەش دەپچڕێنێ و تەکووزیی نەریتیی دامەزراو لە سەر شوێنە پاوانییەکان بەردەوامیە مانا بەخش و شوناس سازەکان لە نێو دەبا. لە دنیایەکی ئەوتۆدا نە فەزا دەتوانێ پێویستیی تاك بە جیاوازبوونو بەردەوام بوون دابین بکا ونە زەمەن دەتوانێ ئەم کارە ئەنجام بدا (Morley and Robins, 1996: 115; Silverman, 1999: 50-51).

لەم روانگەیەوە دەتوانرێ بگوترێ کە پرۆسەی بەجیهانیبوون توانایی شوناس سازیی زەمەنیش زۆر کەم دەکا. ئانتۆنی گیدێنز لە تیۆریستە دیارەکانی نەتەوەگەرایی و ئیتنیسیتە، بە رەخنە گرتن لە روانگەی کەسانێك کە پێیان وایە کولتوور شوناسێکی جیهانی دروست دەبێ، ئاماژە بەم کارتێکەرییەی بەجیهانیبوون دەکا. بە بۆچوونی ئەو نێوەرۆکی کولتوورو شوناس لە رابردوویی هاوبەش پێك هاتووەو یادەوەریی کۆیی لە سەر زەمەن وەك بەردەوامی دامەزراوە.





ئەگەر پرۆسەی بەجیهانیبوون، دنیایەکی " بێ زەمەن" دەخوڵقێنێ ، لە راستی دا یەکێك لە ئامرازو سەرچاوە سەرەکییەکانی شوناس دۆزینەوە لە نێو دەبا( smith, 1995: 24).

## کولتوور

پێشتر گوتمان کە فەزا و زەمەن تایبەتمەندێتیو ئامرازە سەرەکییەکانی دروست کردنو پاراستنی شوناسن و لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا. پێوەندیی توندوتۆڵی ئەم دوو وتەزایە لەگەڵ شوێن، توانایەکی بەرچاوی بە وان دابوو. بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون بە گۆڕینی فەزاو زەمەن و جیا کردنەوەی ئەوان لە شوێن، ئەم تواناییەی تارادەیەکی زۆر کەم کردەوە. ئێستا دەمانهەوێ باس لەم خاڵە بکەین کە کولتووریش لە ژێر کارتێکەریی پرۆسەی بەجیهانیبوون دا، لە جێ بەجێ کردنی ئەرکی شوناسسازیی خۆی دا، تووشی قەیرانێکی نوێ بووە. بەم مەبەستە دوای باسێکی کورت سەبارەت بە کولتوور وەك دابینکەری کەرەستەکان و سەرچاوە پێویستییەکان بۆ شوناس سازی باس لە پێگەی کولتوور لە شوناس سازیی نەریتیی دا دەکەین تا روون بێتەوە کە لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا کولتوور چۆن لە خزمەت دروست کردن و پاراستنی شوناس دا بووە. دیارە ئەم بابەتە گرنگە بە سەرنجدان بە پێوەندیی کولتوور لەگەڵ شوێنو فەزا دەخرێنە بەر باس. دواتر باسەکە بە کارتێکەریی بەجیهانیبوون لە سەر کولتوور تەرخان دەکەین و بە شیکاریی ئەم کارتێکەریو پێوەندییە، هەوڵ دەدەین ناکارامەیی کولتوور لە بواری شوناس سازیی نەریتیی دا شی بکەینەوە.

بێ گومان دەبێ کولتوور بە گرنگترین و دەوڵەمەندترین سەرچاوەی شوناس دانێین. تاکەکان وگرووپەکان بەردەوام بە هۆی بەش و توخمە کولتوورییە جۆراوجۆرەکانەوە شوناس وەدەست دێنن، چونکە ئەم بەش و توخمانە تواناییەکی بەرچاویان بۆ دابین کردنی پێویستیی مرۆڤەکان بە جیاوازبوون و ئاوێتەبوون لە کۆ دا هەیە. بە وتەیەکی دیکە کولتوور هەم جیاوازی خوڵقێنە، هەم یەکگرتووکەرە. هەر کەسێك کاتێك کە ژیان بە شێوەیەکی تایبەت رێك دەخا، لە راستی دا خۆی دەخاتە چوارچێوەی دنیایەکەوە کە بە هۆی ئەوەوە سنوورەکانو جیاوازییە کولتوورییەکان لە دنیاکانی دیکە جیا دەبنەوە.

لەم روانگەیەوە کولتوور وتەزایەکی جیاوازی تەوەرە و شێوە ژیانێکی تایبەت دروست دەکا. ئەم جیاوازی و تایبەتمەندێتییە نەك تەنیا دەرەتانی شوناس وەدەست هێنان پێك دێنێ، بەڵکوو مانا بە ژیانی مرۆڤەکانیش دەدا. کاتێك کە باس لە کولتوور دەکەین ئاماژە بەو شێوازانە دەکەین کە مرۆڤەکان بە شێوەیەکی تاکەکەسی و کۆیی ، لە رێگای پێوەندی لەگەڵ

دیتران ژیانی خۆیان مانادار دەکەن(Tomlinson, 1999b: 18). دیارە ئەم پێوەندییە کاتێك مانابەخش دەبێ کە لە چوارچێوەی سنوورە شوناسییەکان دا دامەزرێ و لە هەمان کات دا یارمەتی بە بەهێزبوون و پتەوبوونی ئەم پێوەندییانە بکا. لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا کولتوور بە باشی ئەم ئەرکە بەرێوە دەبا، چونکە توانایی جیاوازی خوڵقاندن و مانابەخشینی یەکجار زۆرە. لەو کۆمەڵگانە دا کولتوور نەك تەنیا سنوور گەلێکی روون و بەردەوامی دادەنا، بەڵکوو لە خستنە رووی سیستم گەلێکی مانایی یەکگرتوو و هێورکەریش دا بە توانا بوو. کەواتە ئەم مرۆڤانەی کە دەکەوتنە دنیایەك کە بە کولتوورێکی دیاریکراو دروست ببوو، بە شێوەیەکی ئوتوماتیك و چالاکانە دەبوونە میراتگری شوناس و سیستمێکی مانایی ئامادەو هەر چەشنە قەیرانێکی شوناس و مانا لە نێو دەچوو. ئەم توانایییە بەرچاوەی کولتوور لە بواری شوناسسازیی و مانا بەخشی دا، لە پلەی یەکەم دا بۆ پێوەندیی توندوتۆڵی کولتوور لەگەڵ شوێن و سەرزەوی دەگەڕێتەوە.

کولتووریش وەك فەزا لە کۆمەڵگەی نەریتی دا پێوەندیی بە ناوچەیەکی داخراوەوە هەبوو. ئەم پێوەندییە بە چەشنێك توندوتۆڵ بوو کە شوێنەواری لە سەر چەمك بەندیی کولتووریی دادەنا. لە ژێر کارتێکەریی ئەم پێوەندییە دا وادەزانرا کە کولتوور شتێك جگە لە دروست کردنی مانا لە چوارچێوەو بازنەیەکی تایبەت و دیاریکراو دا نیە. هەروەها پێداگرتن لە سەر وەسەریەککەوتوویی و یەکگرتوویی، تەوەری روانینی کۆمەڵناسانەی لە چەمکی کولتوور پێك دێنا (Eade, 1997: 25). ئەم چەشنە روانینە لە کولتوور هەر چەند تارادەیەك زێدگۆیانە بوو، بەڵام نیشانەی راستیی شوێنمەند بوونی کولتوورە.

لە بەر ئەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی شوێنمەندو سەرزەوی تەوەر بووو پێوەندیی کارتێکەرییە دوولایەنە کۆمەڵایەتییەکان زۆرتر لە پێوەندییە رووبەڕووییەکان دا کورت دەبۆوە، بەرهەمە کولتوورییەکانیش زۆر بە کەمی لە دەرەوەی چوارچێوەی ژیانی کۆمەڵایەتی دا برەویان پەیدا دەکرد. سنوورەکانی یەکە بچووکە کۆمەڵایەتییەکان زۆرتر لەگەڵ سنوورە کولتوورییەکان دەکەوتنە سەریەك و یەکتریان بەهێز دەکرد. بەم چەشنە هێزی بەرگێڕانەوە و سنووردارەکەرانەی شوێن، کولتووریش لە بازنەی بەرتەسکی خۆی دا گەمارۆ دەدا و بە بەستنەوەی ئەو بە یەکەیەکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراو، دنیایەکی بچووك و تارادەیەك داخراوی دەخوڵقاند کە دەکرێ بگوترێ کە سنوورەکانی دزەهەڵنەگرو ئەستوور بوون.





لە نێو فەزایەکی تارادەیەك داخراو و دزەهەڵنەگری ئەوتۆ دا، کولتوورە دیاریکراوەکان زۆرتر بە دوور لە دەستێوەردان وموزاحیمەتی کولتوورە بێگانەکان، توخم گەلێکی شوناس بەخشی یەکگرتوو و تارادەیەك جێگیری دەخستە روو. ئەندامانی یەکەیەکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراوی بچووك بەردەوام بە توخم گەلێك شوناسیان وەدەست دێنا کە لە درێژایی چەندین بەرە دا بە نەگۆڕیی مابوونەوە و بە هەمیشەیی و هەتاهەتایی لە قەڵەم دەدران. ئەم توخمانە بەردەوام دووبارە بەرهەم دەهاتنەوە و لەبەر ئەوە بە شێوەیەکی بەردەوام و سنووردار دەخرانە بەر چاو، بوارو پێویستیی هەر جۆرە هەڵبژاردن و پرسیارکردنێکیان لە نێو دەبرد. لە راستی دا میکانیزمەکانی کولتوور وەرگری و شوناس بەخشی زۆر کارامە بوونو ناتەبایی و کێشەیەك لە نێوان توخمە شوناسبەخشە جۆراوجۆرە ئیتنیکی، ئایینی، نەتەوەیی و جوغرافیاییەکان دا نەبوو (Peterson, 1999: 78).

لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا، پتەوبوون و کارایی بەرزی سنوورەکان فەزایەکی پاوانکراوی بۆ کولتوورە تایبەتییەکان پێك دێنا. بەم پێیە کولتوورەکان دەیان توانی بە سوود وەرگرتن لە پارێزراویی بونیادنراو لە سەر پاوانکارییەکی ئەوتۆ، پێگەیەکی رەها وەدەست بێنن. لەبەر ئەوەی کە کولتوورگەلی جێگرەوە و رکەبەر "بوونیان نەبوو" و گۆڕانکارییە کولتوورییەکان زۆر کەم بوون و پێداویستیی مرۆڤەکان بە سەرچاوە جێگیر و رەهاکان بە باشی دابین دەبوو. کۆمەڵگە نەریتییەکان دنیاگەلێکی یەکگرتوو، پەستێوتراوو جێگیر بوون کە نەك تەنیا سنووری روونو نەگۆڕیان هەبوو، بەڵکوو کولتووری رەها و باڵادەستیشیان لەخۆ دەگرت کە توانای خستنە رووی توخمە مانابەخش و شوناسسازەکانیان هەبوو.

پێوەندیی توندوتۆڵی شوێن و کولتوور لە سەردەمی نەریتی دا لە راستی دا بەهێزکەری پێوەندیی نێوان، تاك و کۆمەڵگە بوو، لە کۆمەڵگە نەریتییە خاوەن پێکهاتە کامیونال یان گرووپتەوەر (گیمن شافت )ەکان دا توخمە کولتوورییە جۆراوجۆرەکان دا بە چەشنێك تاکیان لە رایەڵکە کۆمەڵایەتییە خزمایەتی و ناوچەییەکان دا ئاوێتە دەکرد کە دەکرێ بگوترێ مەودای نێوان تاك و کۆمەڵگە لە نێو دەچوو(Beyer, 1994: 26). کەواتە پێوەندیی نێوان ئەو دووانە" پرابلمتیك" نەبووو قەیرانی مانا و شوناس جێگایەکی نەبوو. بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون بە تێك دانی فەزای پاوانی و لە نێو بردنی پارێزراویی کولتوورەکان، توانایی ئەوانی لە بواری شوناس سازیی نەریتی دا زۆر کەم کردەوە.

دیارە ئەم کارتێکەرییەی بەجیهانیبوون لەسەر ئەرکەکانی شوناس سازی کولتووریش بە هۆی " پەستێوتراویی زەمەن و فەزا" و فەزامەندبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی بواری بۆ رەخسا. هەروەك لە پاژە جۆراوجۆرەکانی ئەم توێژینەوەیە دا باس کرا، پرۆسەی بەجیهانیبوون بە هۆی تیکنۆلۆژییە زۆر پێشکەوتوو و کاراکانی پێوەندی و جیایی شوێن لە فەزا و زەمەن ئەم دەرەتانە پێك دێنیٚ کە ژیانی کۆمەڵایەتی لە فەزایەکی زۆر بەرین دا شکلٚ بگریٚ و توانایی شوێن بۆ سنووردارکردنو پێك هێنانی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و بەم پێیە پانتایی ژیانی کۆمەڵایەتی زۆر کەم بێتەوە. بە وتنێکی دیکە، پرۆسەی بەجیهانیبوون بە گۆڕینی فەزاو زەمەن، لەراستی دا ژیانی کۆمەڵایەتی دەگۆڕی(Giddens, 1994: 4) .

بیٚ گومان بە هەر رادەیەك "دەرتانی بەریەك کەوتنی ئامادەیی و نائامادەیی" و کرداری دووراودوور "زۆرتر و زاڵێتیی شوێن و ناوچە لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی کەم بێتەوە (McGrew,1996: 66)، لە کارایی و پتەویی سنوورە جۆراوجۆرە سروشتی و دستکردەکان کەم دەبێتەوە. لە دنیایەکدا کە تایبەتمەندییەکەی رەوتە جۆراوجۆرە جیهانییەکانە و بارستایی پێوەندییە ناراستەخۆ و هێماییەکان بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر زیاد دەبیٚ، هەر سنوورێك تێك دەرووخیٚ و فەزا داخراوەکان لە نێو دەچن. کەواتە لایەنو بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە بەردەم رەوتە جیهانییەکان دا دەکرێنەوە و دەرەتانێکی ئەوتۆ بۆ گۆشەگیری و سنوورخولقێنی نامێنێتەوە.

دزەهەڵگری و تێکرووخانی زێدرووی سنوورەکان فەزای هێمن و ئارامی کولتوورەکانیش لە نێو دەبا و لە فەزای زۆر بەرینی ژیانی کۆمەڵایەتی دا، کولتوورە جیاوازەکان بە سانایی پەرە و رەوت دەگرن. هەموو بیاڤە پارێزراوەکان تێك دەرووخێنو هەر کولتوورێك بە ناچاری دەکەوێتە فەزایەکەوە کە بواری ئامادەیی و خۆ دەربڕینی کولتوورەکانی دیکەشە. بەم چەشنە پرۆسەی بەجیهانیبوون لە رێگای سەرزەوی سڕینەوەوە، پێوەندەکانی کولتوور و شوێن لاواز دەکاو سیستمە ماناییەکان لە ویستگە ناوچەییەکانی خۆیان رزگار دەکا.

لە دنیایەکی بیٚ سنووری ئەوتۆ دا بەش و توخمە جۆراوجۆرە کولتوورییەکان بە شێوەیەکی خۆلیٚ لانەدراو وێك دەکەونو دەکەونە پەنا یەکتر. دنیای تارادەیەك داخراوی ئاینییە تایبەتەکان، زۆر زیاتر لە پێشوو بەرووی ئاینیەکانی دیکە دا دەکرێتەوە. دابونەریت و نموونە جۆراوجۆرەکانی ژیان بە هۆی تیکنۆلۆژییە پێشکەوتووەکانی پێوەندی و راگوازتن، دەگاتە شوێنە دوورەکانی جیهان. ئیتنیکە جۆراوجۆرەکانیش بە هۆی کۆچ، سەفەرو پێوەندییە



ناراستەوخۆکان لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی جیهان دا بڵاو دەبنەوە. کەواتە جێگیری و" پاکژی"ی کولتووری کەم تا زۆر لە نێو دەچیٚ و راژان، گەرۆکی و ئاوێتە بوون جێگایان دەگرنەوە.

لە پەنایەك هەڵکەوتنی کولتوورە تایبەتەکان، ناخ باوەڕی و رەهاگەرایی کولتووری بە توندی لەرزۆك دەکا. کاتێك کە سنوورەکان ناتوانن چوارچێوەیەکی ئارام بۆ کولتوورێکی دیاریکراو پێك بێنن و بیپارێزنو دەرەتانی بەرگرتن لە دزەکردنو ئامادەیی کولتوورەکانی دیکە نامێنێتەوە، پەردە لە سەر ئەم راستییە گرنگە هەڵدەگیریٚ کە هەموو کولتوورەکان بەرهەم گەلێکی کۆمەڵایەتین. هەر کولتوورێك ئەگەرچی هەمیشەیی و هەتاهەتایی دێتە بەر چاو، لە راستی دا سیستمێکی ماناییە لە پەنا سیستمە ماناییەکانی دیکەدا. ئەوان بە شێوەی کۆمەڵایەتی دروست دەبن و بە هیچ شێوەیەك بان مێژوویی نین (Beyer, 1994: 2) .

ئەگەر کولتوورەکان دەستکردی مرۆڤەکانو کۆمەڵگاکان بن، بیٚ گومان خاوەنی زنجیرە پلەش نین. نەبوونی زنجیرە پلەش پەسەند بوونی هەر جۆرە پۆلێن کردنێکی کولتوورەکان لەسەر بنەمای باش/ خراپو راست/ ناراست رەت دەکاتەوە. بە وتەیەکی دیکە هیچ جۆرە پێوانەیەکی بان کولتووری بۆ هەڵسەنگاندنی کولتوورەکان نیەو پێکەوە بەراورد کردنی کولتوورەکان تەنیا لە روانگەی کولتوورەکان خۆیانەوە دەکریٚ. زۆربەی تیۆریستەکان بەم پرۆسەیە دەڵێن رێژەیی بوونی کولتوورەکان و ئەو بە هۆکاری دەرکەوتە بەرینەکان دەزانن.

بەرێژەیی بوونی کولتوورەکان، وێنای نەریتی لە کولتوور وەك بابەتێکی رەها، جێگیرو بان مێژوویی بیٚ متمانە دەبیٚو ئالۆزییەکی جیددی لە کارکردی شوناسسازیی ئەو دا پێك دیٚ. لە دۆخێکی ئەوتۆ دا کە رەهایی کولتوور دەچێتە ژێر پرسیار، بیٚ گومان ئیتر ناتوانریٚ سەرچاوەی جێگیر و نەگۆڕ بۆ شوناسسازیی نەریتی دابین بکریٚ . ئەم بیٚ توانایی و ناکارامەییە لە پێوەندی لەگەڵ دابین کردنی پێداویستیەکانی جیاوازبوون و بانتربوونیش دا راستە. بەم چەشنە کولتوورە تایبەتەکانیش کە لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا بناغە و چوارچێوەیەکی جێگیریان بۆ شوناس سازی پێك دێنا، لە ژێر کاریگەریی پرۆسەی بەجیهانیبوون دا، زۆر رەوان و ناجێگیر دەبن و بیٚ گومان دەکریٚ بگوتریٚ ناکریٚ لەسەر بنەمای ئەوان بەرێوەبچیٚ .

دیارە کارتێکەریی پرۆسەی بەجیهانیبوون لەسەر سەرچاوەکان، ئامرازەکان و هەلومەرجی شوناس سازیی نەریتی، لە لایەنی دیکەشەوە شیاوی باس و لێدوانە. ئەگەرچی فەزامەندکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی، گۆڕینی فەزا و زەمەن و رێژەییکردنی کولتوور، شوناسسازیی زۆر دژوار و تەنانەت نەلواو دەکا، بەڵام کارتێکەری بەجیهانیبوون لەسەر ئەم جۆرەی شوناسسازی لەم

وێنانەی سەرەوە دا کورت نابێتەوە. کەواتە هەوڵ دەدەین بە روانینێکی خێرا لە ژمارەیەك لەم جۆرە وێنانە، ئەم باسە کامڵ بکەین. یەکێك لەم نموونانە کەمڕەنگ بوونی بەرچاوی دەوری دەوڵەت، وەك گرنگترین سەرپەرستی شوناس سازییە. هەروەك لە باسی بەجیهانیبوونی سیاسی دا باسمان کرد، پرۆسەی بەجیهانیبوون بە دزەهەڵگرکردنی سنوورەکان و دەرباز کردنی بابەتی کۆمەڵایەتی لە بەستێنی شوێن، کارایی دەوڵەتەکان لە بواری شوناس سازی دا زۆر کەم دەکاتەوە و ئەوان ئیتر ناتوانن لە فەزایەکی تارادەیەك داخراو، پاوانکراوەو ئارام دا خەریکی دروست کردن و پاراستنی شوناسی نەتەوەیی بن. بە گوتنێکی دیکە، پرۆسەی بەجیهانیبوون پەرەگرتنی رایەڵکە جیهانییەکانی هێز، سامان و زانیاری و کەم کردنەوەی ئوتۆریتەی دەوڵەتی لێدەکەوێتەوە و بەرپرسیارێتیی شوناسسازی دەخاتە ئەستۆی تاك.

بەم هۆیە "لەسەردەمی هاوچەرخ دا، مەتەڵی شوناس زیاتر لە هەرسەردەمێك مرۆڤ بە خۆیەوە خەریك دەکا " (تاجیك، ١٣٧٩: ١٦٠).

فرەیی سەر چاوە کۆمەڵایەتییەکانیش شوناس سازیی نەریتی دژوار دەکا. لە سەرچاوە نەریتیەکان دا، مرۆڤەکان زۆرتر لە یەکە کۆمەڵایەتییە بچووك بەڵام یەکگرتووەکان دا هەڵ دەکەون و لە چوارچێوەی ئەودا شوناسێکی تاقانەیان دەبێ. بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون بە بەرین کردنەوەی فەزای کۆمەڵایەتی، دەرەتانی شوناس وەرگرتن لە چوارچێوەی یەکە سنووردارو دیاریکراوە کۆمەڵایەتییەکانی وەك وڵات دا زۆر کەم دەکاتەوە. ئێستاکە هەر مرۆڤێك دەتوانێ لە یەك کات دا خۆی سەر بە یەکە بچووك و گەورە کۆمەڵایەتییە پڕ ژمارەکان بزانێ (Albrow, 1996: 50-51).

پرۆسەی بەجیهانیبوون هەروەها پێکهاتە گەلێکی کۆمەڵایەتیی بەهێز دەخولقێنێ کە چاوپۆشی لە هەموو شوناسە تاکەکسی و کۆیەکان دەکەن یان لانیکەم دەیان گۆڕن. بە گوتنێکی دیکە، ئەم پرۆسەیە سیستمە کارکردییەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا زاڵ دەکا. ئەم سیستمانە ئامراز گەلێکن و بەستراوەیی گرووپی یا پلەوپایەیی لەوان دا جێگایەکی نیە. لەم روانگەیەوە بە گشتگیرترو پڕهەڵپەتر بوونی پرۆسەی بەجیهانیبوون، دنیایەك لە بازاڕەکان، رایەڵکەکان و رێکخراوە ستراتیژیکەکان شکڵ دەگرێ کە زۆربەیان بە پێی نموونەی چاوەروانییە ئاوەزیانەکانی، وەك وارسکەکان، دەسەڵاتخوازی و لێکدانەوە خۆویستانە بەرێوە دەبرێن و پێویستییەکیان بە شوناس نیە (Castells, 1997: 355).



## قەیرانی شوناس و مانا

هەروەك لە پاژە جۆراوجۆرەکانی بەشی سێهەمی ئەم توێژینەوەیە دا باسمان کرد، تاکەکان کاتێك خۆیان بە خاوەنی شوناس و ژیانی مانادار دەزانن کە پێداویستیی ئەوان بە بەردەوامی، جێگیری و جیاوازبوون، وەك یەکی لەگەڵ کۆمەڵ، باڵادەستی و بابەتی رەها بەرادەیەکی شیاوی پەسەند دابین بێ. بە وتنێکی دیکە وەدەستهێنانی شوناس و مانا لە هەلومەرجێك دا دەشێ کە تاکەکان هەست بکەن جێگیری و بەردەومیان هەیە، وێرای جیاواز بوون لە مرۆڤەکانی دیکە لەگەڵ هێندێك لە وان وەك یەك و لێك بەستراو بن و خاوەنی سیستمی مانایی رەهاو تەنانەت باتترن.

لە کۆمەڵگەی نەریتی دا پێوەندیی توندوتۆڵی فەزاو زەمەن و کولتوور لەگەڵ شوێن یان ناوچە و سەرزەویی دیاریکراو، ئەم پێداویستییە شوناسییە بە باشی دابین دەکاو مرۆڤەکانی نێو دنیا کۆمەڵایەتییە بچووك، سنووردار، بەردەوام و یەکگرتووەکانی خۆیان دا بە سانایی دەستیان بە شوناسو مانای پێویست رادەگەیشت. بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون بە پچراندنی ئەم پێوەندە و دزەهەڵگرکردن و تێك دانی سنوورە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، ئەو دنیاگەلەیان بەتوندی لەرزۆك و تەنانەت لە نێو برد. لە ژێر کارتێکەریی ئەم گۆڕانکارییە بنچینەییانە دا، دەرەتانی شوناس دۆزینەوەی نەریتی زۆر کەم بووە و جۆرێك قەیرانی شوناس و مانا سەری هەڵ دا. لەم پاژە دا دەمانهەوێ هەنگاوێکی دیکە لە پێناوی شیکردنەوەی ئەم دیاردەیە و دەس نیشان کردنی نیشانە جۆراوجۆرەکانی هەڵێنینەوە.

ئەلف) لەبەر ئەوەی کە شوێن بە بەراورد لەگەڵ فەزا، تواناییەکی زۆر زیاتری بۆ دابین کردنی پێویستیی جێگیری، جیاوازبوونو لێك گرێدراویی کۆمەڵایەتی هەیە، پرۆسەی بەجیهانیبوون بە سەرزەوی سڕینەوە و فەزامەندکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی جۆرێك قەیرانی شوناس و مانا دەخولقێنێ. بە گوتنێکی روونتر فەزامەندبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی لە راستی دا بەرین کردنەوەی بەرچاوی پانتایی ژیان و شکڵگرتنی فەزایەکی کۆمەڵایەتیی زۆر بەرینی لەگەڵ دایە کە جۆرێك خەسارهەڵگریی بوونیانەی بە شوێنەوەیە. هەر کاتێك سنوورەکانی ژیانی مرۆڤ بە رووی دنیایەکی گەورەتردا بکرێنەوە، تەناهی و ئارامیی سەرچاوەگرتووە لە هەستی ئامادەیی لە ماڵێکی خاوەن تەناهی و پەرژینداریش دا دەکەوێتە مەترسییەوە و لەرزۆك دەبێ (Tomlinson, 1999 b : 148).

فەزامەندبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی و تێك رمانی سنوورەکان نەك تەنیا لە ماڵەوە بوون زۆر دژوار و تەنانەت نەکراو دەکا، لە هەمان کات دا تاك دەخاتە پەنا ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤەکانی دیکە کە بێگانەو نەناسیاون‌و پێوەندییەکی تارادەیەك راستەوخۆ و جێگیر لە نێوان ئەوان دا نیە. هەروەك میشل فوکۆ باسی دەکا، زاڵێتیی ئەم دۆخە بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی دا قەیرانخولقێنە، بە وتەی ئەو" ئێمە لە سەردەمی لە پەنا یەك بوون، سەردەمی نزیك و دوور، سەردەمی لێك نزیکبوون، سەردەمی پەراکەندەیی و لێك بڵاو بوون داین.... دڵەراوکێی ئێمە زیاتر پێوەندیی بە فەزاوە هەیە تا بە زەمەن" (Foucault, 1983: 22- 23).

ب ) پرۆسەی بەجیهانیبوون هەروەك کە فەزایەکی روون و جیانەکراوە و بێ‌کۆتایی دەکاتە بەستێنی ژیانی کۆمەڵایەتی، هێمنایەتی و ئارامیی لە ماڵەوە بوون ناهێڵێ و لە پەنایەك بوونێکی ئاوێتە لەگەڵ دڵەراوکێ بەدی دێنێ ، بە گۆڕینی زەمەنی کرنۆلۆژیك بە ئێستای بێ کۆتایی، رابردووی شوناسبەخش لە نێو دەبا . لە نێو چوونی رابردوو بە مانای لە نێو چوونی بیرەوەری و مێژوو، وەك سەرچاوە سەرەکییەکانی شوناس لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا و لە نێوچوونی پێوەندیی نێوان رابردووی هاوبەش و ئێستای هاوبەشە، لە دۆخێکی ئەوتۆدا مرۆڤ جۆرێك هاوزەمەنی ( هاوکاتی) ئەزموون دەکا و دەکەوێتە دنیایەکی کاتەکییەوە کە لە چوارچێوەی ئەودا ناتوانێ هەست بە تێپەرینی زەمەن بکرێ (Morley and Robins, 1996: 115).

ئەم هەستی هاوکاتییە و لە دەم(لحظە) دا بوونە بە هەمان رادەی لە پەنا یەك بوون دڵەراوکێ خولقێنە. یەکێك لە پێداویستییە بەراییە سەرەکییەکانی شوناس، هەستی بەردەوامی لە تێپەر بوونی زەمەن دایە و سابجکتیویتی بە وشیاریی سەبارەت بە زەمەن لە قەڵەم دەدرێ. کەواتە کاتێك کە زەمەن وەك بەردەوامی لە نێو دەچێ، یەکیەتیی سووژەش خەوشدار دەبێ. بە وتنێکی دیکە هەستی کاتەکی و لە گۆڕان دابوون بە سەر زەینی مرۆڤ دا زاڵ دەبێ و تەناهی و ئارامیی سەرچاوە گرتوو لە یەکیەتی و بەردەوام بوون باردەکا(Grossberg, 1996: 100).

ج) رێژەیی بوونی کولتوورەکانیش جۆرێك قەیرانی شوناس‌و مانا دەخولقێنێ. لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا، هەڵکەتنی کولتوورە تایبەتەکان لە چوارچێوەی سنوورە ئەستوورەکان وفەزایەکی تارادەیەك داخراودا ئەم دەرەتانە بۆ ئەوان پێك دێنێ کە بە سانایی شوناس‌و مانای پێویست بۆ ئەو مرۆڤانەی ئەو کولتوورانەیان هەیە دابین بکەن. لە راستی دا دنیای کۆمەڵایەتی کولتووریی ئەو مرۆڤانە دنیایەك بوو تەیار بە سیستمێکی مانایی زۆر یەکگرتوو





و بەتوانا کە نەك هەر توخم گەلی شوناسبەخش و جێگیر و بەردەوامی هەبوو، بەڵکوو پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی لەبار و زۆر جار "بانتری" بۆ تاکەکان تەرخان دەکرد و خوێندنەوەیەك لە حەقیقەتی رەهای دەخستە بەر چاوی ئەوان.

بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون بە دزەهەڵگرو ناسك کردنەوەی سنوورەکان‌و زیاد کردنی بەرچاوی وێککەوتنە کولتوورییەکان، وشیاریی مرۆڤەکان لە توخمە کولتوورییەکانی دیکە، وەك داب‌و نەریت‌و بەهاکان‌و ئایینەکان، زیاتر دەکا. لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا بڕوا هەبوون بە بانتری بوونی دنیایەکی تایبەت‌و بەرگری لە راست بوونی رەهای ئەو لە بەرانبەر کولتوورەکانی دیکەدا زۆر دژوار دەبێ. کاتێك کە گرنگترین سەرچاوەی شوناس دۆزینەوەی نەریتی بەم چەشنە لەرزۆك‌و رێژەیی بێ، ئەو تاکانەی سەر بەو سەرچاوەیەن تووشی قەیرانی شوناس و مانا دەبن (peterson و1999 : 79 ).

ئەم قەیرانی شوناس‌و مانایە لە هەستی گومان‌و نائارامی دا دەردەکەوێ. لە پەنا یەك هەڵکەوتنی کولتوورە تایبەتەکان لە نێو فەزایەکی کۆمەڵایەتیی زۆر بەرین‌و بەرفرەداو رێژەیی بوونی بەرهەمهاتوو لەو، دنیایەکی بێ بەری لە بنواشە گشتی‌و رەهاکان بەدی دێنێ و بنەماکانی هەرچەشنە بڕوا و لێبڕاوییەکی ماناساز و شوناسبەخش لەرزۆك دەکا و ئەم لەرزۆکییە لە راستی دا لەرزۆکیی کۆڵەکەکانی بڕواو باوەڕە. لە ژێر کارتێکەریی پرۆسەی بەجیهانیبوون دا، گومان‌و نالێبڕاوی دەچێتە نێو هەموو بیاڤەکانی ژیانی کولتووری و تەنانەت بیاڤی ناسینی زانستی‌و ترس‌و نائارامییەکی گشتگیر دەخولقێنێ (Lyon, 1999: 79).

د ) پرۆسەی بەجیهانیبوون نەك هەر کولتوور گەلێکی جۆراجۆر و پڕژمار، دەخاتە بەر دەست گرووپە جۆراوجۆرەکان، بەڵکوو دنیا و سەرچاوە کۆمەڵایەتییەکانی ئەوانیش زیاتر دەکا. کەواتە، کەم و تەنانەت تاقانە بوونی سەرچاوە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆمەڵگە نەریتیەکان دا کە پێداویستیی شوناسیی مرۆڤەکان بە پێوەندیدارێتی و لێك گرێدراویی کۆمەڵایەتی بە سانایی دابین دەکرد، لە نێو دەچێ و تاك ناچار دەبێ لە رێگای یەکە کۆمەڵایەتییە بچووك و گەورە جۆراوجۆرەکانەوە شوناس وەدەست بێنێ. سەرچاوەکان و بژێرە شوناسییەکان کە لە دۆخێکی ئەوتۆدا دەخرێنە روو، نەك هەر جۆراوجۆرو فرەن بەڵکوو هێندێك جار دەکەونە دژایەتیی یەکترەوە.

بەم چەشنە سەرچاوە کۆمەڵایەتییەکان‌و لە ئاکام دا شوناسەکان رێژەیی دەبن. ئەم رێژەیبوونە گشتگیرە، شوناس سازی دەکاتە بەر پرسیارێتییەکی دژواری تاکەکەسی و ژیانی

کۆمەڵایەتی دەکاتە بوارێکی پارادۆکسیکاڵ. رۆڵێن رابێرتسۆن هەڵومەرجی قەیرانیی سەرچاوەگرتوو لە دژوار و ئاڵۆزبوونی پێوەندی لەگەڵ سەرچاوە جۆراوجۆرو لێك دژەکانی ناو ناوە " گۆڕانی پارادۆکسیکالی گشتگەرایی و تایبەتگەرایی". ئەم گۆڕانە بریتییە لە پرۆسەیەکی دوولایەنەی لە خۆ گری گشت کردن(گشتاندن)ی تایبەتگەرایی و تایبەت کردن(تایبەتاندن)ی گشتگەرایی (Robetson,1992: 100).

دیارە دەوری پرۆسەی بەجیهانیبوون لە شکڵ گرتنی قەیرانی شوناس و مانا دا لەلایەنی دیکەوە شیاوی باسو تاوتۆێ کردنە کە تەنیا بە ئاماژەیەکی کورت بە دوو نموونەی سەرەکی، ئەم بەشە لە باسەکە کۆتایی پێ دێنێن: پرۆسەی بەجیهانیبوون بە بەرین کردنەوەی بەرچاوی پانتایی پێوەندییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ، دنیای کۆمەڵایەتیی تاکەکان زۆر گەورەتر دەکا، هەست کردن بە کۆنترۆڵ هەڵنەگر بوونی دنیایەکی ئەوتۆ لەوان دا بەدی دێنێ (Castells, 1997: 69). ئەم پرۆسەیە هەروەها لەبەر ئەوەی کە گۆڕان هەڵگریو خێرایی کردۆتە گرنگترین هۆکارە تایبەتی بەخشەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی مۆدێرن، دەرەتانو ئەگەری ئانۆمی زیاتر دەکا (Beyer, 1994: 1).

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی دەتوانرێ بگوترێ کە پرۆسەی بەجیهانیبوون بە دەربازکردنی فەزا و زەمەن لە چاچێوەی شوێن ورێژەیی کردنی کولتوورەکان و سەرچاوە کۆمەڵایەتییەکان، شوناس سازی و مانا دۆزینەوە بە شێوەی نەریتی زۆر دژوارە و تەنانەت نەکراو دەکا. بەم پێیە جۆرێك قەیرانی بەربڵاو و زێدەرووی شوناس و مانا کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی جیهان دەگرێتەوە کە بە شێوەگەلی جۆراوجۆر لە وێنا کردنەکانو هەستی تاکەکان و گرووپە جۆراوجۆرەکان دا رەنگدانەوەی دەبێ. زۆر لە کولتوورتوێژەکانو ئۆگرانی تێگەیشتن و شیکاریی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان باسیان لە نیشانەکانی ئەم قەیرانە کردوە.

بە وتنێکی روونتر لە ژێر کارتێکەریی قەیران خوڵقێنیی سەرزەوی سڕینەوەو رێژەییبوون دا، وێناو خوێندوەی تاکەکان لە جیهان دەگۆڕێ کە لە ژێر ناو و دەستەواژەی جۆراوجۆر دا باسی لێوە کراوە: "جیهانی گەرۆك، دزەهەڵگر و نادیار"، " دنیای نالێبڕاوی و گومان"، " سەردەمی ئەگەر و رێکەوت "، " ئێستایەك کە خۆی لەبەر ناگیرێ "، " دنیای بێ سنوورو چوارچێوە "، " دنیای گەورەو کۆنترۆڵ نەکراو"، " دنیای دژایەتییەکان، گومانەکان و ئاڵۆزییەکان".... بێ گومان ئەم چەشنە تێگەیشتنو خوێندنەوانە لە جیهان و ژیانی کۆمەڵایەتی جۆرێك هەستی سەرلێشێواوی، دڵەراوکێ، نیگەرانی ، نائارامی و ترسی لەگەڵ دایە.



## بونیادنانەوەی شوناس

هەروەك لە باسی شوناسو ئەرکەکانی دا باسمان کرد، شوناس مەرجی پێویستی ژیانی کۆمەڵایەتییە و بەبێ چوارچێوەیەك بۆ دیاریکردنی شوناسی کۆمەڵایەتی، مرۆڤەکان ناتوانن بە شێوەیەکی مانادار و بەردەوام پێوەندی لەگەڵ یەکتری دامەزرێنن. لە راستی دا بەبێ شوناسی کۆمەڵایەتی، کۆمەڵگەیەك بوونی نابێ (Jenkins, 1996: 6) . کەواتە قەیرانی شوناسو مانا بە شێوەیەکی جیددی ژیانی کۆمەڵایەتی دەشێوێنێو تاکەکانو گرووپەکان ناچارن ئەم قەیرانە بە جۆرێك چارەسەر بکەنو لێی تێپەرن. بێ گومان دروست کردنی شوناس تەنیا رێگای ئەنجام دانی ئەم گرنگەیە.

سەبارەت بە بونیادنانەوەی شوناس سێ خاڵ دەبێ باس بکرێ. پانتایی بونیادنانەوە، رووبەر بونیادنانەوە،و جۆری بونیادنانەوە. لەبەر ئەوەی کە پرۆسەی بەجیهانیبوون هیچ کۆسپ و سنوورێك پێشی پێ ناگرێ، قەیرانی شوناسێکیش کە لەوەوە سەرچاوەی گرتبێ لە پانتاییەکی تایبەت دا سنووردار نابێ. لە دۆخێکی ئەوتۆدا هیچ تاك و گرووپێك ناتوانێ لە کارتێکەریی قەیران خوڵقێنی پرۆسەی بەجیهانیبوون پارێزراو بێ. هەر بەم هۆیە بونیادنانەوەی شوناسیش تایبەت بە سەرزەوی و یەکە جوغرافیایی، سیاسی یان کولتوورییەکان نیە. هەروەك زانیارییە کۆکراوەکانی بەشی دووهەم نیشانی دەدەن، ئەمڕۆکە دەکرێ بگوترێ هەموو کۆمەڵگاکانی جیهان کەم تازۆر قەیرانی شوناس و بونیادنانەوەی پێوەندیدار بەو ئەزموون دەکەن.

رووبەری بونیادنانەوەش سنووردار نیە و دەتوانرێ سێ ئاستی جۆراوجۆری بونیادنانەوەی شوناس و سنوور دەس نیشان بکرێ: ئاستی خود و گرووپ، ئاستی نێوان گرووپی و ئاستی جۆری مرۆڤ. ئاستی یەکەمی بونیادنانەوە پێوەندیی بە گرێدراویی گرووپیو پێوەندیی تاك و گرووپەوە هەیە. ئەم بونیادنانەوەیە لە راستی دا هەوڵێکە بۆ دۆزینەوەی وڵامێك بۆ ئەم پرسیارە کە پرۆسەی بەجیهانیبوون زیاتر لە پێشوو زەقی دەکاتەوە: من لە راستی دا سەر بە چ گرووپێکم (peterson, 1999: 19) .

لە ئاستی دووهەم یان ئاستی نێوان گرووپیی دا بونیادنانەوەی شوناسەکانو سنوورەکان دا، گرووپ وەك کۆیەك یان گشتێك لە قەڵەم دەدرێ. لەم ئاستەدا ئەوەی بۆ تاك لە پێشەوەیە نەك گرێدراویی گرووپی، بەڵکوو سنووری گرووپ یان گرووپ گەلێکە کە ئەو سەربەوانە. لە دنیای بێ سنوورو لەخۆگری رەوتە جیهانییەکان دا، مرۆڤەکان دوا بە دوای هەر وەبەرەیەککەوتنێکی نوێ دەبێ لە خۆیان بپرسن کە سنووری گرووپ یان ئەو گرووپانەی سەر بەوانن لە کوێیە و ئەم

گرووپانە چ پێوەندی و نزیکایەتییەکیان لەگەڵ یەکتر هەیە. لە ئاستی سێهەمیش دا قەیرانی شوناس تاکەکان گرینگی بە بونیادنانەوەی شوناسیانەی جێگیر لەسەر مرۆڤ بوونی مرۆڤ و پێوەندیی مرۆڤ لەگەڵ سروشت دەدەن (Peterson, 1999: 20-21).

بونیادنانەوەی شوناس نەك هەر گشتگیرە و لە ئاستێکی دیاریکراو دا کورت نابێتەوە، بەڵکوو چەشنی پرژمار و جۆراوجۆریشی هەیە. ئەم بونیادنانەوانە لە لایەنی جۆراوجۆرەوە شیاوی پۆلێن کردن و دەستە کردنن، بەڵام لەم توێژینەوەیە دا ئەوان بە دوو جۆری گشتی دابەش دەکەین:

بونیادنانەوە تایبەتگەرایانەکان و بونیادنانەوە ناتایبەتگەرایانەکان. بونیادنانەوەکانی جۆری یەکەم لە تایبەتگەراییە کولتوورییەکاندا و بونیادنانەوەکانی جۆری دووهەمیش لە گشتگەرایی کولتووریدا دەردەکەون. لە دێڕەکانی دواتردا سەرەتا باس بونیادنانەوە ناتایبەتگەرایانەکان دەکەین و دواتر بۆ روونتر کردنەوەی پێوەندیی نێوان پرۆسەی بەجیهانیبوون و تایبەتگەراییە کولتوورییەکان، بە روانینێکی دووبارە لە توخمەکان و تایبەتمەندییە ئایدیۆلۆژیکەکانی بزووتنەوە تایبەتگەرایانەکان، نیشانی دەدەین کە ئەو توخم و تایبەتمەندییانە، هەموویان پێوەندییان بە هەلومەرج و پێداویستییە رۆحی- دەروونییەکانی ئەو تاك و گرووپانەوە هەیە لە تووشی قەیرانی شوناس و مانا بوون.

بۆ باس کردن سەبارەت بە بونیادنانەوەی ناتایبەتگەرایانەی شوناس سەرەتا باشترە سەرنج بدەینە دوولایەنە بوونی کارتێکەریی پرۆسەی بەجیهانیبوون لە بواری شوناس دا تاوەکوو روون بێتەوە کە ئەو پرۆسەیە لە هەمان کات دا پرۆسەی شوناسسازیی نەریتی خەوشدار دەکا و لە کاری دەخا، کەرەستە و بەستێنی نوێش بۆ شوناسسازی دابین دەکا. پرۆسەی بەجیهانیبوون تەنیا قەیرانخوڵقێن نیە، بەڵکوو ئامراز گەلی کاراش بۆ تێپەڕین لە قەیران دەخاتە روو. هەر بەم هۆیە ژمارەیەك لە تیۆریستەکان کە باسی بەجیهانیبوون دەکەن، ئەو بە هۆکاری ئازادی و دڵەراوکێ و دەرفەت و مەترسی دادەنێن و باس لە دیالکتیکی بەجیهانیبوون دەکەن (Alcantara, 1996: 2; Giddens, 1994: 224).

لە بواری شوناس دا پرۆسەی بەجیهانیبوون لەم رووەوە هۆکاری دەرەتان و دەرفەتە کە سەرچاوە و ئامرازە پێویستەکانی دروست کردنی شوناس زۆر زیاد دەکا. لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا بەهۆی دزەهەڵنەگریی رێژەیی سنوورەکان، بچووکتر بوونی رووبەری پێوەندییەکان و ژیانی کۆمەڵایەتی، سەرچاوە گەلێکی سنووردار لە بەردەست ئەندامانی یەکە



کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان دایە. لەم کۆمەڵگایانە دا دەکرێ بگوترێ دەرەتانی دەستراگەیشتن بە سەرچاوەی نوێ نیە و دامەزراوە و نەریتەکانی پارێزەری سنوورە کولتووری وکۆمەڵایەتییەکان بە توندی لەگەڵ هەر جۆرە سەرچاوە و توخمێکی شوناس سازی نوێ بەربەرەکانی دەکەن: سەرچاوە و توخمێك کە بە پێی گوتاری زاڵ بە جۆرێك نەریتی نوێ دەژمێردرێ . کەواتە سەرچاوە جێگیر و سنووردارەکانی شوناس وەك میراتێکی پیرۆز لە بەرەیەك بۆ بەرەیەکی دیکە دەگوازرێنەوە.

بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون بە ناکارا کردنی پارێزەرانی نەریتیی شوناس و ناکارا کردنی هۆکارە سنوورخولقێنەکان، بواری بۆ بەرهەم هاتن و خستنەرووی ژمارەیەکی فرەی سەرچاوە و کەرەستەی شوناس و مانا خۆش کرد. پرۆسەی ناوبراو بە دەربازکردنی ئەم جۆرە سەرچاوانە لە بەستراوەیی شوێن و سەرزەویی تایبەت، بڵاوبوونەوە و پەرەگرتنی ئەوانی لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی جیهان دا ساناتر کرد. ئەمرۆکە دانیشتووانی پەراوێزترین و دوورکەوتووترین یەکە کۆمەڵایەتییەکانی جیهانیش لەگەڵ سەرچاوە فرە و جۆراوجۆرەکانی شوناس ناسیاوییان هەیە. ئەم زیادبوونەی سەرچاوەکانی شوناس بە مانای بەرهەم هاتنی دەرەتان و هەڵکەوتوویی جۆراوجۆری نوێی شوناس سازییە کە هەر تاکێك کەم تا زۆر دەتوانێ بە سوود وەرگرتن لەوان خۆیان بونیاد بنێنەوە.

پرۆسەی بەجیهانیبوون نەك هەر سەرچاوەکان و بەم پێیە دەرەتانەکانی شوناس سازی زیاد دەکا، بەڵکوو ئازادیی کرداری تاکیش لەم بوارە دا بە شێوەیەکی بەرچاو بەرەوژوور دەبا. لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا تاك زۆرتر بە شێوەیەکی ناچالاکانە شوناس وەدەست دێنێ و ناوشیارانە و لە خۆوە دەبووە میراتگری شوناسێك کە لە ماوەی ژیانی چەندین بەرەدا پارێزرا بوو. ئەم ناچالاکییە تارادەیەکی زۆر بۆ کەم بوون و سنووردار‌بوونی سەرچاوەکانی شوناس دەگەڕایەوە. لە دۆخێکی ئەوتۆ دا بەرهەم هاتنی خوێندنەوەی جێگرەوە لە خود زۆر کەم بووو لادان و داهێنان وەبەر چاو نەدەکەوتن (Giddens and Reimer, 1999: 55). هۆکارێکی دیکە، گیرۆدەبوونی تاك لە چنگی هۆکارەکان و سەرپەرستە بان تاکە کەسییەکانی شوناس دۆزینەوە بوو. لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا، بواری شوناس سازی بە چەشنێك بە هۆی هێزەکانی وەك نەریت، سروشت، گوتاری زاڵ و دامەزراوە کۆمەڵایەتی، ئایینی و سیاسییەکان داگیرکرابوو کە تاك نەی دەتوانی لە لانیکەمی سەربەستی و ئازادیی کار بەهرەمەند بێ. ئەم هێزانە شوناس و سیستمێکی مانایی دیاریکراویان بۆ تاك پێناسە دەکرد و دەیانخستە بەرچاوی کە وەرگرتنی

ئەو لە لایەن تاکەوە دەکرێ بگوترێ خۆ لێ لانەدراو بوو. لە راستی دا خودی تاك هی خۆی نەبوو و ویستێکی دەرەکی ئەوی دروست دەکرد(Giddens and Reimer, 1999: 55) .

بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون بە فەزامەند کردنی ژیانی کۆمەڵایەتی بواری بۆ دەرباز بوونی تاك لە بازنەی تەنگەبەری دامەزراوەو هۆکارە نەریتییەکانی شوناسسازی خۆش کرد. گیدێنز لە ژێر ناوی گۆڕانی نەریت و سروشت دا باس لەم دیاردەیە دەکا. لە روانگەی ئەوەوە لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا، نەریت و سروشت هەروەك دوورە دیمەن گەلی جێگیرو دیاریکراو ئەرکی پێکهاتە بەخشین بە ژیانی کۆمەڵایەتی و شوناسیان لە ئەستۆ بوو. لە ژێر کارتێکەریی پرۆسەی نوێبوونەوە و بەجیهانیبوون دا، ئەم دوو هۆکارە بەدوور لە کرداری مرۆیی گۆڕانیان بە سەر دا هاتوە و کەوتوونەتە ژێر ویست و بڕیاری مرۆڤەوە و بەم چەشنە دنیایەك بە چەمهەڵگریی زۆرەوە شکڵی گرت. لە دنیایەکی ئەوتۆ دا مرۆڤ بەدوور لە کۆت و بەندەکانی نەریت و سروشت بە شێوەیەکی بەرچاو بووتە خاوەنی ئازادییو سەربەخۆیی کردار و دەبێ لە فەزایەکی کۆمەڵایەتیی زۆر بەرین دا، دنیا و شوناسی خۆی دروست بکا (Giddens, 1996: 6-7).

بە دەربڕینێکی دیکە پرۆسەی بەجیهانیبوون بە دەرباز کردنی بابەتی کۆمەڵایەتی لە کۆت و بەندە جۆراوجۆرەکان، بە تایبەت سەرزەوی و دەوڵەت- نەتەوە و خستنە رووی ژمارەیەکی زۆر سەرچاوەی کولتووریی شوناس، توانایی و دەرەتانی بێ کۆتایی شوناسسازی دەردەخا. ئەم گۆڕانکاری و کرانەوانە ئەو تواناییە بە مرۆڤەکان دەدا کە بە هەڵبژاردنەکان و پێکهاتە جۆراوجۆرەکان، دنیایەکی تایبەت بە خۆی بخولقێنێ. بەم چەشنە ئەو مافە بۆ هەر تاکێك کە مرۆڤێکی جیاواز بێ پاساو دەدرێ و بە فەرمی دەناسرێ. لە راستی دا زەقتربوونی سیاسەتی خۆ شوناس سازی لە جیهانی هاوچەرخ دا گرێدراوی دەور و پێگەی تەوەریانەی تاك لە بواری دروست کردنی شوناسی تاکەکەسیو کۆمەڵایەتی دایە (Albrow, 1996: 144-151) . ئەو شوناسانەی کە بە دەستی تاکە تارادەیەك ئازادو سەربەخۆکانو بە سوود وەرگرتن لە سەرچاوە زۆرو جۆراوجۆرەکانی شوناس لە کۆمەڵگەی جیهانی دا دروست دەبن، تایبەتمەندی گەلێکیان هەیە. لەبەر ئەوەی کە پرۆسەی بەجیهانیبوون دەبێتە هۆی بزۆکی، ئاڵۆزی و رەوانیی پێوەندی و ژیانی کۆمەڵایەتی، شوناسە دروست کراوەکانیش رەوان، گۆڕان هەڵگر و تارادەیەك کاتین. لە کۆمەڵگەی جیهانیی ئێستا دا تاکەکان بە گۆڕینی پێکهاتەی توخمە شوناسبەخشەکان و گۆڕینی لە بەرایی و پاشێتیی ئەوان بە بەردەوامی خەریکی بونیادنانەوەی شوناسی خۆیان دەبن (Thompson, 1998: 188).





کەواتە دەرەتانی رەق بوونی شوناسەکان زۆر کەم دەبێتەوە. تایبەتمەندییەکی دیکەی ئەم شوناسانە پڕژمارترو فرەتر بوونی ئەوانە. بە پێچەوانەی کۆمەڵگە نەریتییەکان کە پێوەندیی سنووردار و کەم ئەژمار تایبەتمەندیی ئەوان بوو، لە جیهانی ئێستا دا پانتایی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان زۆر بەرینەو هەر تاکێك لەگەڵ کۆمەڵەو گرووپ گەلێکی جۆراوجۆر پێوەندیی هەیە، هەر ئەم پێوەندییە بەرینە و بەستراوییە گرووپییە پڕژمارە بنەمایەکە بۆ بەرهەم هاتن و دووبارە بەرهەم هاتنەوەی شوناسە پڕژمارەکان. دیارە دەبێ وەبیر بهێنرێتەوە کە ئەم شوناسانە لە لایەنی بەردەوامی، پانتایی و پێشێتیەوە(اولویت) بە هیچ شێوەیەك وەك یەك نین.

پێوەندی یان تێکەڵاوبوونیش دەتوانرێ بە تایبەتمەندییەکی ئەم جۆرە شوناسانە دابنرێ. لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا هۆکارە جۆراوجۆرەکان دەستیان دەدایە دەستی یەك تاوەکوو پاکیو رەسەنایەتیی شوناس بپارێزن. سەرچاوە شوناسییە نوێو جێگرەوەکان نەك هەر زۆر کەم بوون یان تەنانەت نەبوون و ئەگەریش بوون، بەهرە وەرگرتن لەوانیش رێگە پێنیە دراوو نارەوا بوو. بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون بەلابردنی ئەو کۆسپانەی ناویان برا، بەستێنێکی لەباری بۆ دووبارە بەرهەمهاتنەوەی شوناسە تێکەڵاو پێوەندکراوەکان دەخوڵقاند (Jacobson, 1998: 22).

لەم بارەیەوە دەتوانرێ باس لە دوو جۆرە پێوەندکردن و تێکەڵاوی بکرێ. هێندێك جار مەبەست لە شوناسە تێکەڵاوەکان، ئەو شوناسانەن کە سەرچاوەو توخمە پێکهێنەرەکانی ئەوان سەر بە کولتوورە جیاوازە کانن. بۆ وێنە ئەو تاك و گرووپانەی کە لانیکەم لەگەڵ دوو کولتوور دەژین، خاوەنی شوناس گەلێکی ئەوتۆن(Bhabha, 1994: 4). هێندێك جاریش شوناسە تێکەڵاوەکان بەرهەمی تێکەڵاوکردنی ناسك و ئاڵۆزی بابەتی گشتی و بابەتی تایبەتن. ئەم جۆرە شوناسانە لە هەلومەرجێك دا دروست دەکرێن کە تاك وێڕای هانا بردن بۆ سەرچاوە ناوچەییەکانی شوناس، پابەندی بنواشەو بایەخە گشتییەکانیش بێ (Pieterse, 2000: 102).

ئەوانەی باسمان کرد تایبەتمەندییەکانی دووبارە بونیادنانەوەی ناتایبەتگەرایانە یان شوناسن کە بۆ تێپەرین لە قەیرانی شوناس و مانا لە کۆمەڵگەی جیهانیی هاوچەرخ دا پێویستن. هەرچەند لەم بارەیەوە کە پرۆسەی بەجیهانیبوون دەرەتانی ئەم جۆرە بونیادنانەوەیە پێك دێنێ و لەم دەرەتانەش کەڵك وەردەگیرێ گومانێك نیە، بەڵام لە سەر رادەی ئەم کەلك وەرگرتنە کۆدەنگی نیە. ژمارەیەك لە تیۆریستەکان پێیان وایە لایەنی باڵادەستی بونیادنانەوەی شوناس لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان دا ناتایبەتگەرایانەیە و ژمارەیەکیش ئەم شوناس سازییە زۆر بە بەرتەسك و لاواز دەژمێرن.

لاشو یوری لایەنی جیاکردنەوەی قۆناخی باڵای نوێبوونەوە[63] لە چۆنایەتیو چەندایەتی سەرچاوەکانی شوناسو جۆری بونیادنانەوەی شوناس دا دەدۆزنەوە. لە روانگەی ئەوانەوە لەم قۆناخەدا فەزاگەلێکی نویَ لە ژیانی کۆمەڵایەتیی تاکەکان دا کرایەوە کە یەکێك لەوان فەزایەکی تایبەت بۆ ژیانو شوناس سازیو چەمهەڵگری بوو. لە چوارچێوەی ئەم گۆڕانکارییانە دا جۆرێك سەرمایەی کولتووریی جوانیناسانە لە نێوان گرووپ گەلێکی زیاتر لە خەڵك پەرەی گرتو هونەرو وێژە بە مانا بەرینەکەیان، بوون بە سەرچاوە سەرەکییەکانی بونیادنانەوەی شوناسی خود (Lash and Urry, 1994: 54).

ئالبرۆو گیدێنزیش پێیان وایە نموونەی سەرەکیی شوناسسازی لە کۆمەڵگەکانی ئێستادا ناتایبەتگەرایانەیە. لە روانگەی ئالبرۆوە پرۆسەی بە بەجیهانیبوون بە بەرین کردنەوە و زیادکردنی پێوەنییە کۆمەڵایەتییەکان، خۆ شوناس سازیی بڕەو پێ داوە (Albrow, 1996: .152).

گیدێنزیش لەم بڕوایە دایە کە لە قۆناخی باڵای نوێبوونەوە دا، بەستێنی شوناس سازی دەگۆڕێ و دەبێتە پرۆژەیەکی رێفلکسیو و دەڵێ بە هەر رادەیەك نەریت پێگەی خۆی لە دەست بداو ژیانی رۆژانە بە پێی هەڵکردنی دیالکتیکی ناوچەییو جیهانی بونیاد بنرێ، تاکەکان ناچار دەبن لەسەر هەڵبژاردنی شێوە ژیانی خۆیان لە نێوان بژاردە جۆراوجۆرەکان دا قسە بکەن (Giddens, 1991: 1-5)

بەڵام مانوئیل کاستێل بۆ چوونێکی جیاوازی هەیە. ئەو هەرچەند لە سەر ئەم بابەتە لەگەڵ گیدێنز هاورایە کە "گۆڕانکارییەکانی جیهانی هاوچەرخو شکڵ گرتنی کۆمەڵگەی رایەڵکە تەوەر، پرۆسە [( نەریتی و باو)]ی شوناس سازیی [ بردۆتە] بەر پرسیار" و جۆرێك قەیرانی شوناسی لێ دەکەوێتەوە، بەڵام لایەنی باڵادەستی بونیادنانەوەی شوناس بە هیچ شێوەیەك بە ناتایبەتگەرایانە نازانێ. کاستێل دەڵێ لە دۆخێکی ئەوتۆدا، بەرنامەرێژیی رێفلکسیوی ژیان تەنیا بۆ بژاردەکانی هەڵکەتوو لە فەزای بێ زەمەنی رەوتە جیهانییەکان دا دەگونجێ. لە کۆمەڵگەی رایەڵکە تەوەردا بونیادنانەوەی شوناس بە پێی بنواشە کامیونالەکان روو دەدا کە بونیادگەرایی ئاینیی، نەتەوە گەراییو ئیتنیسیتە نیشانە بەرچاوەکانی ئەون (Castells, 1997: 11-12)

دیارە روانگەکانی تیۆریستەکانی وەك لاش، گیدێنزو ئالبرۆ نیشانەی ئەوە نیە کە کۆمەڵگەی جیهانیی ئێستا تەنیا گۆڕەپانی بونیاد نانەوەی شوناسەو بونیاد نانەوەی

63- high modernity



تایبەتگەرایانە جێگایەکی نیە. ئەوان بوونی بونیادنانەوەی تایبەتگەرایانەی دەرکەوتوو لە بزووتنەوە بونیادگەرایانە جۆراوجۆرەکان دا قبوولْ دەکەن، بەڵام ئەو بە نموونەیەکی لاوەکیو پەراوێزی دەزانن کە بە بەردەوامیی پرۆسەی بەجیهانیبوون و پێشکەوتووتر بوونی نوێبوونەوە کەمڕەنگتر دەبێ. لە حاڵێك دا تیۆریست گەلێکی وەك کاستێل پێیان وایە ئەم خوازیە (ئیدعایە) لەگەڵ راستییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی هاوچەرخ گونجاویی نیەو تایبەتگەرایی بە دیاردەیەکی گرنگترو گشتگیرتر دەژمێرن.

هەر چۆنێك بێ هەروەك دیتمان، سەرەڕای جیاوازیی بۆچوونی جیددی لەسەر رادە و توندیی بونیادنانەوەی تایبەتگەرایانەی شوناس، بوونی ئەم جۆرە بونیادنانەوەیە بە هیچ شێوەیەك جێگای گومان نیە، لە راستی دا بونیادنانەوەی باسکراو هەوڵێکە بۆ دەربازبوون لە قەیرانی شوناس بە بەهرە وەرگرتن لە سەرچاوەو ئامرازەکانی شوناس سازیی نەریتی. ئەوانەی لەم شێوازە کەڵك وەردەگرن بە دوای ئارامی و هێمنایەتییەکەوەن کە ئەو فەزا تا رادەیەك داخراوە کولتووری کۆمەڵایەتییەی لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا هەیە دابینی دەکا. کەواتە بە سانایی بۆ لای ئەو بزووتنەوانە رادەکێشرێن کە وەك پەرچەکردارێکی بەرگریکارانە لە بەرانبەر پرۆسەی بەجیهانیبوون دا، وادەی بونیاد نانەوەو بوژانەوەی فەزا گەلێکی ئەوتۆ دەدەن.

ئەم بزووتنەوە کۆمەڵایەتییانە هەمان تایبەتگەراییە کولتوورییەکانن کە ئەم توێژینەوەیە لە هەوڵی شیکاری و روونکردنەوەی ئەوانی داوە. بەم مەبەستە تا ئێستا بوونی جۆرێك لێك گرێدراویی ماناداری نێوان پرۆسەی بەجیهانیبوون، وەك بگۆڕێکی سەربەخۆ و تایبەتگەرایی کولتووریمان دەس نیشان کردوە و نیشانمان داوە کە بە توندتر بوونو پەرەگرتووتربوونی پرۆسەی ناوبراو لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم دا تایبەتگەراییە کولتوورییەکانیش توندو گشتگیرتر بوون و ئەم لێك گرێدراوییە هەروا درێژەی هەیە. بەڵام لەورووەوە کە تەنیا نیشاندانی لێك گرێدراوی، بایەخێکی شیکارییانەی ئەوتۆی نیە ، هەوڵمان داوە چونیەتیی پێوەندییو کارتێکەریی نێوان ئەو دوو دیاردە یان بگۆڕەش روون بکەینەوە.

بۆ روون کردنەوەی شێوەی پێوەندیو کارتێکەریی یان بە واتایەك روون کردنەوەی میکانیسمی هۆکردانە کەڵك لە چەمکی قەیرانی شوناس سازیی و مانا وەرگرت و بەڵگاندمان کە پرۆسەی بەجیهانیبوون بە شێواندنی دۆخەکەو لەنێوبردنی سەرچاوەکانی شوناس سازی قەیرانێکی بەرینی شوناس دەخولقێنێ. کەواتە تاكو گرووپ گەلێکی پڕژمار لە دەوری ئەو

ئایدیۆلۆژیی و بزووتنەوانەی کە وادەی لوانی شوناس سازیی نەریتی دەدەن، کۆدەبنەوە. تایبەتگەراییە کولتوورییەکان هێما زەقەکانی ئەم جۆرە ئایدیۆلۆژی و بزووتنەوانەن.

بەڵام لەلایەنی شێوازناسانەو لۆژیکییەوە هێشتا دەتوانین بپرسین کە چۆن پێوەندی لە نێوان قەیرانی ناوبراوو تایبەتگەراییە کولتوورییەکان دا پێك دێ، یان چۆن دەتوانین ئەو قسەیە بکەین کە قەیرانی شوناسی سەرچاوە گرتوو لە پرۆسەی بەجیهانیبوون بەستێنی بۆ تایبەتگەراییە کولتوورییەکان دابین کردوە. بۆ وڵامدانەوە بەم پرسیارەو نیشاندانی پێوەندیی نێوان قەیرانی شوناس و تایبەتگەرایی، وێڕای دەس نیشان کردنی دووبارەی توخمە ئایدیۆلۆژیکەکان و بزووتنەوە تایبەتگەرایانەکان روونی دەکەینەوە کە ئەو توخمانە کەم تا زۆر بەلای دابین کردنی پێداویستییە رۆحی- دەروونییەکانی ئەو تاکانەن دان کە تووشی قەیرانی شوناس بوون.

## تایبەتگەرایی کولتووری، پەرچەکردارێك بە قەیرانی شوناس و مانا

هەروەك لە پاژە جۆراوجۆرەکانی بەشی دووهەمدا باسمان کرد، تایبەتگەراییە کولتوورییەکان دیاردەگەلێکی جۆراوجۆرن و لە هێندێك لایەنەوە پێکەوە جیاوازییان هەیە. بەڵام لە روانگەیەکی گشتییەوە، دەتوانرێ ژمارەیەك توخم و تایبەتمەندیی دەس نیشان بکرێ کە کەم تا زۆر لە ئایدیۆلۆژیی هەموو تایبەتگەراییە کولتوورییەکانو گوتاری زاڵ بەسەر ئەوان دا هەیە. لە پاژی کۆتایی بەشی سێهەم دا بە کورتی باس لەو تایبەتمەندییانە دەکەین و پێوەندیی ئەوان لەگەڵ قەیرانی شوناس و مانا- کە بەرهەمی پرۆسەی بەجیهانیبوونە- روون دەکەینەوە.

یەکەمین تایبەتمەندیی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان دژایەتی لەگەڵ پرۆسەی بەجیهانیبوون و رەت کردنەوە ئەوە. لەو رووەوە کە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان پەرچەکردارگەلێکن لە بەرانبەر قەیرانی شوناسو مانا لە جیهان دا، لە دەس نیشان کردنی هۆکارەکانی قەیران و هێزە قەیران خوڵقێنەکان خۆ نابوێرین. دەکرێ بگوترێ لە هەموو تایبەتگەراییە کولتوورییەکان دا لە پرۆسەی بەجیهانیبوون و تارادەیەك نوێبوونەوە وەك هۆکار و خوڵقێنەری سەرەکیی قەیرانی شوناس و مانا ناوبراوە. کەواتە پرۆسەی جێگای باس بە شێوەی جۆراوجۆر رەت دەکرێتەوە(Peterson, 1999: 86).

پێداگرتن لە سەر شوێن، ناوچە و سەرزەویی دیاریکراو تایبەتمەندیی دووهەمی ئایدیۆلۆژییە تایبەتگەراکان پێك دێنێ. ئەم تایبەتمەندییە لە پلەی یەکەم دا بۆ هەست کردن بە ئارامیو دڵەراوکێی بەرهەم هاتوو لە پچڕانی پێوەندیی چڕی نێوان شوێن و شوناس دەگەڕێتەوە





کە پرۆسەی بەجیهانیبوون بە فەزامەندکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی دەی خوڵقێنێ. نائارامیی بەرهەمهاتوو لە فەزامەندی و سەرزەویی سڕینەوەوە، تاکەکان ناچار دەکا بۆ شوێنمەند کردنەوەی دووبارەی شوناس و دانانی ماڵێکی کولتووریی ئارام هەوڵ بدەن. لە راستی دا نموونەی زۆر هەیە کە نیشاندەری سەرزەویگەرایی دووبارەی تاکەکان و گرووپە جۆراوجۆرەکانە وەك پەرچە کردارێك لە ئاست سەرزەوی سڕینەوە یان دیالکتیکی سەرزەوی سڕینەوە و بووژانەوەی سەرزەوی دا (Tomlison, 1999b: 86).

لەم روانگەیەوە دەتوانرێ بگوترێ کە پرۆسەی بەجیهانیبوون بە شێواندنی ئەرکی شوناس سازیی شوێن، دەبێتە هۆی ئەوە کە مرۆڤەکان بۆ دوورکەوتنەوە لە قەیران، لانیکەم دەستەوداوێنی بونیادنانەوەی خەیاڵیی سەرزەوی و شوێن بن. هیند و پاکستان.... بە راشکاوی دووبارە لە لەندەن دەردەکەون، تارانی بەر لە شۆرش لە لۆس ئانجلێس شکڵ دەگرێ ... لە حاڵێك دا کە شوێنە راستەقینەو ناوچەکان کەمڕەنگ دەبن، بیرۆکە گەلی پێوەندیدار بەو شوێنانەی لەلایەنی کولتوورەوە جیاوازن، لە ئاکامی کۆبوونەوەی مرۆڤە بێ ریشەکان لە دەوری شارەکان شوێنەکان و کۆمەڵگە خەیاڵییەکان، زەقتر دەبنەوە و ئەمە لە دنیایەکە دا روو دەدا کە وا دێتە بەرچاو رۆژ لە رۆژ زیاتر چەشنە ئەم وێستگە سەرزەوی بنەمایانە رەت دەکاتەوە (Gupta and Ferguson, 1992: 10-11).

ئەم چەشنە مەیلانە دەری دەخەن کە شوناسی سەرزەوینیی شوێنمەند، بەتایبەت کاتێك کە لەگەڵ نژاد، ئیتنیك، رەگەز و جیاکردنەوەی ئایینیو چینایەتی ئاوێتە بێ، دەبێتە یەکێك لە کاریگەرترین بنەماکانی ئامادەیی سیاسی (Harvey, 1993: 4). مرۆڤێك کە دیهەوێ شوناسی لەرزۆکی خۆی لەسەر بنەمای شوێنێکی جێگیرو نەگۆڕ بونیاد بنێتەوە، بێ گومان لە بەرانبەر ئایدیۆلۆژییە تایبەتگەراکان دا خەسارهەڵگر دەبێ. لەم رووەوە دەکرێ بگوترێ لە هەموو تایبەتگەراییە کولتوورییەکان دا، بەشێوەیەك لە شێوەکان لەسەر شوێن و سەرزەوی وەك سەرچاوەو ئامرازێکی کارا بۆ بونیادنانەوەی شوناس پێ داگیراوە.

هەروەك لە بابەتی تایبەتگەراییە ئیتنیکی و بزووتنەوە نەتەوەگەرایانەکان دا باسمان کرد، لە ئایدیۆلۆژییەکانی ئەم جۆرە تایبەتگەراییانە دا، پێگەیەکی بێ وێنە بۆ ناوچە و سەرزەوی تەرخان کراوە. لەو ئایدیۆلۆژییانەدا ئەم ناوچە یان سەرزەوییە بێ وێنەیە بە نیشتمان، شوێنی لە دایکبوونو سەرزەویی باووباپیران دادەنرێ کە لە رابردوویەکی زۆر دوورەوە شوێنی نیشتەجێ بوونی ئیتنیك، نژاد یان نەتەوەیەکی دیاریکراو بووە و ئەوان بەردەوام بۆ پارێزگاری کردن لە

سنوورەکانی ئەو بەربەرەکانیو گیانبازییان کردوە. لە ئاکامی ئەو بەربەرەکانی و فیداکارییانە دا لە هاتنە ژوورەوە و دزەکردنی توخمە بێگانەکان بەرگری کراوە و خەسارێکی جیددی بە شوناس و کولتووری رەسەنی خەڵکی ئەو سەرزەوییە نەگەیشتووە.

هەر ئەم پێگە تەوەرییەی شوێن لە دروست کردنی شوناس و پاراستنی ئەو دا بۆتە هۆی ئەوەی تاوەکوو بزووتنەوە تایبەتگەرایانە ئیتنیکی و نەتەوەییەکان بەتوندی بێزاری کارتێکەریی رووخێنەرانەی بەجیهانیبوون لەسەر پێوەندیی شوێن و شوناس دەربڕن و هانا بردن بۆ شوێن و سەرزەوی وەك شێوازێکی کارا بۆ بونیادنانەوەی شوناس پەسند بکەن و پێی لەسەر دابگرن. لە روانگەیەکی ئەوتۆوە دووبارە دۆزینەوەی شوناسی رەسەن و جێگیر لە دنیایەك دا (کە بزۆکی، رەوانی و لەبەرزی و نزمی دا بوون تایبەتمەندییەکانیەتی) پێویستی بە پاك کردنەوەی نیشتمانی دایك لە توخمە بێگانە ماددی و نامادديیەکانە بۆ ئەوەی وەك سەرچاوەیەکی جێگیرو دیاریکراو، شوناس بە میراتگرە حەقیقییەکانی خۆی ببەخشێ. لە راستی دا ئەم ئایدیۆلۆژییانە لەسەر بابەتێك پێ دادەگرن کە ژمارەیەك لە تیۆریست و توێژەرەکان لە ژێر ناوی "بەرهەمی ناوچە"دا باسی لێوە دەکەن (Meyer and Geschiere, 1999:3).

لە نیشانە جۆراوجۆرەکانی بونیادگەرایی ئایینیش دا دەتوانرێ ئەم تایبەتمەندییە کەم تا زۆر دەس نیشان بکرێ. سەرزەوییەکی بێ وێنە و تەنانەت پیرۆز کە لە ئایدیۆلۆژیی تایبەتگەرایی ئیتنیکی و نەتەوەیی دا بۆ ئیتنیك و نژاد و نەتەوەیەکی تایبەت لەبەرچاو گیراوە، لە بونیادگەراییە ئایینییەکان دا بۆ شوێنکەوتووانی ئایینێکی تایبەت تەرخان دەکرێ. ئەگەرچی ژمارەیەك لە ئایینیەکان بە تایبەت ئیسلام، مەسیحایەتی و جوولەکە، سەرزەوینی کردنی شوناس رەت دەکەنەوە باوەڕ و بروای ئاینیی بە تەنیا سەرچاوەی شوناس دەزانن، بەڵام تایبەتگەراییە ئاینیی یەکان بە شێوەی ناراستەوخۆ یان بە راشکاوی جیاوازبوونی سەرزەوییەکی دیاریکراو دەسەلمێنن و پاك کردنەوەی سەرزەوییەك کە هی ئۆممەتێکە لە ناپاکی و نارەسەنی بە ئەرکی سەرەکیی خۆیان دەزانن. دیارە لە بزووتنەوە ئایینیەیەکانی سەر بە ئایین و ئایینزاکانی دیکەدا، ئەم تایبەتمەندییە زۆر زەقە کە پێداگرتنی سیکەکان لەسەر "پاکەکان" لەم پێوەندییەدا بە وێنەیەکی بەرچاو دەژمێردرێ (Hallencreutz, .1996:17)

ئایدیۆلۆژییەکانی جۆرەکانی دیکەی تایبەتگەراییە کولتوورییەکانیش ئەم تایبەتمەندییە لە خۆدەگرن و بە پێداگرتن لە سەر شوێن و سەرزەوییەکی دیاریکراو ئەو تاکانە کە بۆ بونیادنانەوەی شوناسی خۆیان پێویستیان بە سەرچاوەیەکی جێگیر هەیە، بۆ لای خۆیان رادەکێشن. بۆ وێنە لە



ئایدیۆلۆژیی زاپاتیستەکان دا، سەرزەویی میکزیك جێگایەکی تایبەتی هەیە، شوێنکەوتووانی بزووتنەوەی نیشتمانپەروەرانی ئەمریکا، ئەم سەرزەوییە بە هی ئەمریکاییە رەسەنەکان دەزانن، بزووتنەوەی ئایومی ژاپۆن، رزگارکردنی ئەم سەرزەوییە لە تێدا چوون و گەندەڵی بە گرنگترین ئەرکی خۆیان دەزانن، لە نژادپەرستییە نوێیەکانیش دا باس لە گرێدراویی سەرزەوییەکی دیاریکراو بە نژادێکی " بانتر" دەکرێ (silverman, 1999: 54-55; Castells, 1997: 73-101) .

پێداگرتن لەسەر جیاوازبوون و جیاوازیو دەرخستنی سنوورەکان دەتوانێ بە تایبەتمەندیی سێهەمی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بژمێردرێ. لە هەموو تایبەتگەراییە کولتوورییەکان دا کەم تا زۆرو بە شێوەگەلی جۆراوجۆر لەسەر بونیادنانەوەی سنوورەکان پێداگیراوە و دووبارە واتا کردنەوەی خۆیی- ناخۆیی دەکەوێتە رۆژەڤی بزووتنەوە تایبەتگەراکانەوە. ئەم بابەتە لەم رووەوە گرنگیی هەیە کە پرۆسەی بەجیهانیبوون بە دزەهەڵگرکردن و لە نێو بردنی سنوورەکان، [پرسی] جیاوازی و دیتر " پرابلمتیك" دەکا. لە دۆخێکی ئەوتۆ دا تێکەڵاوییەکانی سەرزەویی ئێمە و دیتران زۆر زیاد دەکا و ناسینەوەی سنووری نێوان ئەو دوو سەرزەوییە دژوار دەبێ (Lechner, .2000: 339)

هەر بەم هۆیە بونیادگەراییە کولتوورییەکان وادەی ژیاندنەوەی جیاوازییە تارادەیەك رەها و سنوورە کەم تا زۆر روونەکان دەدەن و هەوڵ دەدەن جیاوازیی بەردەوام و شیاوی دەست نیشان کردن وەك نیشانەی شوناس زەق بکەنەوە. ئەم سنوورە و جیاوازیی بونیادنراو لەسەر ئەو، رەنگە ئایین، نژاد، ئیتنیسیتەو ناسیونالیتە بێ. ئایدیۆلۆژییە تایبەتگەراکان بە پێداگرتن لەسەر ئەم وتەزا کولتوورییانە ، مرۆڤی ئەمرۆکە کە بە دوای جیاوازی دا دەگەڕێ تا شوناسی خۆی بسەلمێنیو نیشانی بدا، بۆ لای خۆی رادەکێشێ (Silverman, 1999: 53) . لەم رووەوە وادەی ئەم ئایدیۆلۆژییانەی باسیان کرا بۆ ئەم جۆرە مرۆڤانە بریتییە لە سڕینەوەی ئەو گومانەی کە دەوری جیاوازییان داوە.

پێویستی بە گومان سڕینەوەو وەدەست هێنانی دڵنیایی لە ناسینەوەی خۆیی و ناخۆیی دا جاری وایە ئەوەندە توندە کە شەڕی ئیتنیکیی زۆر کارەساتبارو تۆقێنەری لێ دەکەوێتەوە. کاتێك کە تاکگەلێکی جیاواز فەزاگەلێکی کۆمەڵایەتی داگیر و ئاڵۆز دەکەن، کرداری توندوتیژانە دەبێتە تەنیا ئامرازی دڵنیایی پەیداکردنی تاك بە خودی رەهای خۆی و خراپترین جۆری دڵنیایی (دڵنیایی مەرگ تەوەر") شکڵ دەگرێ. کێشەو شەڕە ئیتینکییەکان لە ئەفریقای ناوەندی لە دەیەی حەفتا دا ، رۆژهەڵاتی هیندوستان لە سەرەتای ١٩٨٠و ئەورووپای

ناوەندی لە کۆتایی ١٩٨٠ و سەرەتای ١٩٩٠ دا دەتوانین بە وێنەکانی ئەم جۆرە جیاوازی و دڵنیاییانە بژمێرین (Appadurai, 1999: 321-.22).

لە شەپۆلی نوێی نەتەوەگەراییە ئیتینکییەکانیش دا تەوەرایەتی و پێگەی زەقی جیاوازی و شوناس بەروونی دیارە. بە پێچەوانەی بزووتنەوە ناسیونالیستییەکان لە سەدەی نۆزدەیەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، ئەم شەپۆلە نوێیە لەگەڵ گشتگەرایی دژایەتیی هەیە. بزووتنەوە نەتەوەگەرایانەکانی پێشوو کارتێکەریی هزرەکانی رۆشنگەرییان لە سەر بوو، لە چوارچێوەی زەمەنێکی جیهانی دابوو و هەوڵێك بوو دژی جۆرێك نایەکسانی و جیاوازیدانان. بەڵام نەتەوەگەرایی ئێستا جیاوازی بنەما و شوناستەوەرە و بۆ پاراستن و رەوایی بەخشین بە خۆی دەستەوداوێنی بەجیهانیبوون دەبێ نەك بنواشە و بایەخە گشتی و جیهانگرەوەکان. ئەم ناسیونالیسمە تێر نەبوویە، چونکە شوناس خوازیی ئەو راناوەستیێو هەر بەم هۆیە بچووکترین جیاوازییەکان بەردەوام زەقو تەشەنە دەکەن (Laidi, 1998: 59-60).

ئەم گۆڕانەی ناسیونالیمسی گشتگەرای دوێنێکە بە ناسونالیسمی جیاوازی تەوەری ئەمرۆ بە باشترین شێوە لە کۆمەڵگەی هیند دا دەرکەوتووە. ئامانجی حیزبی کۆنگرە و رێبەرانی ئەو پێك هێنانی نەتەوەی هیند بۆ لە هەموو ئیتنیكو ئایینەکان بوو. لە حالێك دا کە بە پێی بونیادگەرایی هیندو، هیندوستان نیشتمانی هیندوەکان و سەرزەویی پیرۆزی ئەوانە و لەوێ جێگایەك بۆ مەسیحییەکان و موسوڵمانەکان نیە. لە راستی دا ئەمە گۆڕانی مانای ئۆمانیستی و یونیورسالی " پێکەوە ژیان "ە بە بنواشە (پرنسیپ)ی" هەرکەس بۆ خۆی بوو" کە لە نەتەوەگەرایی هاوچەرخ دا گرنگییەکی بەرچاوی هەیە (Laidi, 1998: 60-61).

بە پێچەوانەی دوو تایبەتمەندییەکەی پێشوو کە پێوەندییان بە کارتێکەریی پرۆسەی بەجیهانیبوون لە سەر شوێنو فەزاوە هەیە، تایبەتمەندیی چوارەمی تایبەتگەرایی کولتووری بەرەنجامی کارتێکەری بەجیهانیبوون لە سەر زەمەنە. گۆڕانی زەمەنی کرنۆلۆژیك بە ئێستای بێ کۆتایی، لە نێو چوونی جیاوازیی نێوان رابردوو و ئێستا و ئەو شتەی هاوکاتی یان لە دەم دابوونی پێ دەگوترێ، یادەوەری و مێژوو ون دەکاو نائارامی و دڵەراوکێیەکی بەردەوام لە تاکەکان دا پێك دێنێ. بۆ ئەو کەسانەی کە گرفتاری قەیرانێکی ئەوتۆ بوون، شوناس سازی بە هۆی مێژوویەکی تایبەتەوە گرنگییەکی زیاتری دەبێ و هەست کردن بە بەردەوامی بە بێ رابردوو هاوبەش زۆر دژوار دەبێ . لە روانگەی ئەوانەوە گرنگترین کاناڵی خاوەن مانایی، رابردووی هاوبەش کۆمەڵگەیەکی راستەقینەیە(Guibernau, 1996: 133).



بونیادنانەوەی گێرانەوەیەکی مێژوویی تایبەتو پێداگرتن لە سەر، گێرانەوەیەکی ئەوتۆ ـ کە بە تایبەتی بەخشی هەموو تایبەتگەراییە کولتوورییەکان دەژمێردرێ ـ بۆ ئەم کارتێکەرییە قەیران خوڵقێنەی بەجیهانیبوون دەگەرێتەوە. ئەم مێژووە زۆرتر مێژووی درەوشانەوەی ئیتنیك، نژادو ئۆممەتێکە کە لە رابردوویەکی زۆر دوورەوە لە سەرزەوییەکی دیاریکراو دا نیشتەجێ بووەو بەردەوام رەسەنایەتی و باڵادەستیی خۆی پاراستووە. ئەو مرۆڤانەی لە دنیای ئیستای خۆیان دا هاوکاتی و نامێژوویی بوون ئەزموون دەکەن بە هۆی ئەم گێرانەوانەوە بانگی یادەوەریی مێژوویی خۆیان دەکەنەوە بە سەر دڵەراوکێ و نائارامیی سەرچاوە گرتوو لە هەستی نابەردەوامی دا زاڵ دەبن (Castells, 1997: .66).

ئایدیۆلۆژییە تایبەتگەراکان بۆ وڵامدانەوەی پێویستییەکانی ئەم مرۆڤانەی تووشی قەیرانی شوناس و مانا بوون نەك هەر رابردوو بە ئێستاوە گرێ دەدەن، لە سەر بەردەوامیی زەمەنی لە داهاتووش دا پێ دادەگرن. بەم پێیە روانگەیەکی بە تەواوی روون و هیوابەخش لە رابردوو دروست دەبێ و قسە لە باڵادەستی، سەرکەوتنو بەختەوەریی کۆتایی ئیتنیك، نەتەوە، ئۆممەت و نژادێکی تایبەت دەکرێ. هەروەك لە بەشی دووهەم دا باس کرا، پاککردنەوەی سەرزەوییەکی تایبەت لە بێگانەکانو گرێدراویی بێ ئەملاوئەولای ئەو بەخاوەنە سەرەکییەکەیەوە، جیهانداگربوونی ئایینێکی تایبەت، وەدەست هێنانەوەی مەزنیو باڵادەستیی لە دەست چووی ئیتنیك یا نەتەوەیەکی دیاریکراو و... لە هەموو تایبەتگەراییەکان دا کەم تا زۆر پێی لە سەر داگیراوەو ئیدعا کراوە کە بە بێ ئەملاو ئەولا لە داهاتوویەکی دوور یان نزیك دا دێنە دی.

پێنجەمین تایبەتمەندیی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان پێوەندیی بە کارتێکەریی بەجیهانیبوون لە سەر کولتوور هەیە. لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا، شوناسسازی بە هۆی سەرچاوە و توخمە سنووردارو رەها کولتوورییەکانەوە ئەنجام دەدراو هەر بەم هۆیە دڵنیایی و لێبراوییەك بە سەر تەکووزیی (سیستمی) مانایی مرۆڤەمان دا زاڵ بوو بەڵام بە تێك رمانی سنوورەکان و دەرباز بوونی کولتوورەکان لە بازنەی تەنگەبەری شوێن و سەرزەویی دیاریکراو، ژێرەییبوونێکی کولتووریی گشتگیر شکڵی گرت. بە وتەیەکی دیکە کولتوورەکان لە فەزایەکی زۆر بەرین دا دەکەونە لای یەك و دەستهەڵبەستی و رێژەییبوونی ئەوان دەردەکەوێ. کەواتە ئەو دنیا جێگیر و بێوێنەیەی کە مرۆڤەکان بەم سەرچاوە و کەرەستانە دروستیان دەکرد، تێك دەرووخێ و جۆرێك قەیرانی شوناس و مانا دێتە ئاراوە.

هەر ئەم گۆڕانە قەیرانخولقێنەیە کە تایبەتمەندیی پێنجەمی تایبەتگەرایی کولتووری یان دژە ڕێژەییبوون پێك دێنێ. لە ئایدیۆلۆژییە تایبەتگەراکان دا، لایەنی دژە ڕێژەیبوونی پڕڕەنگ و زەقە و هەموو جۆرە ڕەهاگەرایی یەك پێی لەسەر دادەگیرێ. بەرگری لە نەریتیش نیشانەیەکی دیکەی دژە ڕێژەییبوون و ڕەهاگەراییە. لە ڕاستی دا یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکان و تەنانەت گرنگترین تایبەتمەندیی بونیادگەرایی، بەرگری لە نەریتیە کە بە شێوەیەکی نەریتی ئەنجام دەدرێ. لەم چوارچێوەیە دا نەریتیەکان پاساو نادرێن، بەڵکوو بە حەقیقەتی ڕەها لە قەڵەم دەدرێن کە دەبێ بڕوایان پێ بهێنرێ (Giddens, 1994: 6). مرۆڤە قەیران لێدراوەکان هەوڵ دەدەن بە دەستەو داوێن بوونی نەریتەکان ، ئەو دڵنیایی و لێبڕاوییەی کە هەست دەکەن لە دەست دەچێ ، وەدەست بێننەوە (Hall , 1996: 309).

تایبەتمەندیی شەشەمی تایبەتگەرایی کولتووری، ڕەتکردنەوەی هەرچەشنە تێکەڵاوی و ئاوێتەبوونێك و پێداگرتن لە سەر پاکی و بابەتی ڕەسەنە. تێکڕمانی سنوورەکان نەك هەر کولتوورو شوناسکان ڕێژەیی دەکا، بەڵکوو ئەم ڕاستییەش دەردەخا کە بوونی کولتووری پاك و ڕەسەن ئیتر نەلواوە، چونکە فەزا دەخراوە کولتووری کۆمەڵایەتییەکان تێك رووخاون. وشیاریی لەم ڕاستییە بۆ ژمارەیەك لە مرۆڤەکان مایەی ترس و دڵەراوکێیە و بەم پێیە دەکەونە گەڕان بۆ دۆزینەوەی کولتووری نەگۆڕ، ڕەسەن و پاك (Silverman, 1999: 51) لەم ڕووەوە لە ئایدیۆلۆژییە تایبەتگەراکان دا قسە لە کولتوورو شوناسی ڕەسەنی ئایینی ، ئیتنیکی و نژادی دەکرێ و بوژاندنەوەی ئەم پاکییە تەنانەت ئەگەر زۆریشی تێ بچێ، بە ئەرکێکی مەزن لە قەڵەم دەدرێ (Robins, 1991: 25-27).

کۆمەڵگەرایی[64] تایبەتمەندیی حەوتەمی تایبەتگەرایی کولتوورییە کە وەك بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیی هاوچەرخ و فەلسەفەیەکی سیاسی، کە بە پەرچەکردارێك لە بەرانبەر تاکگەرایی زێدەڕوو لە جیهانی هاوچەرخ دا دەژمێردرێ (Bray, 1998: 175). ئەم تاکگەرایی و تاکتەوەرییە تارادەیەکی زۆر ئاکامی پرۆسەی بەجیهانیبوونە کە بە تێك ڕووخاندنی فەزا تارادەیەك داخراوە کۆمەڵایەتی- کولتوورییە نەریتییەکان، بابەتی کۆمەڵایەتی دەرباز دەکاو شوناسسازی کەم تا زۆر دەکاتە بەرپرسیارێتییەکی تاکە کەسی. نەك هەر دنیای کۆمەڵایەتیی تاك زۆر بەرین دەبێ، بەڵکوو بەرپرسیارێتیی ئەویش لە بەرانبەر بونیادنانەوەی خۆی دا زیادتر دەبێ (Gibbins and Reimer, .1999: 55)

64- communitzrianism





بەڵام ژمارەیەك لە تاکەکان لە ژێر قورسایی ئەم ئازادی و بەر پرسیارێتییە دا خۆ ڕاناگرن و لە ئازادی ڕادەکەن. ئەوان ڕێگای دەربازبوون لەم دۆخە دژوارو قەیرانییە تەنیا لە پێوەست بوون بە کۆمەڵێکی یەکگرتوو داخراو دا دەبینن. ئەم کۆمەڵ و گرەوپانە لەگەڵ دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی جیاوازییان هەیە و جۆرێك کۆمۆنی بەرگرین کە لە فەزای خۆیانو شوێنی خۆیان لە بەرانبەر لۆژیکی بێ شوێنی فەزای ڕەوتەکان دا..... بەرگری....و لە سەر باڵادەستیی بەهاکانی خۆیان لە بەرانبەر هەڵوەشانەوەی مێژوو لەزەمەنی بێ زەمەن دا... پێ دادەگرن (Castells, 1997: 356) ئایدیۆلۆژییە تایبەتگەراکان بەڵێنی بونیادنانەوەی ئەم چەشنە کۆمەڵەو فەزا کۆمەڵایەتییە داخراوانە دەدەن.

ئەو وێنانەی باسمان کردن گرنگترین تایبەتمەندییەکانی جۆرەکانی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان پێك دێننو لە هەموو ئایدیۆلۆژییە تایبەتگەرا جۆراوجۆرەکان دا دەتوانرێ ئەو تایبەتمەندییانە دەس نیشان بکرێ. لەم توێژینەوەیە دا ئەم تایبەتمەندییانە لەورووەوە گرنگییان هەیە کە پێوەندیی نێوان پرۆسەی بەجیهانیبوون و تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بە باشی ڕوون دەکەنەوە. بە لێکدانەوەی ئەم تایبەتمەندییانە دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین کە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان پەرچەکردارێکن بەرانبەر پرۆسەی بەجیهانیبوون و بەجیهانیبوون چۆن تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بەهێز دەکا.

بە گوتنێکی ڕوونتر، پرۆسەی بەجیهانیبوون بە بونیادنانەوەی فەزا و زەمەن، شوناس سازیی نەریتی زۆر دژوارو تەنانەت نەکراو دەکا. کەواتە جۆرێك قەیرانی شوناسو مانا، سەر هەڵدەدا و بونیادنانەوەی شوناس خۆلێ لانەدراو هەبێ. لەم دۆخە قەیرانیە دا ژمارەیەك لە تاکەکانو گرووپەکان هەوڵ دەدەن بە کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەو دۆخی نەریتیی شوناسسازی، خۆیان بونیاد بنێنەوە. ئەو تایبەتمەندییانە ئاماژەن بۆ ئەوە کە تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بە ڕەت کردنەوەی کارتێکەریی ڕووخێنەری بەجیهانیبوون لە سەر شوناسسازیی نەریتی و پێداگرتن لەسەر دابین کردنی هەلومەرجو پێداویستییەکانی ئەم جۆرە شوناس سازییە، ئەو تاکانەی تووشی قەیرانی شوناس و مانا بوون بۆ لای خۆیان ڕابکێشن و ڕێك بخەن.

## کورتە و ئاکامگیری

ئەم توێژینەوەیە هەوڵێك بوو بۆ دۆزینەوەی وڵامێکی شیاو بۆ ئەم پرسیارە کە بۆچی لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم و تەنانەت مانگەکانی سەرەتای سەدەی بیستو یەکەم دا شایەدی تایبەتگەراییە کولتوورییە زێدەروویەکان بووین. کەواتە، هاوکات لەگەڵ وشیاربوون سەبارەت بە جۆراوجۆر بوونی هۆکارە کاریگەرەکانی دیاردەی تایبەتگەرایی، سەرەتا وڵامەکەی خۆمان لە چوارچێوەی گریمانەیەك دا بەم چەشنە دەردەبڕین کە پرۆسەی بەجیهانیبوون تایبەتگەراییە کولتوورییەکان بەهێز دەکا. دواتر ئەم گریمانەیەمان کردە تەوەر و توێژینەوەکەمان لە سێ بەشدا ڕێکخست و هەوڵمان دا بۆ سەلماندنی گریمانەکە، پێوەندیی نێوان دوو بگۆڕە نیشان بدەین.

لە بەشی یەکەم دا سەبارەت بە پرۆسەی بەجیهانیبوون، وەك بگۆڕێکی سەربەخۆ قسەمان کرد و بە روانینێك لە تیۆرە جۆراوجۆرەکان لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەم پرۆسەیەمان خستە بەر باس. پێداچوونەوە بەو تیۆرانە دا دەری خست کە ئەگەرچی چەمکبەندی و پێناسە گەلێکی پڕ ژمار و جۆراوجۆر لە بەجیهانیبوون کراوە، زۆربەی تیۆریستەکان ئەو بە جۆرێك بونیادنانەوەی فەزا و زەمەن دەزانین. هەروەها لەم بەشە دا ئاوڕمان لە وێنە جۆراوجۆرەکانی بەجیهانیبوون دایەوە و شێوە جۆراوجۆرەکانی ئەومان لە بیاڤە ئابووری، سیاسی و کولتوورییەکان دا دەس نیشان کرد.

بەشی دووهەممان بۆ باس کردن سەبارەت بە چیەتیی تایبەتگەرایی کولتووری، وەك بگۆڕێکی بەستراوە، تەرخان کرد. بە مەبەستی خستنە رووی وێنەیەکی روون لەم دیاردەیە، سەرەتا ئاماژەمان بە گشتگەرایی کولتووری کردو تایبەتمەندییەکانیمان تاوتۆی کرد. دواتر گوتمان تایبەتگەرایی کولتووری چیە و نیشانمان دا کە ئەم دیاردەیە چۆن بەرینتر و توندتر دەبێ. دیارە جۆراوجۆریی تایبەتگەرایی و جۆرە جیاوازەکانی ئەومان، بە باس کردن لە تایبەتگەراییە ئیتنیکی، نەتەوەیی، ئایینی، نژادی و جۆرەکانی دیکە، دەرخستوە.

دوای کۆکردنەوەی پێدراوگەلێك کە نیشانەی بوونی پێوەندییەکی واتادار لە نێوان بەجیهانیبوون و تایبەتگەراییە کولتوورییەکان دایە لە دووبەشی سەرەتادا، هەوڵمان دا ئەم پێوەندییە شی بکەینەوە. کەواتە لە بەشی سێهەم دا سەرەتا ئاماژەمان بەو روانگانە کرد کە لەگۆڕێ دان و توانایی کەمی ئەوانمان بۆ شیکاریو روونکرنەوەی تایبەتگەرایی کولتووری نیشان دا. دوای رەخنە گرتن لەو روانگانەی هەن و روونکرنەوەی پێوەندیدار بەوانەوە، شیمان



کردەوە کە چۆن پرۆسەی بەجیهانیبوون، بە هۆی لەکارخستنی شوناس سازیی نەریتی، بەستێن و هەلومەرجێکی لەبار بۆ شکڵ گرتنو پەرە گرتنی تایبەتگەراییە کولتوورییەکان دابین دەکا.

بە کورتی: پرۆسەی بەجیهانیبوون لە ڕێگای بونیادنانەوەی فەزا و زەمەن، دزەهەڵگر کردنی سنوورەکان و بەرین کردنەوەی بەرچاوی فەزای کۆمەڵایەتی، سەرچاوەو دۆخی پێویست بۆ شوناسسازی و مانا دۆزینەوەی نەریتی تا رادەیەکی یەکجار زۆر لە نێو دەبا. لە ئاکام دا جۆرێك قەیرانی شوناس و مانا دروست دەبێ و بونیادنانەوەی شوناس دەبێتە شتێکی خۆلێ لانەدراو. هێندێك کەس سەرکەوتن بە سەر ئەو قەیرانە دا لە دەستەوداوێن بوونی شێوازە نەریتییەکانی شوناس سازی دا دەبینن. لە راستی دا تایبەتمەندییەکان و توخمە ئایدیۆلۆژیکەکانی ئەم جۆرە تایبەتگەراییانە رەنگدانەوەی پێداویستییە دەروونییەکانی ئەم جۆرە کەسانەیە.

ئایا ئەم تایبەتگەراییانە خۆلێ لانەدراون؟ بێ گومان وڵامدانەوە بەم پرسیارە بەستراوەتەوە بە وشیاری سەبارەت بە خۆلێ لادراوبوون یا نەبوونی قەیرانی شوناس و ماناو وەدەست هێنانی ئەم وشیارییەش پێویستی بە تێگەیشتنێکی دروست لە پرۆسەی بەجیهانیبوون هەیە. کەواتە ئێستا وەك ئاکامگیری، بەروانینێکی جیاواز لە پرۆسەی ناوبراو و دەرکەوتەکانی ئەو ئەم پرسیارە دەکەینە تەوەری باسەکە و، ئاماژە بە چەند خاڵ دەکەین.

لانیکەم لە لایەنی مێژوویییەوە دەتوانین بڵێین کە پرۆسەی بەجیهانیبوون گۆڕانێکی گەڕانەوەهەڵنەگرە. نەك هەر ناتوانین هەلومەرجی قۆناخی بەرلە بەجیهانیبوون ببوژێنینەوە، بەڵکوو راگرتنی ئەم پرۆسەیە یان تەنانەت شل کردنەوەی هەڵپەی ئەو ئەستەمە. هەر رۆژێك کە تێدەپەڕێ بەرینایی و هەڵپەی پرۆسەی بەجیهانیبوون زیاتر دەبێ، باندۆر هەڵگریی تاكو گرووپە جۆراوجۆرەکان لەم پرۆسەیە زیاد دەکا و دەرەتانی بەدوورمانەوە لە کارتێکەرییەکانی کەم دەبێتەوە. هەر بۆیە شکڵ گرتنی جۆرێك قەیرانی شوناس و ماناش کە لە هاوچەشن کردنی کولتووری و تایبەتگەرایی کولتووری دا دەردەکەوێ، خۆلێ لانەدراوە.

پرۆسەی بەجیهانیبوون لە لایەك بە گشتگیرکردنی کولتوورێکی تایبەت، جێگا بە کولتوورەکانی دیکە لێژ دەکا و پەرە بە یەکدەستبوونی کولتوورەکان دەدا. رووکاری باڵادەستی ئەم کولتوورە کە جیهانداگر دەبێ، کولتووری بەر خۆرانەی رۆژئاوا، بە تایبەت کولتووری ئەمریکایە. ئەم کولتوورە جیهانییە نەك هەر هەڵگر و پشتیوانی بەرژەوەندییەکی تایبەتە، بەڵکوو ناتوانێ سەرچاوەی پێویست بۆ بونیادنانەوەی شوناسیش دابین بکا. لە لایەکی دیکەوە، بەجیهانیبوون بە تێك دانی شوناس سازیی نەریتی، قەیرانێکی گشتگیری شوناس و مانا لە

کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی جیهان دا دەخولقێنێ و بەستێنێکی زۆر لەبار بۆ تایبەتگەرایی کولتووری دابین دەکا. بەم چەشنە دەکرێ بگوترێ دوو ڕەوتی کولتووریی سەرچاوەگرتوو لە بەجیهانیبوون هەمووو کۆمەڵگەکانی جیهان دەگرێتەوە.

بەڵام ئەگەر دڵدان بە بایەخ و سەنگی بنواشەکانی وەك ئازادی ، یەکسانی، مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسی دابنێین، بێگومان دەبێ بگوترێ کە نە کولتووری بەرخۆری (بەکارهێنەکی) دەرەتانی تێپەڕین لە قەیرانی شوناس و مانا پێك دێنێ نەك تایبەتگەرایی کولتووری. لەوە ڕا کە لە هیچ کام لەم دوو ڕەوتە دا مرۆڤ وەك مرۆڤ جێگایەکی نیە، بنواشە و بونیاد و دامەزراوە ناوبراوەکان بەراشکاوی پشتگوێ دەخرێن و تاك لە گۆڕەپانی ڕمبازێنی هۆزگەرایی و بەرخۆری دا گرفتار دەبێ. هەروەك بابێر بەباشی دەری دەبڕێ لە دنیای ژێر زاڵێتیی" جیهاد" و" مەك ورلد" دا، هەر کەسێك هانا بەرێ بۆ " مەك ورلد" دەبێتە بەکارهێنەرێك و بە پەیجووریی شوناس لە چوارچێوەی تایبەتگەرایی کولتووریی دا بە "هۆزێکی" تایبەتەوە گرێ دەدرێ ، بەڵام نابێتە هاووڵاتی و بەبێ هاووڵاتیانیش دیموکراسی لە مانا بەتاڵ دەبێ (Barber, 2000: 24). ئەگەر ئەم دوو ڕەوتەی ناویان برا ناتوانن بەبێ دەستدرێژی بۆ سەر مافەکانی مرۆڤ وەك مرۆڤ دەرەتان بۆ بونیادنانەوەی شوناس پێك بێنن، ئایا ڕێگایەکی سێهەم هەیە؟ وڵامی ئێمە بۆ ئەم پرسیارە ئەرێیە . ئەگەرچی پرۆسەی بەجیهانیبوون دەکرێ بڵێین ڕێگا بۆ بونیادنانەوەی ئەو فەزا کۆمەڵایەتیـ کولتوورییانەی کۆمەڵگە نەریتییەکان کە تارادەیەك داخراون ناهێڵێتەوە، دەرەتان گەلێکی نوێش بۆ شوناسسازی پێك دێنێ. دیارە شوناسێك کە لە کۆمەڵگەی جیهانی دا و بە کەڵك وەرگرتن لە دەرەتان گەلێکی ئەوتۆ دروست دەکرێ، لەگەڵ شوناسی دروست کراو لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا جیاوازە، چونکە لە سەر بنەمای پێوەندییەکی جیاواز لەگەڵ شوێن شکڵ دەگرێ .

بێ گومان پرۆسەی بەجیهانیبوون، پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە بەندی شوێن و ناوچە دەرباز دەکاو لە فەزاو زەمەنێکی زۆر بەرین دا پەرەی پێدەدا، بەڵام ئەم گۆڕانە بە مانای کۆتایی ژیانی خەڵك لە ناوچە ڕاستەقینەکان دا نیە، بەڵکوو تایبەتمەندیی ئەو ناوچانە دەگۆڕێ. کەواتە ناتوانین بڵێین پرۆسەی بەجیهانیبوون بە هۆی هێزە کۆمەڵایەتییە دەرهەست و دوورەدەستەکان کە زیاتر لە پێشوو فۆرم بە ژیانی مرۆڤەکان دەدەن، هێمنایەتی و ئارامیی ژیانەکیی سەرچاوەگرتوو لە ئەزموونی کۆمەڵایەتیی ناوچەیی لە نێو دەبەن. خەڵك هێشتاش دەتوانن لە چوارچێوەی بەستێنە ناوچەییەکانی ژیانی خۆیان دا جۆرێك هەستی ناسیاوی و



نزیکایەتیی ئارامیدەریان هەبێ، بەڵام ئەم هەستە بە هیچ شێوەیەك لە " تایبەتمەندێتییەکانی شوێنی ناوچەیی بوو" سەرچاوە ناگرێ (Tomlinson, 1999b: 107).

بە گوتنێکی دیکە ئەو دەرەتانە هەروا بۆ مرۆڤەکان ماوەتەوە کە لە ناوچەکانی خۆیان دا هەست بە" لە ماڵەوە بوون" بکەن. هەرچەند لەوە ئاگادارن کە ئەو ناوچانە شوێن گەلێکی" دەرهەست"ن و ئەو تایبەتمەندییە ناسیاوانەی لەوان دا هەیە تایبەت بەو ناوچانە نین، بەڵکوو بە هۆی هێزە دوورترەکانەوە لەو ناوچەیە دا دانراون(Giddens, 1990: 140-41).کەواتە لە دنیای ئێستا دا، مرۆڤەکان شوێن گەلی ناوچەیی تایبەت بە خۆیان هەیە و دەتوانن بە هۆی ئەوانەوە، بەڵام بە ئاگادار بوون لە گرێدراوی و پێوەندیی ئەو شوێنانە لەگەڵ بەستێنی جیهانی، شوناس وەدەست دێنن.

پرۆسەی بەجیهانیبوون سەرچاوەکانی شوناسیش زۆر زیاد دەکا. بە پێچەوانەی کۆمەڵگە نەریتییەکان کە سەرچاوە گەلێکی سنووردار و دیاریکراویان بۆ دروست کردنی شوناس لە خۆگرتبوو، ئەمرۆکە هەر تاکێك دەستی بە سەرچاوەو کەرەستە زۆر دەوڵەمەندەکانی شوناس ڕا دەگاو بە سانایی دەتوانێ پێداویستیی شوناسیی خۆی لەوان دابین بکا. جیا لەمە نەك هەر کۆسپو سنوورێکی گەورە لە سەر ڕێگای دەستڕاگەیشتنی تاکەکان بە سەرچاوە پرژمارو جۆراوجۆرەکانی شوناس دا نیە، بەڵکوو دەرەتانی بەهرەوەرگرتنی چالاکانە لەو سەرچاوانەش پێك هاتووە. تاکەکان دەتوانن بە پێی ئۆگرییەکان و پێگەی خۆیان، ئاوێتەگەلێکی جۆراوجۆر لە سەرچاوە شوناسسازەکان پێك بێنن و یان ئەوەکە ئەو سەرچاوانەی هەن و دەست پێیان ڕادەگا بە پێی مەیل و سەلیقەی خۆیان خۆماڵی و ناوچەیی بکەن، وەك خۆماڵیکردنی موسیقیی ڕۆژئاوایی.

ئەم خۆماڵیکردنە پێوەندیی بە جۆرێك بووژانەوەی بابەتی ناوچەیی و تایبەتەوە هەیە. بە پێچەوانەی ڕوانگەی تیۆریست و توێژەران کە قسە لە لەنێوچوونی تایبەتمەندێتی و جیاوازی دەکەن، دەتوانین بڵێین کە پرۆسەی بەجیهانیبوون، دەرەتان بۆ دووبارە بەرهەمهاتنەوەی بابەتی تایبەت بە شێوەیەکی دیکە پێك دێنێ. هەروەك ڕابێرتسۆن تەکەزی دەکا، پرۆسەی بەجیهانیبوون تەنیا گرێدراوی کولتوورێکی تایبەت نیە. بەڵکوو گرێدراوی ئەمەشە کە خەڵك چۆن بەشێوەیەکی زێدەروو کولتوورەکان، نەریتەکان و شوناسە ناوچەییەکانی خۆیان لە چوارچێوەی نموونەی بەجیهانیبووی گشتی دا دروست دەکەن. لە ڕاستی دا وشیاری سەبارەت بە تایبەت و بێهاوتابوون تەنیا لە ڕێگای بەراود لەگەڵ" دیترە" هاوچەشنەکانەوە وەدەست دێ.

بۆ وێنە ژاپۆنییەکانو ئامریکاییەکان بە یارمەتیی بەراوردکردنێکی ئەوتۆ، سەبارەت بە خۆیان وشیاریی زیاتر وەدەست دێنن. بە واتایەك ، بەجیهانیبوون واتە "پلۆرالسیمی وشیارانە" (Beyer, 1998: 306).

بە سەرنجدان بەم خاڵانە دەتوانین بڵێین کە پرۆسەی بەجیهانیبوون وێڕای لە نێو بردنی سەرچاوەکان، دەرەتانەکان و هەلومەرجی شوناس سازیی نەریتی، سەرچاوە، دەرەتان و هەلومەرجی نوێیش دابین دەکا. بەم پێیە، بێ گومان، تێپەرین لە قەیرانی شوناس و مانا تەنیا بە هانا بردن بۆ تایبەتگەراییە کولتوورییەکان یان دەست بەردانەوە لە بەرانبەر کولتووری بەخۆری نەبەستراوەوە. هەر تاکێك دەتوانێ بە کەڵك وەرگرتن لەو دەرەتانو هەلومەرجانە، شوناسی خۆی بونیاد بنێتەوە، بە بێ ئەوەی کە بە هەوڵی بێ سوود بۆ بووژاندنەوەی فەزا داخراوە کولتووری- کۆمەڵایەتییەکان، بنواشە و بنەماکانی وەك ئازادی، یەکسانی، مافەکانی مرۆڤ و دێموکراسی بخاتە مەترسییەوە. ئەو شوناسانەی کە بەم جۆرە دروست دەکرێن، بە پێچەوانەی ئەو شوناسانەی لە کۆمەڵگە نەریتییەکاندا دروستکراون، زۆر گەرۆکنو ڕەوانبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی بەر بە ڕەقبوون و وەستانی ئەوان دەگرێ. تێکەڵاوی و ئاوێتەبوون، تایبەتمەندییەکی دیکەی ئەم شوناسانەیە. گرنگیی ئەم تایبەتمەندییە کاتێك زەقتر دەبێ کە مەترسیدار بوونی، پەیجووریی شوناسو کولتووری "ڕەسەن" لە چوارچێوەی بونیادگەراییە کولتوورییەکانمان لەبەرچاو بێ. ئاڵۆز و چەند فاقی بوونیش لە تایبەتمەندییەکانی دیکەی ئەم شوناسانەیە کە لەگەڵ ژیانی ئاڵۆزی کۆمەڵایەتی لە جیهانی ئێستادا گونجاوە.

هەروەها دەبێ بگوترێ کە لە ڕێگای ئەم جۆرە شوناس سازییەوە، پێکهاتەیەکی ناسك لە نێوان بابەتی گشتیو بابەتی تایبەت دا پێك دێ. ئەو تاکانەی کە بەم شێوەیە خۆیان بونیاد دەنێننەوە، نەك هەر بە تایبەتەکانی وەك شوێن، ناوچە و کولتووری دیاریکراو شوناس وەدەست دێنن، لە کاروباری گشتی و دۆخی کۆمەڵگەی گەورەتر ( جیهانی )یش بێ ئاگانین. لەم ڕووەوە بێ گومان ئەم چەشنە شوناسانە لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەی جیهانی دا گونجاو و هاوئاهەنگن. چونکە پێشگیری لە تایبەتگەرایی کورت بینانەو پڕمەترسی دەکەن و هەم بەر بە یەکدەست بوون و هاوجۆریی کولتووری دەگرن. ڕابێرتسۆن بەم تایبەتمەندییە دەڵێ "گۆڕانی پارادۆکسیکاڵی گشتگەرایی و تایبەتگەرایی" یان بەگشت کردنی تایبەتگەرایی و تایبەت کردنی گشتگەرایی" (Robertson, 1992: 100).

بە گشتی ئەم جۆرە شوناسسازییە لەگەڵ پێکهاتەی ئاڵۆز و پلورالیستیی کۆمەڵگە هاوچەرخەکان گونجاوە و دەرەتانی جۆرێك دووبارە سەرزەوینی کردن لە چوارچێوەی پانتایی



جیهانی دا پێك دێنێ. ئەو تاکانەی کە شوناسی خۆیان بەم چەشنە دروست دەکەن، دەبێ لە گرێدراوی بە دنیایەکی گەورەتر و هەروەها بوونی زۆر کولتووری دیکە ئاگادار بن، بەڵام لە هەمان کات دا نەکەونە داوی ڕێژەگەرایی ڕەووتەوە. ئەوانەی کە بە "کۆڵەبارێك لە زانست و هێز لە ڕێگای ناسینی"چیەتی" و "کێیەتی"ی خۆیان هەنگاویان ناوە،(تاجیك،**١٣٧٩**:١٦٠). دەتوانن لەلایەنی ئیتنیکیو کولتوورییەوە هەم لە جیهان دا بژینو هەم لە ناوچە دا. بە گوتنێکی دیکە ئەوان دەتوانن باتر لە پانتایی ناوچەیی، سەبارەت بە دەرهاویشتە گشتگیر و درێژماوەکانی کردارەکان بیر بکەنەوە، بەرژەوەندییە جیهانییە هاوبەشەکان بناسن و لە دیمانەیەکی وشیارانە لەگەڵ دیتران دا، کە هەڵوێستی جیاوازیان هەیە، لە سەر بەرەو پێش بردنی ئەم بەرژەوەندییە هاوبەشانە بەشداری بکەن.

ئەم جۆرە شوناسە ڕەوان، ئاڵۆز و چەند فاقیانە ئەگەرچی ئەو ئارامی و هێمنایەتییەی لە کۆمەڵگە نەریتییەکان دا هەیە دابین ناکەن، تێچوویەکی بەجێن بۆ پەرەگرتنی وشیاریی ئاکاری و پێك هاتنی دەرەتانی هەڵبژاردن. کەواتە پرۆسەی بەجیهانیبوون ئاسوودەیی مرۆڤی ناچالاك و بەند کراوی کۆمەڵگە نەریتییەکان لە نێو دەبا، شوناسسازی دەکاتە کردەیەکی تاك تەوەر، دەرەتان بۆ مرۆڤ بوون هاوکات لەگەڵ تایبەت بوون دەرەخسێنێ و هەروەها بێ سنووریی کولتوور، جیاوازی و جۆراوجۆری نیشان دەدا. بێ گومان بە بەستێن، هەلومەرجو دەرفەت گەلی ئەوتۆ دەتوانین جیهانی بیربکەینەوە و ناوچەیی بژین.

